لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



# کوردەکان

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسی

حەسەن ئەرفەع
و. سەردار محەمەد

# کوردەکان

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسی

حەسەن ئەرفەع
و. سەردار محەمەد

سلێمانی 2001

- ناوی کتێب : کوردەکان
- بابەت : مێژوویی
- نووسینی : حەسەن ئەرفەع
- وەرگێڕانی : سەردار محەمەد
- هەڵەچنی چاپ : نیشتمان محەمەد
- مۆنتاژ : ئاسۆ سەعید
- تیراژ : 750 دانە
- چاپی یەکەم : 2001 / سلێمانی
- ژمارەی سپاردن : 89 ی 2001
- کۆمپیوتەر و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم


زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ( 115 )

# پێڕست:

## هەڵوێستەیەك:

((ژاك بێرن))ی مێژوونووس دەنوسێ :

(لەگێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا، پێویستە ئەم نمونەیە بکرێ بەسەر مەشق، کاتێك مرۆڤ لە ژوورێکدایەو بخوازێ کەشو هەوای ئەو ژوورە ڕاڤە بکات، ئەگەر بۆ نمونە ببێژێت هەوای ژوورەکە (گەرمە) یا (ساردە)، دیارە ئەوە داوەرییەکی تایبەتی خۆیەتی، ڕەنگە کەسێکی دی پێچەوانەی ئەم تێڕوانینەی هەبێ، بەڵام کاتێك بۆ نمونە کە گوتی هەوای ژوورەکە (20 پلەیە)، ئیدی ئەمە چ گومانێك لەو مەسەلەیەدا ناهێڵێتەوە، چونکە ئەو کەسە هەمان ئەو ڕاستییەی دەربڕیوە کە هەیە، ئیدی هەستکردن بە ساردی یا گەرمی هەر کەسەو پەیوەندی بەخۆوەیەتی).

ئایا (حەسەن ئەرفەع) لەگێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکانی کوردا و لەنوسینی بابەتەکانی ئەم کتێبەدا بەو ڕەوشە کاری کردووە؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بە لێکدانەوەو لێخورد بوونەوەی خوێنەرە.

سەردار محەمەد

## پێشەکی نوسەر

خوێنەر بەلایەوە سەیر دەبێ، چۆن دەکرێ ئەفسەرێکی ئێرانی کە چەندین ساڵ لەناوچە سنوورییەکاندا لەگەڵ کوردەکاندا جەنگابێ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی واقیعی و بێ لایەنانە لەبارەی کوردەوە بنوسێتو، باس لەهەلومەرجی ژیان و داخوازی و ئارەزووەکانیان بکاتو، هیچ چەشنە سۆزو لایەنگرییەکیش بەرامبەر بە وڵاتەکەی خۆی پیشان نەدات، کە پتر لەیەك ملیۆن کوردی تیادا نیشتەجێیە (پێم وایە ئەگەر سەر ژمێرییەکی دروست لەم بارەوە ئەنجام بدرێ، هەرچۆنێك بێت، بەبێ دانانی لوڕەکانیش بەکورد، ژمارەی کوردەکانی ئێران لەدوو ملیۆن پتر دەبێ، تەنانەت ئەگەر بەتەنها ئەوانەش وەحساب بێن کە لەسەر زەمینی ڕەسەنی خۆیاندا نیشتەجێن).

نوسەر پێی وایە لەئەستۆ گرتنی ئەم ئەرکە گەلێك دژوارە، هەر لەبەر ئەوە، لەهەر جۆرە هەڵوێستگیرییەك کە ڕەنگە بەلایەنگری سیاسی یا ئەخلاقی دابنرێ، یا لەهەر چەشنە سۆزو خواستێك کە ڕەنگە لەگەڵ هەڵوێست و بەرژەوەندی وڵاتەکەیدا هاوکۆك بێت، خۆی بەدوورگرتووەو، تەنها پشتی بەتێزی ئاشکراو نکۆڵی لێنەکراوی مێژوویی بەستووە.

بەمجۆرە ئومێدەوارە کە ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەپیشاندانی زەمینەی

پێشینەی دیرۆکی کورد و ئەو ڕووداوانەی کە هەنووکە لەکوردستاندا ڕووئەدەن، بۆ ئەو کەسانە بەسوود بێ کە پەیوەندیدارن بەدۆزی کوردەوە، هەروەها باشتر ئەم میللەتەش بەبیروڕای گشتی بناسێنێت.

نوسەر بەهۆی گەشتی فراوان و ژیان بەسەر بردن لەنێو هۆزو تیرەکانی کوردا ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساوە کە لەنزیکەوە بە شێوە ژیانی ئەوان ئاشنا بێت و هەست بە ئیحساسی هاودەردی بکات لەخۆیدا سەبارەت بەم چیانشینە دلێرو ئازادیخوازو سەرکەش و جوامێرانە، کە لەگێرمەو کێشەی بەردەوامدا بووە لەگەڵیاندا.

لەناخی دڵەوە سەبارەت بەدۆستی ئازیزم خاتوو (نێرگس مکلیپ) کە بەلوتفی هەرچی زیادەوە لەتایپ کردنی لاپەڕە دەستنوسەکاندا یارمەتی دام سوپاسگوزارم، هەروەها سوپاسی هاوڕێیانی کوردم دەکەم، بەتایبەتی هێژا (عەبدولقادر سەبری) کە زانیارییەکی قووڵی دەربارەی دیرۆکی کوردو ڕووداوەکانی هەنوکەی کوردستان هەیەو لەم کارەدا دڵسۆزانە یارمەتیدام.

تاران-ئابی 1965

حەسەن ئەرفەع

# بەشی یەكەم
# كورتە باسێكی مێژوویی كورد

## 1-گەلی كورد-خاكی كوردستان-زمانی كوردی

دەپێشدا پێویستە ئەوە بزانین كە بە چ خەڵكێك دەوترێ كورد، دیارە لەئاكامی جیاوازی نەژاد و بەهۆی هێرش و لەشكركێشی بێ ئەژمارەوە ، دژوارە دەستنیشانی ئەوە بكرێ كە هەریەك لە گەلانی نیشتەجێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەر بەكام نەژادن.

بەڵام سەبارەت بەكورد:

1-یەكەم پێوانە بۆ شوناسی كوردان، ئاخاوتن بەدوو شێوە زاری سەرەكی كوردی‌یە، (زازا) لەباكور و (كرمانجی) لەناوەڕاست و باشوری كوردستاندا[1]. پێویستە لەهجەی (گۆران)یش بخرێتە خانەی كرمانجییەوە، كە لەدەوروبەری

---

[1] نوسەر لەم بارەوە بەهەڵەدا چووە، هەرچەند دابەشكردنی شێوە زارەكانی كوردی باسو خواسێكی زۆری لەسەركراوە، بەڵام مامۆستا (فواد حەمە خورشید) لەم بارەوە پێی وایە كە (واقعیترین دابەشكردنی شێوە زارەكانی كوردی كە لەگەڵ تێزی ئاشكرای زمانەوانی و جوگرافیاییدا بگونجێ بریتی‌یە لە:

1-كرمانجی سەروو

2-كرمانجی ناوەڕاست

3-كرمانجی خواروو

4-گۆرانی

كە هەر دیالەكتێكیش لەمانە بەشێوەیەكی گشتی چەند لق و بەشە دیالەكتێكیان لێدەبێتەوە).

(اللغة الكردية و التوزيع الجغرافي للهجاتها، فواد حمه خورشيد/ بغداد 1983)

كرماشاندا پێی ئەدوێن.

2–ڕەنگە لە هەموو شتێك گرنگتر ئەو هەستە نەتەوەییە بێت کە خۆیان بەکورد دەزانن. ئەو ئێلە کوردانەی کە لەناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئێران و ئازەربایجانی رۆژهەلاتدان، وێرای ئەسڵی ڕەگەزی هاوبەشیشیان، زۆربەیان زاری کوردی و شێوە ژیانی نەتەوەی خۆیان فەرامۆش کردووە و پەیوەندییان بە کوردەکانی هەرێمی ڕۆژئاوای ئێران و ڕۆژهەلاتی تورکیا و باکور و ڕۆژ هەلاتی عێراقەوە نەماوە، لەبەر ئەوە ناکرێ ئەوانە بەڕەگەزە پێکهێنەرەکانی میللەتی ئێستای کورد دابنرێن.

سەبارەت بەسەرزەمینی ڕەسەنی کوردان گەلێك تێزی جیاواز هەن. بەلام زۆربەی هزرڤانانی ئەنترۆپۆلۆجی دەربارەی ئەم مەسەلەیە هاوبیرو کۆکن کە کورد ئاوێتەیەکە لەگەلانی مادو خەڵکی ڕەسەنی مەڵبەندی کوردستانی ئێستا، کە لەهەموویان گرنگتر گزنییەکانن.

ئەم گەلە لەوە بەدوا کەوتۆتە بن دەستی گەلانی ئەرمەنی[2]، ئاشوری[3]، عەرەب[4]، تورك[5]و، تورکمان[6] و ئێرانییەوە. بەلام هەموو ئەوانەی لەخۆیدا

---

[2] ئەرمەن: لەئەقوامی هندۆئەورووپین، لەدێرزەماندا لە(کیلکیا) دا پاشانشینی ئەرمینیایان دامەزراند، لەسالانی 1915 و 1916 دا قەتلوعامێکی زۆریان لێکرا، یەکێکە لەو گەلە دێرینانەی کە بەدرێژایی مێژووی پڕ لەسەختی و دژواریی مۆرکی نەتەوەیی خۆی پاراستووە، خاوەنی دێرینترین کەنیسەی ئەرسزۆکسی سەر بەخۆیانن.(و)

[3] ئاشوری: لەئەقوامی سامی و لەگەلە دێرینەکانی میزۆپۆتامیان، لەسەردەمە کۆنەکاندا خاوەنی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری بوون، لەسەرەتای سەرهەڵدانی مەسیحیدا بۆ سەر ئایینی مەسیحی وەرگەڕان، بەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا، ئاسورییەکان لەسەرتاسەری ئێران و عێراق و سوریاو لوبنان و ولاتانی ئەورووپاو ئەمریکای باکوردا پەرتەوازە بوون.(و)

[4] عەرەب: لەئەقوامی سامی و مەسکەنی ڕەسەنیان یەمەن و حیجاز بوو، بەحوکمی هەلومەرجی جوگرافیایی ناوچەکەیان کاری سەرەکییان شوانکارەیی و چادر نشینی بوو، بەتوندی وابەستەی نەریتی خێڵەکی وبت پەرستی بوون، بەلام ئایینی ئیسلام وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە هەلومەرجی کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتوری

تواندۆتەوە. هەرچەند تیپە فیزیکییەکانی ئەوان بەهۆی قوڵی و شێوەی ئەم ئاوێتە بوونەوە لەگەڵ یەکدیدا جیاوازن.

بەمجۆرە ئەو مەڵبەندەی کە زۆربەی دانیشتوانەکەی لە کورد پێکدێت، بەشێوەیەکی گشتی شاخاوییە، لەڕۆژهەڵاتەوە لەبناری ڕۆژهەڵاتی کێوەکانی زاگرۆسەوە دەستپێدەکاو بەگۆمی ورمێ کۆتایی دێ، کە کۆچەرانی تورکی ئازەربایجانی لەوێدا نیشتەجێن. لێرەشەوە ڕوەو باشورو سنوری نێوان هەمەدان و سنە درێژ دەبێتەوە، لەباشوریشەوە لەپاش تێپەڕین بەدەورووبەری کرماشان و کەرکوکدا بە موسڵ کۆتایی دێ، پاشان ڕوەو باکور تا ماردین و وێران شارو ئورفە درێژ دەبێتەوە، ئەم هێڵە لەباکورەوە ڕوەو مەلاتییەو ڕوباری فورات درێژ دەبێتەوەو بە کەمالیە دەگات، ئەم بەشانەی باکوری خاکی کوردستان، کە بەتەنها کوێستانەکانی مورگان داغ و هارال داغ دەگرێتەوە و ڕوەو ئەرزنجان و ئەرزرۆم درێژ بۆتەوەو بەچیاکانی ئارارات (ئاگری داغ) دەگات، بەسنوری سروشتی نێوان تورکەکان لەباکور و کوردەکان لەباشور دادەنرێ.

هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان لەدەرەوەی ئەم سنورانەدا ژیان

---

عەرەبدا، کە کاریگەرییەکی قوڵی کردە سەر ڕەهەندی جوگرافیاو مێژووی عەرەب. (و).

[5] تورك: چەند تیرەو ئێلێکی کۆچەری ناوچەی نێوان ئاسیای ناوەڕاست و دەریای ئۆڕال و چیاکانی ئائیدا بوون، دابەش ئەبوون بەسێ ئێلی (ویغورو کرلوك و ئەغوەز)ەوە پاشان هەندێکیان ڕوەو ڕۆژئاواو ئەوبەری ڕوبار کۆچیان کردو هەندێکیشیان ڕوەو ڕۆژهەڵات و لەئەنادۆڵدا نیشتەجێ بوون، سەدەی یانزەهەم بە سەدەی دەسەڵاتی تورکەکان دادەنرێ کە فەرمانڕەواییان بەسەر ڕوبەرێکی فراوانی ئاسیا دەکرد و هەموو ئاوەدانی و سیمایەکی شارستانی ئەم ناوچانە لە ژێر سمی ئەسپەکانیاندا وێران بوو.(و)

[6] تورکمان: لەتیرە تورکەکانی ئێلی ئەغوەزن، لەسەدەی حەوتەمدا بەرەو ناوچەی جەیحون و قەرەقوم کۆچیان کرد، سەرزەمینی تورکمانەکان دەکەوێتە ناوچەی نێوان دەریای خەزەر و ئێران وئەفغانستان و ئۆزبەکستان و کازا خستانەوە.(و)

بەسەر دەبەن. بەڵام وێڕای ئەوەش لەناوخۆی ئەم مەڵبەندەشدا لەهەندێك ناوچەدا بەبەراورد لەگەڵ تورکەکاندا، کوردەکان بەکەمینە دادەنرێن.

ڕێگای چوونە نێو ئەم مەڵبەندە شاخاوییە، بەچەند دەرەیەکدا تێدەپەڕێ، کە هەندێکیان گەلێك فراوانن، بەڵام تەنانەت ئەم دەرانەش بەچەندین کێوی بەردەڵان و چەتوون دەورەدراون و بەچەند دەربەندێکی باریك وتەنگ کۆتاییان دێ. بەجۆرێك کە تەنانەت ڕێگای چوونە نێو ئەوانەوە لەهاوینانیشدا دژوارە. بەتایبەتی لەزستاندا بەبەفرێکی زۆر دەئاخنرێن.

لەم ناوچانەدا زۆربەی ئەو چەرەگەو پاوەنەی کە لەبناری کێوەکان و ترۆپکی چیاکاندا هەڵکەوتوون و لەکاتی توانەوەی بەفردا گژوگیا دایاندەپۆشێ، بەهۆی تاشە بەردو بەردەڵانی هەڵدێرو هەڵەمووتی چوار دەوریانەوە تەنها ڕێگای گەشتن پێیان تولە ڕێی باریکە. دەمەو هاوین کە چەند بەشێکی بناری کێوەکان دەبنە پووش و ڕووت دەبنەوە، دەبێ مەڕومالاَت کە سامانی سەرەکی کوردان پێکدێنن، بۆ لەوەڕگای کوێستانە بەرزەکان ببرێن. بەمجۆرە خاوەنی ئەم مەڕومالاَتە ناچار بەجۆرێك لەژیانی گەڕۆك و خێڵەکی دەوارنشین دەبن، کەبریتی‌یە لەسەرکەوتنە سەر کەژو کێوەکان لەهاویندا و هاتنە خوارەوە بۆ پێدەشتەکان لەدەمەو زستاندا.

مادەکان و پارسییەکان (تیرەگەلی ئەقوامی ئێرانی) لەباکورەوە واتە لە قەفقاس و ئەوبەری دەریای خەزەرەوە هاتوون، ئەم کۆچوڕەوە بەلانی کەمەوە هەزار ساڵی خایاندووەو پێدەچێ لەشێوەی گروپی بچووکدا لەهەزاران ساڵی بەر لەزاییندا ئەنجام درابێ. بەمجۆرە بەهێوری لەنێو خەڵکی ڕەسەنی ئەم ناوچانەدا جێگیر بوون‌و، بەسەریاندا زاڵبوون و لەنێو خۆیاندا تواندویانەتەوەو کولتوری باڵاتری ئەوانیان لەناوبرد، پاشان لەم ناوچانەدا وەك چینێکی ڕابەرو جەنگاوەریان لێهاتووە. پێئەچێ پێشڕەوی ئەوان ڕوەو ڕۆژئاوا بەهۆی تایفەیەکی دیکەوە کە ڕەنگە ئێبرییەکان[7] بن ڕاوەستێنرابێت.

---

[7] ئێبریی: بەرەچەڵەکی گورجیەکان دادەنرێن، هەنوکە یەکێ لەو سێ شێوەزارەی کە گورجییەکان پێی ئەدوێن بە ئێبریایی ناودەبرێ. شوێنی نیشتەجێ بوونیان دەکەوێتە ناوچەی نێوان چیاکانی قەوقاز و ئەرمەنستان و ئازەربایجانەوە.(و)

ئەم ئیبریانە سەرەنجام ناوچەکانی باشوری قەفقاسیان داگیرکرد و دەوڵەتی (کلدە)یان Colchido دامەزراند. هەر بەپێی ئەم تێزانە، ئەرمەنیەکانیش لەرۆژئاواوە هاتن و ناوچەی (ئورارتو)یان[8] داگیرکرد و لەگەڵ دانیشتوانی ڕەسەنی ئەم ناوچانەو پاشان لەگەڵ کوردەکاندا تێکەڵ بوون.

لەهەموو ئەم تێزانە شیاوتر ئەوەیە، کە ئەو ناوچانەی لەرۆژهەلاتی زاگرۆسدا هەڵکەوتوون و هەنوکە بەشی باکوری ئێران پێکدێنن، پاشتر بووە ئامانجی هێرشی ئەو پەلاماردەرانەی کە دواتر بەناوی کوردەوە ناسران.

بەلام بەهۆی کوێستانی چەتوون و سەختەوە، ئەوان ڕێڕەوی تێپەڕینی ئاسانتری وەك پەرینەوە بەناوچەی ئێستای (ماکز-ئیشکریت)ی ئەرزرۆمیان هەڵبژارد کە لەگەڵ بەرهەڵستی چەند خێڵێکی بێهێزتردا ڕووبەڕوو بوونەوە و بە مجۆرەش بەئاسانی بەسەر ئەو چیانشینە جەنگاوەرانەدا زاڵبوون.

لەنوسینەکانی سۆمەریدا (2000 پ.ن) باس لەولاتێك کراوە بەناوی (کارداکا)وە، کە پێئەچێ لەوە بەدوا پاشای ئاشوری (تیکلات پیلاسەر) لەگەڵ خێڵەکانی (گۆتی)دا جەنگی بێت. (زەینەفون)[9] باس لەو تیرەو هۆزانە دەکات کە بەناوی (کاردۆ)وە بوون و ڕێپێوانی ئەویان بەرەو دەریای سپی ناوەڕاست خستە مەترسییەوە.

بە گوێرەی نوسینی مێژوو نووسان و جوگرافیا ناسانی عەرەبی وەك

---

[8] ئورارتو: لەدێر زەماندا دەوڵەتی ئورارتو خاوەنی شارستانیەکی هاوشانی ژیاری ئاشورییەکان بوو، نوسینەکانی سەردەمی ئورارتو لەمێژوودا بەناوبانگن، ناوچەی ئورارتو دەکەوتە نێوان چیاکانی قەوقاز و دەریای خەزەر و ئەنادۆڵەوە. لەنێوان سالانی (1270-750 پ.ن)دا دەوڵەتی ئورارتو فەرمانڕەوایی دەکرد.(و)

[9] زەینەفون: (355-450پ.ن) مێژوو نووس و فەیلەسوف و سەرداری ئەسینایی، سەرکردەی (دە هەزار) گریکە کە لەکاتی کشانەوەیدا لەئێران، خاوەنی کتێبی (ئەناباسیس). (و)

(بلازری[10] و تەبەری [11] و ابن اثیر [12]) ئەو هۆزانەی کە بە ناوی کوردەوە ناسران، پتر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری بۆتان و کەنارەکانی باکوری دیجلەیان تا جزیرێ (جزیرەی ابن عومەر) داگیرکرد.

لەپاش مێژوو نووسانی عەرەب، زۆر لەرۆژهەڵاتناسانی ئەورووپا لە سەدەی نۆزدە و بیستدا هەوڵیاندا لە ڕێگای لێکۆڵینەوەی شوێنەوار ناسی و ئەنترۆپۆلۆجییەوە ڕەگو ڕەچەڵەکی کورد دیاری بکەن. شێوە زارەکانی زمانی کوردیش بەووردی خرانە بەر تۆژینەوە وسەرەنجام ئاشکرا بوو کە ئەم شێوە زارانە بە گشتی لە هاوشێوەی فارسی نوێ دەچن و ڕەنگە خاوەنی ڕیشەیەکی هاوبەش بن کە ئەویش زمانی پەهلەوی وساسانییە. فرەچەشنی تیپە فیزیکی‌یەکانی ئەو کوردانەی کەلەم ناوچانەدا دەژین، ژمارەیەکی خستە سەر ئەو باوەڕەی کە پێدەچێت پاشماوەی نەژادێکی فەوتاوی دێرین بن کە لە سەردەمێکدا لەو سەرزەمینەدا نیشتەجێ بوون.

دیسان چەندین تێزی دیکە لەلایەن دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە خرایە ڕوو تاکو ئەسڵی نەژادی کورد ببەنەوە سەر ڕەچەڵەکی میللەتانێکی دیکەی وەك تورك وئەوانی دی. بەڵام ئەم تێزانە لە بنچینەدا لە ڕووی ویست وبەرژەوەندی سیاسییەوە دەربڕاون و لە ڕوانگەی زانستی ئەنترۆپۆلۆجییەوە نرخ وبەهایەکی ئەوتۆیان نی‌یە.

هەربەو جۆرەی فەرماندەی شۆڕشی ئێستای کوردستانی عێراق، (مەلا مستەفا) ووتویەتی (کوردەکان کەسانێکن کە بەر لە هەموو شتێك هەست

---

[10] بلازری (ئەحمەد بن یەحیا): مێژوو نووسی عەرەبە، لەساڵی 892زدا وەفاتی کرد، لەکتێبە گرنگەکانی (فتوح بلدان) و (انساب الاشراف).(و)

[11] تەبەری (محمد بن جدیر): بەناوبانگترین مێژوو نووسی موسڵمانە، لە 923ز دا وەفاتی کرد، لەکتێبە گرنگەکانی (تأريخ الامم و الملوك). (و)

[12] ابن اثیر (عز الدين أبو الحسن علي): (1160–1234) مێژوو نووسی ناوداری عەرەبە لەکتێبە گرنگەکانی (كامل في التأريخ) و (اولى الابصار). (و)

دەکەن کوردن، هەر بەو جۆرەی کە فەرەنسییەك هەست بە فەرەنسی بوونی خۆی دەکات، یا ئەڵمانییەك).

جگە لەم هەستەش. گەورەترین خاڵی هاوبەشی نەتەوەیی کورد، زمانی کوردی‌یە، کە بە شێوەزاری زازا (لە تورکیا و ئازەربایجانی ئێران)و، شێوەزاری کرمانجی (لەناوچەکانی هەکاری تورکیاو کوردستانی ئێران و باکوری عێراق) و شێوەزاری گۆرانی (لە ناوچەی کرماشانی ئێران) دا پۆلێن دەکرێ. شێوەزاری کرمانجی کە لە لایەن نزیك بە نیوەی کوردەوە قسەی پێدەکرێ، لەسێ وڵاتی (تورکیا-ئێران-عێراق)دا بە شێوەزاری ئەدەبی نیوە رەسمی دادەنرێ و لە وڵاتی عێراقدا لە سەردەمی داگیرکردنی ئەو وڵاتەوە لە لایەن هێزەکانی ئینگلیزە وە تا ئێستا لە خوێندگا سەرەتایی وئامادەییەکاندا دەخوێندرێت. زازا و گۆرانی تەنها لە ئاخاوتندا بە کاردێ. شێوەزاری گۆرانی تا ڕادەیەکی زۆر لە (لوڕ)ی دەچێ و لوڕیش هاوشێوەی فارسی ئێستایە.

شێوەزاری کرمانجی لەهجەیەکی بە پێزو دەوڵەمەندە و کتێبەکانی پەخشان و شیعر بە ئەلف وبێی عەرەبی بەم شێوە زارە چاپ دەکرێ. هەروەها کتێبەکانی خوێندنیش لە ناوچە کوردنشینەکانی عێراقدا بەم شێوەزارە دەخوێندرێ. زاراوەی سیاسی و ئیدارییان لە بنەڕەتدا لە عەرەبی یا لە فارسییەوە وەرگرتووە.

دەتوانین بڵێین کە زازا لەڕێی کرمانجەکانەوە وکرمانجی لەڕێی گۆرانەکانەوە و گۆرانی لە ڕێی کوردەکانەوە لەیەکدی تێدەگەن، هەر بەو جۆرەی کە (دەری)[13] لە لایەن فارسی زمانانەوە قابیلی تێگەشتنە. لە ڕووی ڕێزمانیشەوە کوردی و فارسی تا ڕادەیەك ڕێزمانێکی چوون یەکیان هەیە.

چەند ووشەو زاراوەیەکی زۆر کەمی زمانی تورکی، لە زاری کوردیدا بوونی هەیە، مەگەر شێوەزاری (زازا) کە لە ناوچەکانی دەرسیمدا پێی دەئاخاڤن.

---

[13] -دەری:لە لقەکانی زمانی فارسی‌یە، زمانی هاوبەشی میللی و ئەدەبی تاجیکەکانی تاجیکستان و ئەفغانستانە. (و)

لە ڕووی ئاینەوە جگە لە نزیکەی (50000) خێزانی ئێزیدی[14](یا شەیتان پەرست) یا (تاوس پەرست). زۆربەی هەرەزۆری کوردان سونی و شافعی مەزهەبن. لە ناوچەکانی دەوروبەری کرماشانیشدا ژمارەیەك کوردی شیعە مەزهەب هەن، کە لە نێو ئەواندا کۆمەڵێکیان (سینهادی)یا (عەلی ئیلاهی)ن، ئەم ڕێبازە توندڕەوترین تیرەی پەیڕەوی شیعەگەرین و ئیمامی عەلی زاوا و ئامۆزای محەمەد و خەلیفەی چوارەمی موسڵمانان، وەك عیسای مەسیح بە بەرجەستە کردنێك لە پەروەردگار دەزانن، ژماریەك لەم تیرەیەش لە کوردستانی عێراقدا نیشتەجێن.

## 2-کورد بەر لە ئیسلام

بە گوێرەی هەندێك سەرچاوە (Noldek 1879 )[15]ئەوئێلە کوردانەی کە لەسەردەمی شانشینی ساسانیدا[16] لە ناوچەکانی ناوەڕاست وباشوری ئێراندا دەژیان، بە هۆی پەلامار و داگیرکاری ئێرانییەکان وجموجۆلی دانیشتوانەوە ڕوەو باکوری ڕۆژئاوا ڕەویان کرد، لەسەرزمینی (Kurdu)دا نیشتەجێ بوون و

---

[14] ئێزیدی: مەسکەنی ئەسڵی ئێزیدیەکان شنگار و شێخان ودەوربەری شاری موسڵە، لە سوریا وقەفقاسیشدا ژمارەیەك ئێزیدی هەن، جەوهەری ئایینی ئێزیدی نهێنییەکی شاراوەیە، باوەڕیان بە خوداوەند و مەلەك تاوس و دۆناودۆن بوونی روحە، مەرقەدی شێخ ئادی لە گوندی لالشدا گەورەترین شوێنی پیرۆزیانە وسەرۆکی روحیشیان هەر لەوێدا دەژی، سەرداری دەسەڵاتی دنیایی‌میرەو پیاوانی ئایینیش دابەش دەبن بەسەر (شێخ-پیر-قەواڵ-فەقیر-کۆچاك-موريد)دا، (مەسحەفا ڕەش) و(جەلوە)کتێبی پیرۆزی ئێزیدیانەو، چەند جەژنێکی تایبەت بە خۆیان هەیە. (و)

[15] -نۆلدکە: (1836-1930) بەناوبانگترین ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانییە ، خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوەیە لە زمانەکانی (سریانی‌و عەرەبی وفارسی)دا .(و)

[16] -پاشایەتی ساسانی: لە بنەڕەتدا بە ناوی (ساسان)ی رابەریانەوە دامەزراوە، بنەماڵەیەکی فارس بوون، لە نێوان ساڵەکانی (22-651ز)دا فەرمانڕەواییان بەسەر ناوچەیەکی فراواندا کرد لە ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا، بە ناوبانگترین پاشاکانی ئەردە شیری یەکەم وشابوری دووەم وکیسرا ئەنوشیروانن، هێرشی هێزەکانی ئیسلام تەفروتونای کردن و ناوی لە مێژوودا کوێرکردنەوە. (و)

لەگەڵ کوردەکانی ئەوێدا ئاوێتەبوون و ناوی ئەوانیان پەسەندکرد. ئەم خێڵانە پێشتر بە ناوی (مەرسی)ەکانەوە دەناسران و لە جەنگە بەردەوامەکانی نێوان ساسانییەکان و ئەشکانییەکان (پارسییەکان) لەگەڵ ڕۆمە بێزەنتییەکاندا[17] بەشدار دەبوون، جاروبار لەگەڵ ئێرانییەکاندا وهەندێك جار لەگەڵ ڕۆمەکان وسەردەمێکیش لەگەڵ هەردوو وڵاتدا لە جەنگدا بوون. بەشێك لە خێڵ وتیرەکانی ئەوان لایەنگری ئێرانییەکانیان دەکرد و بەشێکی دیکەشیان لایەنگری ڕۆمەکان بوون. هەندێ جاریش بەخواستی خۆیان لە (لژێون)ەکانی[18] ڕۆمدا بە شێوەی کرێگرتە و جاشێتی ناونوسییان دەکرد و لە لەشکرکێشی وکارە جەنگییەکانی بالقان و ئەفریقا وئاسیای بچوکدا بەشدار دەبوون (تیتوس لیویوس[19]، پولی بیوس[20]). لە سەدەی چوارەمی زاییندا لەلای ئەرمەنییەکان بە ناوی (کارچخ)ەوە دەناسران. ئەم ناوە ناوی ئەو مەڵبەندە بوو کە ناوچەی دەشتەکانی سەلماسی ئێستا و ناوچەکانی باکوری ڕۆژئاوای (زەخیمە)ی نزیك چۆلە مێرگی دەگرتەوە.

بە پێی سەرزەمین وشێوەزاری ناوچەیی (Korduene) یا (Kerducci) کوردەکان لە کۆندا ناوی (کاردۆخ) یا (کاردیخ) یان لەخەڵکی ڕەسەن و خۆجێی نیشتەجێی ئەو مەڵبەندە ناوە. ئەم ناوی (کورد)ەی ئێستا لە پاش هێرش و پەلاماردانی عەرەب بۆ سەر ئەم مەڵبەندە بەوان گوتراوە وکۆی

---

[17] –بێزەنتی: دەوڵەتی بێزەنتی لە ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا دامەزرا، لە پێشدا بە مەبەستی ڕوو بە ڕووبوونەوە لە دژی فارسەکان دامەزرا، پاشان ڕۆڵێکی گرنگی لە ناکۆکییەکانی نێوان کەنیسەی کاسۆلیکی ڕۆژئاواو کەنیسەی ئەرسۆزکسی ڕۆژهەڵاتدا گێڕا، لەساڵی 1453دا محەمەد فاتح قوستەنتینەی پایتەختی بێزەنتینەی داگیرکرد و لە بەردەم عوسمانیەکاندا تێکشکان. (و)

[18] –لژێۆن: یەکەیەکی سەربازی بوو لە دەوڵەتی ڕۆمانی کۆندا، کە لە 6000 سەرباز پێکدەهات. (و)

[19] –تیتوس لیویوس (59پ.ز–17ز) مێژوونووسی لاتینی بە ناوبانگ، زۆربەی ژیانی بۆ نوسینی (مێژووی دەوڵەتی ڕۆمانی) تەرخان کرد. (و)

[20] –پولی بیوس (210–125پ.ز) مێژوو نوسی بە ناوبانگی گریك، بە نرخترین نوسینەکانی سەبارەت بە سیستەمی ئیداری و کۆمەڵایەتی ڕۆمایە.(و)

ئەوانیش بەپێی دەستوری ڕێزمانی عەرەبی بە (اکراد) ناو دەبرێن. بەڵام هەنوکە لە بەر گەلێك هۆ، خودی کوردەکان بۆ ناوهێنانی خۆیان کۆی (کوردان) پەسەند دەکەن. زۆربەی هۆز و تیرە کوردەکان لە ناوی کورد بێ خەبەر بوون و تەنها بە ناوی ئێل و تیرەکەیانەوە خۆیان دەناساند وەك هەورامییەکان یا پشدەرییەکان وئەوانی دی.

(دیارە بە هۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی نوێی کوردەوە هەموو کورد کەم تا زۆر هەستیان بە ئینتیمای نەتەوەیی خۆیان کردووە).

بە گویرەی مێژووی شەرەفنامە کۆنترین هۆز و تیرەی کورد باجناوی و بوتییەکانن، کە ئەم ناوانە بە هۆی سەرزەمینی باجان و بۆتانەوە بەسەرئەواندا براوە.

گەلێك ئەفسانە دەربارەی ئەسڵی ڕەگەزی کوردان گوتراوە، کە بەهۆی خورافی بوونیانەوە، پێویست بە باسکردن ناکات .

هاوکات لەگەڵ هێرشی عەرەبەکاندا ئەو سەرزەمینەی (بەهۆی چەند تیرەو هۆزێکەوە کە دوا تر بە ناوی کوردەوە ناسران، کرایە جێی ئارامگرتن و نیشتەجێ بوون) بووە مەیدانی ململانێی نێوان ساسانییەکان و ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی. پاشانشینی ئەرمەنستانیش جاروبار سەر بە شاکانی ساسانی و سەردەمێکیش ملکەچی ڕۆمەکان و هێندێك جاریش سەربەخۆبوون. هەرچەند ئەرمەنی و ئاشورییەکان هەر لە مێژەوە بۆ سەر ئایینی مەسیحی وەرگەڕان ، بەڵام کوردەکان پتر لە ئێرانییەکانەوە نزیك بوون و زۆربەیان زەردەشتی[21] بوون و زۆربەشیان لە کاتێکدا کە خۆیان بە

---

[21] زەردەشتی:زەردەشت پێغەمبەر و ئاڤێستا کتێبی پیرۆزیانە باوەڕیان بەوەیە کە خوای چاکە و ڕوناکی (ئوهرامزدا) و خوای شەڕ و تاریکی (ئەهریمەن) هەمیشە لە ململانێدان و سەرەنجام ئوهرامزدا سەردەکەوێ ، پیاوی دینییان بە (موبەد) ناو دەبرێ، لای زەردەشتییەکان پاکژی جەستە هێندەی پاکیزەگی ڕوح گرنگە. مەرگی مرۆڤ لایان گەورەترین سەرکەوتنی ئەهریمەنە بەسەر مەخلوقەکانی ئوهرامزدا دا، لەکاتی نوێژکردندا ڕوودەکەنە خۆر لەدەمی هەڵاتندا یا ڕوودەکەنە ئاو و ئاگر کە هەرسێیان بە قیبلەی پیرۆزی زەردەشتی دادەنرێ، ڕۆژی پێنج نوێژ دەکەن، مردووەکانیان نانێژن دەیبەنە شوێنێکی تایبەتەوە کە بە (دخمە) ناو دەبرێو

زەردەشتی ناودەبرد لەسەر بیروباوەڕە کۆنەکانی خۆیان وەك خۆر پەرستی وچەند بیروباوەڕێکی ئاینی دی مابونەوە.

---

سەردابێکی تەنگ و باریکە، یاخود دەیبەنە شوێنێکی بەرزەوە تاببێتە خۆراکی قەل و داڵ، چەند جەژنێکی تایبەت بەخۆیان هەیە . (و)

### 3-کورتەباسێکی مێژووی کورد لە پاش ئیسلامەوە تا سەدەی نۆزدە.

هاوکات لەگەڵ هەڵکشان و هێرشی عەرەبەکان بەرەو باکور، لەشکری عومەری کوڕی خەتاب[22] لە نێوان سالانی (634-644) ی زایینیدا ناوچەکانی (هەولێر-موسڵ-نەسیبەین) یان داگیرکرد کە ئەم ناوچانە لە نێو ئەو چیایانەدا هەڵکەوتبوون کە مەڵبەندە کوردنشینەکانیان لە باشورەوە دەپاراست. لەسەردەمی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان[23] دا (644-656) تێکڕای ئەو ناوچانە تا چیاکانی قەفقاس لە لایەن موسڵمانەکانەوە داگیر کران.

کوردەکان بە خێرایی تەسلیم بوون و ئایینی ئیسلامیان قبوڵ کرد. ئەم قبوڵ کردنە هۆکەی ئەوە بوو کە عەرەبەکان خۆیان لە تایبەتمەندی و شێوە ژیانی ئەوان هەڵنەقورتاند و هیچ هەوڵێکیشیان بۆ ئارامگرتن و جێگیر بوون لەسەر زەمینی ئەواندا نەدا و بەمەڵبەندی ئەواندا تێپەڕین. وێڕای ئەوەش دادپەروەری ئایینی ئیسلام دەرفەتی بە هیچ کەسێك نەئەدا، بە تایبەتی بەو ئەسحابانەی کە دەمارگیرترین موسڵمان بوون بۆ پەیڕەوکردن لە یاساکانی ئیسلام، دەست لە ژیانی هیچ نەتەوەیەك وەردەن. جگە لەوەش ئەو هۆکارەی کە خێرایی بەخشی بە پەسەندکردنی ئایینی پیرۆز لەلایەن ئەوانەوە، دۆزینەوەی حەقیقەتی ئاشکرا و عەدالەتی یاساکانی ئیسلام بوو بۆیان، کە

---

[22] عومەری کوڕی خەتاب:دووەم خەلیفەی ڕاشدین بوو، لە نێوان سالانی (634- 644 ز) دا خەلیفە بوو، لە ڕۆژگاری خەلافەتی عومەردا سوپای ئیسلام ئیمپراتۆریەتی ساسانی تێکشکان وبەشێکی بەرفراوانی لە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی فەتح کرد. لە 644زدا لەلایەن مەوا لییەکی فارسەوە کوژرا. (و)

[23] عوسمانی کوڕی عەفان:سێهەم خەلیفەی ڕاشدین بوو، لە نێوان سالانی( 644-656 ز) دا خەلیفەبوو، لە بنەماڵەی (بەنی ئومەییە)بوو، قورئانی کۆکردەوە، لە ئاکامی ئاژاوەی نێوان موسڵمانانندا لە ماڵەکەی خۆیدا کوژرا. (و)

زانایان و وموغانی (موبەدان) ئەم میللەتە بە قووڵایی دەریای فکردا ڕۆچوون و لەگەڕان بە دوای گەوهەری حەقیقەتدا، بەزوویی ڕەوا بوونی ئەم ئایینەیان بۆ میللەتی خۆیان ئاشکراکرد.

هەروەها لەسەردەمی خەلافەتی ئەمەویدا[24]، وڵاتی کوردستان بەشێك بوو لە قەڵەمڕەوی خەلافەت، ناوچەکانی دەرسیم ومەلاتییەش لە لایەن هۆزە کوردەکانەوە داگیرکران.

لەو ڕۆژگارەدا، لە کاتێکدا کە سەرۆك هۆزەکانی کورد لە پێناو پاراستنی دەسەڵاتی ناوچەیی خۆیاندا تێدەکۆشان، لە فتوحاتی ئیسلامیشدا بەشدار دەبوون. کاتێك عەباسییەکان[25] بە کۆمەکی ئێرانییەکان جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست، بە دوای مەرگی (هارون ئەلڕەشید)دا، بە هۆی ململانێی

---

[24] -خەلافەتی ئەمەوی: معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دامەزرێنەری خەلافەتی ئەمەوی بوو، لە پاش کوژرانی ئیمامی عەلی، خۆی بە خەلیفەی موسڵمانان ناوبرد وبەپێچەوانەی خەلافەتی راشدینەوە سیستەمی جێنشینی لە باوکەوە بۆ کوڕ کردە نەریتی حوکم کردن، بنەماڵەی ئەمەوییەکان لە نێوان ساڵانی 660–750 زدا فەرمانڕەواییان کرد، دیمەشقیان کردە پایتەختی خۆیان. (و)

[25] -خەلافەتی عەباسی: ئەبوعەباس دامەزرێنەری خەلافەتی عەباسی بە دروشمی گەڕانەوە بۆ بنەماپاکژەکانی ئیسلام، بە پشتیوانی ئەبو مسلمی خۆراسانی شۆڕشی لە دژی ئەمەوییەکان بەرپاکردو بەرەو ئەندەلوس دەریپەڕاندن و جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست، عەباسییەکان شەجەرەی نەسەبی خۆیان دەبردەوە سەر عەباسی مامی پێغەمبەر، لە نێوان ساڵانی 750–1258دا فەرمانڕەواییان کرد، پایتەختی خەلافەتیان لە دیمەشقەوە گواستەوە بۆ بەغدا، لە هێرشی بێئامانی هۆلاکۆخاندا، عەباسییەکان قەتل وعام کران و بەغداش وێران کرا. (و)

(ئـەمین)[26] و (مـەئمون)[27]ی کوڕێـوە، دەسـەڵاتی خەلیفـەکان لـە ناوچـەکانی کوردستاندا ڕووی لە بێهێزی و کزی کرد.

(حسێن بەرزکانی) کە سەرۆکی یەکێ لە ئێلە کوردەکان بوو، خۆی کردە فـەرمانڕەوای کوردستانی ڕۆژهـەڵات، ودینـەوەرو هەمـەدان و نەهاوەندیشـی داگیر کـردو، لـە سـەدەی دەیـەمی زاییندا (959) میرنشـینی (حەسـنەوی) دامەزران، کە لەدوای خۆی (ناسرەدین بەدر حەسنەوی) کوڕی (979–1014) و (زوهیرەدین هیلالی کوڕی بەدر)ی کوڕەزای (1014–1015) فەرمانڕەواییان کرد.

ئـەم بنەماڵەیـە سـەر بـە خەلافـەتی عەباسـی بـوون و بـە سـەرزارەکی پەیڕەوییان لە (ئال بویهی) دەکرد، بەڵام (ئال بویهی) هیچ کات بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە قەڵەمڕەوی حەسنەوییەکاندا دەسەڵاتدار نەبوون، تا سەردەمی (شەمس ئەلدەولەی دیلەمی )کە (زوهرەدین)ی لە حوکمداری خست و ئەو سەرزەمینەی خستە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی.

بویهییەکان لە سەرەتادا لە سـەر زەمینـی گەیلانـەوە ڕابوون و لـە نێـوان ساڵانی (932–1055) دا فـەرمانڕەواییان کـرد و شیعە مەزهـەب بـوون، ئـەوان زۆربەی ئێران و عێراق وناوچە کورد نشینەکانیان داگیرکرد. سێ کوڕەکەی (بویهیـە)، مـەعز ئەلدەولـە (ئەحمـەد)، عـەماد ئەلدەولە (عـەلی)، روکـن ئەلدەولـە (حەسەن) ئەم ناوچانەیان لە نێو خۆیاندا دابەش کرد. روکن ئەلدەولـە دەستی بەسەر ناوچەکانی باکوردا گرت کە چەند بەشێکی کوردستانیشی دەگرتـەوە.

---

[26] ئـەمین (787–813ز) خەلیفـەی شەشـەمی عەباسـیبوو، لـە 809دا بـووە خەلیفـە، دایکی زوبەیدەی کچی ئـەبو جەعفـەری مەنسور بوو، لەگـەڵ مەئمونی برایدا لەسـەر دەسەڵات لە ململانێدا بوون. (و)

[27] –مـەئمون (788–833ز) خەلیفـەی حەوتـەمی عەباسـییەکان بـوو، دایکـی کـە نیزەکێکی فارس بوو، لەبەر ئەوە ئێرانییەکان لە شەڕی دژ بە ئەمینی برایدا پشتیان گرت، کە بەغدای داگیر کرد ئەمینی بـرای کوشـت، لەسـەردەمی مـەئموندا ئـەدەب وفەلسەفەو وەرگێڕان گەشەی کرد.(و)

مەعز ئەلدەولە چووە بەغدا و ویڕای شیعە بوونیشی فەرمانی خەلافەتی گرتە دەست و بووە پێشەوای مەزهەبیی عەباسییەکان و لە هەمان کاتیشدا خەلیفەی کردە ئامرازی دەست خۆی. ئەم بارودۆخە تا هاتنی (توغرل بەگی سەلجوقی)[28] بۆ بەغدا درێژەی کێشا، کە لە ساڵی (1055ز) دا بەغدای داگیرکرد و خەلیفە ئەلقائمی لە دەست (خەسرەو فەیروزی بویهی) ڕزگار کردو بە خۆی وەك پارێزەری خەلافەت بووە جێنشینی ئەو.

لە ساڵی (990) زدا، پاش مەرگی (کوردباد) فەرمانڕەوای دەستنیشانکراوی خەلیفە (ئەبو عەلی مەروان)ی برازای دەسەڵاتی ناوچەکانی دیار بەکر، میافارقین (سلیڤان)، ئامێدو نەسیبەینی گرتە دەست، کە لە پاش مەرگی عەزد ئەلدەولە لە (983) دا لە چنگی ئال بویهی هاتبووە دەر.

هەرچەند بنەماڵەی مەروانییەکان بەسەر زارەکی خۆیان سەر بە خەلیفەکانی عەباسی پیشان ئەدا، بەڵام لە پاش مەرگی (ئەبو عەلی مەروان)، براو جێنشینەکەی ڕووی لە عەباسییەکان وەرگێڕا و چووە پاڵ فاتمی‌یەکان[29] ئەوانیش لە پاداشتی ئەوەدا حوکمڕانێتی حەلەبیان پێبەخشی و لە بن ڕکێفی حوکمڕانانی حەمدانی[30] عەرەب هێنرایە دەر.

---

[28] –توغرل بەگی سەلجوقی: سەردار و دامەزرێنەری بنەماڵەی سەلجوقییەکان بوو، لە 1063زدا وەفاتی کرد. (و)

[29] –فاتمییەکان: بنەماڵەیەکی شیعەی ئیسماعیلی بوون، بە ڕەچەڵەك خۆیان دەبردەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو تالب و فاتیمەی خێزانیو،کچی پێغەمبەر، لە نێوان ساڵانی 909–1171زدا دەوڵەتیان دامەزران، دە پێشدا لە تونسدا و پاشان لەسەرتاسەری باکوری ئەفریقا و میسردا، شاری قاهیرەیان دروست کرد و نفوزی خۆیان بەسەر سوریا و فەلەستین و لوبناندا بەرفراوان کردەوە، ڕۆشنبیری ئیسلامیی لەسەردەمی فاتمییەکاندا پێشکەوتنی گەورەی بە خۆوەدی.(و)

[30] –دەوڵەتی حەمدانی: حەمدانی کوڕی حەمدون، شێخی خێڵی تەغلب، دامەزرێنەری بوو، لە 829زدا عەبدوڵڵای کوڕی وسەیف ئەلدەولەی کوڕەزای

هەرچەند مەروانییەکان و حەسنەوییەکان لە ڕەچەڵەکدا کوردن، بەڵام بە عەرەب لە قەڵەم دراون، لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە خەلیفەکان بوون و لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیاندا زمانی عەرەبییان وەك زمانی ئیداری بە کاردەهێنا.

هەرچەند ئەم ناوچانە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی (ئەبو ناسر ئەحمەد) دا (1011–1061) بە ئارامی بەڕێوە دەچوون، بەڵام لەم ماوەیەدا دوو جار لەلایەن تورکمانەکانی ئەغوەزەوە کەوتە بەر هێرش و پەلاماردان، کە بەر لە هێرشی سەلجوقییەکان بوو، کە لە پاش تێپەر بوونیان بە خاکی ئێراندا، هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عەرەب و بێزەنتییەکان.

لە ساڵی 1071 دا، نەسری کوڕی ئەبو ناسر ملی بۆ دەسەڵاتی (ئەلب ئەرسەلان) کەچ کرد و لە ساڵی 1085دا مەنسوری کوڕی نەسر بە ناچار ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەمەلەکشای کوڕی ئەلب ئەرسەلان سپارد. کە (ابن جبیر)ی سەرکردەی ، دیار بەکر و جزیرەشی داگیرکرد. مەنسور لە ساڵی 1090 زاییندا وەفاتی کرد. بە درێژایی ئەو ڕۆژگارە، ناوچە کوردنشینەکانی ڕۆژئاوا لە لایەن دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵاتەوە ئیدعای خاوەندارێتی دەکرا و داگیرکران. هەر لەوسەردەمەدا بە هۆی هێرش و پەلاماردانی تورکە سەلجوقی وتیرە تورکمانەکانی دیکەوە، چەند هۆز و تیرەیەکی کورد ملکەچکردنیان بۆ دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵات قبوڵ کرد. لەبەرئەوەی ئیدی چ ئومێدێکیان بە عەباسییەکان نەما بوو کە سنووری دەسەڵاتیان لە دەوروبەری بەغدا تێنەدەپەڕی.

لەگەڵ ئەوەی کوردەکان لە ژێر دەسەڵاتی تورك و تورکمانەکاندا (کە ئەمانیش خۆیان تیرەیەکن لە تورکەکان بەڵام ڕەسەنتر )بوون. وێڕای ئەوەش

---

قەڵەمڕەوی ئەم دەوڵەتەیان بەرفراوان کرد و حەلەبیان کردە پایتەخت، لە 991زدا فاتمییەکان دەوڵەتەکەی لێزەوتکردن. (و)

هەرگیز تورکەکان جورئەتی ئەوەیان نەکرد لە ناوچە کورد نشینەکاندا نیشتەجێبن.

لە پاش ئەوەی تورکەکان، ئازەریەکانیان لە نێو خۆیاندا تواندەوە، بە کۆمەڵ بە ناوچە کوردنشینەکاندا تێپەڕین و لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ و کەنارەکانی سەردەریای سپی ناوەڕاستدا نیشتەجێبوون.

لەم ناوچانەدا لەگەڵ دانیشتوانی پێشتریدا واتە ئەقوامی (کاپادوکیا، بێزەنتییەکان، لیدییەکان، بیسانییەکان) وئەوانی دیکەدا ئاوێتە بوون و ئەوانەیان کرد بە تورك. تواندنەوەی ئەم گەلانە کەمتر لە دووسەد ساڵی خایاند.

بێ توانایی تورکەکان و نەمانەوە وجێگیر نەبوونیان لە نێو ئەو چیا و کوێستانانەدا کە زێد و مەسکەنی کوردانی دڵڕەق و بێبەزەیی بوو، دەرخەری ئەم ڕاستییەیە کە ئەو ناوچە فراوانەی نێوان دوو ناوچەی تورك نشینی ئازەربایجان و ئەنادولی، لە ژێر دەسەلاتی کوردەکاندا مایەوە. کە لەو مەڵبەندەدا کوردەکان تا ئێستا توانیویانە زمان‌ودابو نەریت و ڕەوشی ژیانی سەربەخۆی خۆیان بپارێزن، بێ ئەوەی پەی بە چەمکی سەربەخۆیی سیاسی ببەن، یا توانای چۆنیەتی بەڕێوەبردن و ڕێکخستن و بەرپرسیارێتیان هەبێت. بەمجۆرە هەر لە دۆخی یاخیگەری‌و بێ یاساییدا ماونەتەوە.

هەرچەند هەم حەسنەوییەکان و هەم مەروانییەکان لە بنەماڵەیەکی کوردی ڕەسەن بوون وبە سەر بەشێکی فراوانی وڵاتی کوردستاندا فەرمانڕەواییان دەکرد، بەڵام ئێستا کوردەکان بە دەگمەن ناویان دەهێنن، بەڵکو پتر شانازی بە سەرکردەی دلێری خۆیان (سەلاحەدینی ئەیوبی)یەوە دەکەن، وێڕای ئەوەی سنووری قەڵەمڕەوی حکومەتی ئەو گەلێك فراوانتر بوو لە قەڵەمڕەوی مەروانییەکان و حەسنەوییەکان، بەڵام بایەخی‌بە کورد بوونی خۆی‌نەداو، قەڵەمڕەوی حکومەتەکەشی پتر لە ناوچە غەیرە کورد نشینەکان پێکدەهات،

زۆربەی ناوچەكانی كوردستان بەدەر لە دەسەڵات و سنووری حكومەتی ئەودا بوون.

سەلاحەدین لە ساڵی(1136ز) دا لە تكریت ، كە دەكەوێتە سەر كەناری دیجلەو باكوری سامەڕاوە، لەدایك بوو. لە خزمەت (ئەتابەكی زەنگی)دا، كە یەكێك بوو لە سەلجووقییەكانی سوریا دەستی بەكاركرد، پاشان لە حەلەبدا بووە جێنشینی ئەو، زەنگی لەوە بەدوا بەرەنگاری خاچپەرستەكان[31] بۆوە لە فەلەستین و ئەنتاكیا دا. نورەدینی كوڕی ئەتابەكی زەنگی پاش ماوەیەك سەلاحەدینی بەیاوەری لەگەڵ شێركۆی مامیدا نارد بۆ میسر، تا فەرمانڕەوای میسریی هاوپەیمانی كە (شاهوار) ناوێك بوو بگێڕنەوە بۆ پایە و دەسەڵاتی خۆی، كە لەلایەن یەكێك لەدوژمنەكانییەوە لە میسردا دەرپەڕێندرا بوو. لەم كاتەدا میسر لە ژێر فەرمانی (ئەبو مەحمود عەبدوڵڵا)ی خەلیفەی فاتمیدا بوو. شێركۆ وسەلاحەدین ناچار بوون لەگەڵ ئەودا پەیوەندی دۆستانەیان هەبێ. خاچپەرستەكان دركیان بەوە كردبوو كە یەككگرتنی میسر و سوریا بە مانای كارەسات دەبێ بۆیان. هێرشیان كردە سەر لەشكری سوریا، شێركۆ كە لەو دەمەدا كرابووە فەرمانداری میسر لە پاش چەند مانگ وەفاتی كرد، سەلاحەدین لەشكری خاچپەرستانی لە سوریا دا تێكشكان. لە پاش مەرگی خەلیفەی فاتمی لە ساڵی (1171ز) دا میسری كردە بەشێك لە قەڵەمڕەوی خەلافەتی عەباسی. سەلاحەدینی ئەیوبی لە پاش مەرگی (نورەدین زەنگی) ئەریابی، سوریای بە ناوی جێنشینی ئەوەوە (الفتاح) داگیركرد و پاشان بە

---

[31] هێرشی خاچپەرستەكان: ئەو لەشكر كێشی و هێرشانەن كە مەسیحییەكانی ڕۆژئاوا لە چەرخەكانی ناوەڕاستدا پێیهەستان لە نێوان ساڵانی(1096–1291)، بە ئامانجی دەستبەسەراگرتنی ئورشەلیم و زەوییە پیرۆزەكانی فەلەستین، لەبەر ئەوە بەو ناوەوە ناونرا كە چەك و جلوبەرگی جەنگاوەرانی مەسیحی نیشانەی خاچی پێوەبوو، هێرشی خاچپەرستەكان دابەش دەكرێ بە 8 لەشكر كێشییەوە.(و)

خۆی بووە حوکمڕانی ئەویندەر و قەڵەمڕەوی حکومەتی خۆی تا میسر بەرفراوان کردەوە، هەروەها حیجاز و نیمچەدورگەی عەرەبیشی خستە سەر قەڵەمڕەوی حکومەتی خۆی و قودسیشی لەژێر ڕکێفی هێزە خاچپەرستەکان ڕزگار کرد. ئەو لەگەڵ ریتشاردی شێردڵیشدا[32] جەنگاو سەرەنجام خاچپەرستەکانی ناچار کرد کە سەرتاسەری خاکی فەلەستین بەجێبێڵن، تەنها چەند قەڵایەکی جەنگی نەبێ کە لە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستدا بوون.

سەلاحەدین لە ساڵی 1193ی زایینداا لە دیمەشقدا وەفاتی کردو لە پاش مەرگیشی ئیمپراتۆریەتەکەی لە نێوان کوڕەکانیدا دابەش کرا.

(ئەفزەل) حکومەتی دیمەشقی گرتە دەست، (عەزیز) حکومەتی قاهیرە و (زوهێر)یش حکومەتی حەلەب. پاشان حکومەتی ئەوان کەوتە دەست سەرانی ناوچەیی و تەنها حەلەب تا ساڵی 1390 لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەیوبییەکاندا مایەوە.

عەگیدی وجوامێری و مەزنایەتی و تایبەتمەندییە جەنگییەکانی سەلاحەدین، ئەوی کرد بە یەکێك لە قارەمانە ئەفسانەییەکانی جیهانی ئیسلام. لە ڕاستیدا دەبێ کوردان شانازی بەوەوە بکەن کە ئەم پیاوە مەزنە سەر بە نەژادی ئەوانە.

پاش هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی سەلجوقی، کە ڕووبەری حوکمڕانییان هێندەی ڕوبەری هەردوو دەوڵەتی پارسییەکان و ساسانییەکان دەبوو، هەموو ئەو ناوچانەشی دەگرتەوە کە کوردەکانی تیادا نیشتەجێ بوو، چەند لقێکی جیاوازی ئەم بنەماڵەیە لە کرمان و ئەنادۆڵ، و سوریا و عێراقدا حکومەتیان دەکرد. سەلجوقییەکانی عێراق کە سەرئێلی ئەوان (مەحمودی کوڕی

---

[32] ریچاردی شێر دڵ: ریچاردی یەکەمی پاشای ئینگلتەرا (1189–1199) ، لە سێهەم هێرشی خاچپەرستەکاندا بەشداری کرد و سەرەنجام لە نزیکەوە لەگەڵ سەلاحەدینی ئەیوبیدا پەیوەندی پەیدا کرد. (و)

مەلەكشا)یە، بەسەر بەشێك لە كوردستاندا فەرمانڕەواییان كرد لە نێوان سالآنی (1117–1194)دا.

{شایانی باسە، ناوی (كوردستان) لەسەردەمی (مەلەكشا) یا (سوڵتان سەنجەری سەلجوقی)ەوە بەكار هێنرا، پێشتر زۆربەی ناوچە كوردنشینە سەرەكییەكان بە (مەڵبەندی چیانشین) ناودەبران} .

بەلآم لە سەردەمی سەلاحەدین و پاش ئەویشدا بەشێكی گەورەی ناوچە كوردنشینەكان لە ژێر سایەی حكومەتی ئەتابەكان[33] (برایان)ی سەلجوقیدا بوو. كە لەسەردەمی خودی سەلجوقییەكانەوە بە فەرمانڕەوای ئەم ناوچانە دادەنران و پاش هەرەسهێنانی ئەم بنەماڵەیەش بۆ خۆیان بە سەربەخۆیی حوكمڕانیان دەكرد.

هەموو ئەتابەكانی تورك هەرچەند كە لە حوكم كردندا سەربەخۆیی تەواویان هەبوو، بەلآم بەسەرزارەكی پەیڕەوییان لە خەلیفەكانی عەباسی دەكرد. ئەو ئەتابەكانەی كە بەسەر ناوچە كوردنشینەكاندا حوكمڕانیان كرد بریتین لە:

1–نەوەكانی سبك تكین (1144–1232) لە دەوروبەری ئەربیل (هەولێر) دا فەرمانڕەواییان كرد. كە یەكەمین ئەتابەكی ئەوان زەینەدین عەلی كوچەكی كوڕی سبك تكینە.

2–ئورتوكییەكان (1101–1312) كە یەكەمین حوكمڕانی ئەوان (ئارتوك)ە،

---

[33] ئەتابەك: بەمانای لە (جێی باوك)دێ، مەلەكشاه یەكەم كەس بوو ئەم نازناوەی بە (نیزام مەلیك)ی وەزیری خۆی بەخشی. ئەتابەكەكان لەسەرەتادا ئەركی پەروەردە كردنی میروشازادەكانیان لە ئەستۆدا بوو. پاشان ئەم نازناوە بە فەرماندە سەربازییەكانیش دەبەخشرا، لەسەدەی دوانزەدا ئەتابەكەكان ئەمیرەكانی سەلجوقیان لە كار خست و بەخۆیان دەسەلآتیان گرتە دەست، لە ئازەربایجان و موسڵ و دیمەشق دا فەرمانڕەواییان كرد. (و)

بەسەر دیاربەکرو بۆ ماوەیەکیش بەسەر حەلەب و ماردیندا حوکمڕانیان کرد.

3-شاکانی ئەرمەنی (1100-1207) کە موسالهناقبتی‌یە : لە کاتی حوکمڕانی ئەم میرانە دا (کە هەموویان بە هۆی نزیکی و گەشت کردنەوە بۆ ناوچە عەرەب نشینەکان، ببوون بە عەرەب)هیچ کات کوردەکان هەوڵ و کۆششێکیان لە پێناو یەکبوون‌و، دامەزراندنی حکومەتی خۆیاندا ئەنجام نەدا، بەڵام زمانی کوردی وەك زاری ئاخاوتن لە نێو خەڵکیدا مایەوە. هەرچەند زاری بەڕێوەبردن و ئەدەبیات عەرەبی بوو، هێندێك جاریش فارسی‌و تورکی بوو.

لەم سەردەمەدا، ئیشوکاری میرەکانی کورد ببووە شەڕو پێك هەڵپژان لەگەڵ یەکتریدا، کە هێندێك جار لە نێو خۆیاندا لە دژی یەکدی یەکیان دەگرت. هێندێك جاریش خێڵە بێهێزەکان ملیان ڕادەکێشا بۆ خێڵە بەهێزەکان.

هێرشی مەغۆلەکان[34] بە فەرماندەیی کوڕەکانی جەنگیزخان بۆ سەر ئێران و بەشێك لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە مەبەستی تێکشکانی بەرگری جەلالەدین خوارزم مشاو تەفروتوناکردنی ئەو بوو.

جەلالەدین (کە پێشتر بەدەست خودی جەنگیزخان تێکشکابوو، قەڵەمڕەوی حکومەتەکەی خۆی لە خوارزم وڕۆژهەڵاتی ئێراندا لەکیس چوو بوو، ماوەیەك بوو لە ڕۆژئاوای ئێراندا حوکمڕانی دەکرد) سەرقاڵی جەنگە

---

[34] مەغۆل: سەرزەمینی ئەسڵی مەغۆلە زەردپێستەکان ناوچەی نێوان باکوری چین و دەریای خەزەرو دەشتی سیبریا و کێوەکانی هیمالایا بوو، کە خەریکی شوانکارەیی و ئەسپ سواری بوون، لە نێو ئێلی (قیات) دا (تموچین) ناوێك کە دواتر نازناوی (جەنگیزخان)ی لێنرا، بووە سەرئێل و هۆزەکانی هاونەژادی خۆی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە، پاشان لەشکر کێشی مەغۆلەکان بە فەرماندەیی جەنگیزخان و کوڕەکانی سەرتاسەری ناوچەی نێوان چین و دەریای ڕەشی ڕاچڵەکان.(و)

ناوخۆییەکان بوو لەگەڵ ئەتابەکان و سەرۆکە بچووکەکانی ناو خۆی ئێراندا. مەغۆلەکان چەند شارێکی سەرەکی وەك قەزوێن و هەمەدان و تەوریزیان داگیرو وێران کرد، بەڵام لەو کاتەدا نەچوونە نێو ناوچەکانی کوردستانەوە.هەر چەند ئەم ناوچانەش بەناو لەژێر سایەی حوکمی مەغۆلەکاندا بوون . لە ساڵی 1213دا جەلالەدین خوارزمشا لە کوێستانەکانی دیار بەکردا بە دەستی کوردێك کوژرا.

لە پاش مەرگی جەنگیزخان، لە ڕۆژگاری (ئۆگتای قائان)ی جێنشینیدا، ئەرکی بەرفراوان کردنەوەی دەسەڵاتی مەغۆلی بەسەر ئێران و سەرتاسەری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە (هۆلاکۆ خان)ی برا بچوکی سپارد. هۆلاکۆخان سەرتاسەری دەشتە نزمەکانی ئێرانی داگیرکرد، و دەستی گرت بەسەر قەڵاکانی (ئیسماعیلی)ەکاندا[35]، کە زۆربەیان لە کوێستانەکانی

---

[35] -ئیسماعیلی: تەریقەتێکی سەر بە شیعەگەرییە، لە پاش ئیمام (جەعفەری سادق) ئیمامی شەشەمی شیعەکان، (ئیسماعیل)ی کوڕە گەورەی ئیمام جەعفەریان بە ئیمامی حەوتەم و دوائیمامی شیعەکان دەزانی، لە سەرەتای سەدەی دەیەمی زاییندا لە باشوری عێراقدا لە ژێر فەرماندەیی (حەمدانی قرمطی)دا چالاکییان دەکرد. ئەم لقە بە ناوی (قرامطە)وە ناوبانگی دەرکرد، لە سەدەی دەیەمەوە تا سەدەی سیانزەهەم جێپێی خۆیان لە عێراق و یەمەن و بەتایبەتی لە (بەحرێن) دا کردەوە. لەسەدەی دەیەمدا (910ز) عوبەیدوڵڵای کوڕی محەمەد کە ڕەچەڵەکی خۆی دەبردەوە سەرفاتمەی خێزانی ئیمامی عەلی و کچی پێغەمبەر بنەماڵەکەی خۆی بە بنەماڵەی (فاتمی)ناوبردو لە باکوری ئەفەریقا و میسردا فەرمانڕەواییان کرد. بەڵام ئەو جودایی و کەرتبوونەتێکدەرەی کە بزوتنەوەی ئیسماعیلییەکانی لاوازکرد. لەئاکامی مەرگی (مستەنسر) دوا خەلیفەی فاتمیدا بوو، ئیسماعیلییەکانی میسر (مستەعلی) کوڕیان بە جێنشینی ئەو دەزانی و ئیسماعیلییەکانی ئێران و سوریاش ئیدعای خەلافەتی (نزار)ی کوڕەگەورەی موستەنسریان پێقبوڵ بوو. بەمجۆرە ئیسماعیلییەکان بوون بە دوولقی (مستەعلی) و (نزاری)ەوە نزارییەکان لە قەڵاکانی ئێران و سوریا دا بوون و بە ناوی (حەشاشین)ەوە ناوبانگیان دەرکرد کە هۆلاکۆ لەو

ئەلبورزدا بوون و ویرانی كردن، دوا میری ئەوانیشیان (روكن ئەلدین) یا (خورشا)یان بەدیل گرت و كوشتیان . پاشان بە ناوچەكانی هەمەدان و كرماشاندا تێپەرین و چوونە بەغداوە سیوحەوتەمین خەلیفەی عەباسییان (ئەلمعتەسد باللە)یان بەدیل گرت و كوشتیان، بەمجۆرە لە (1258) دا كۆتاییان بە خەلافەتی ئیسلامی هێنا.

لەم كاتەدا هەموو ناوچە كوردنشینەكان لە مەترسی هێرشی مەغۆلدا بوون. لە سالی 1259دا دوو لەشكر لەسیٚ لەشكری مەغۆل لە ئازەربایجاندا، كە بارەگای هۆلاكۆ بوو، ڕوەو سوریا حەرەكەتیان كرد. ئەم لەشكرانە بە ناوچە كورد نشینەكاندا تێپەرین و ڕوویان كردە ڕۆژهەلاتی گۆلی وان و نەسیبەین و هەموو (جزیریٚ)یان داگیركرد، كوردەكان بەرگرییەكی ئەوتۆیان نەكرد، لەبەر ئەوە قەتلوعامێكی ئەوتۆ ڕوویندا. تەنها لە میافارقین لە نزیكی دیار بەكردا، میرێكی كوردی ئەیوبی (كامیل محەمەد) بۆ ماوەیەكی كورت بەرگری كرد، پاشان بە ناچاری خۆی دابە دەستەوە و خودی ئەو و زۆربەی خەلكی شاریش قەتلوعام كران.

لەسالی 1262زاییندا یەكێك لە نەوەكانی ئەتابەكی موسلٚ بە ناوی (بەدرەدین لۆلۆ)ەوە كە سەر بە مەغۆلەكان بوو، لەگەلٚ دوژمنانی مەغۆلدا واتە لەگەلٚ سولتانەكانی مەمالیك[36]دا یەكیگرت و بەرەنگاری لەشكری مەغۆل بۆوە، بەلام لەشەڕدا تێكشكاو، شاریش بە فەرمانی هۆلاكۆ تالان كرا و

---

ناوچانەدا تەفروتونای كردن، بەلام نزارییەكان لە پەناو پەسێودا درێژەیان بە بیروباوەڕی خۆیان داو لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە رابەرەكەیان بە (ئاغاخان) ناو دەبرا.(و)

[36] -مەمالیك: بریتی بوون لەو تورك وچەركەس و مەغۆلە كۆیلانەی كە ئەیوبییەكان لە شەڕوكاری سەربازیدا بەكاریان دەهێنان، دواتر هەندیٚ لەسەركردەكانیان جلەوی دەسەلاتیان گرتە دەست لە میسرداو، دووبنەمالەی مەمالیكی (بەحری) و (بورجی) یان دامەزران.(و)

موڵکەکانی بەدرەدین لۆلۆش خرایە سەر قەڵەمڕەوی موڵکەکانی مەغۆل.

لەم کاتەدا ئاسیای بچووک کە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی، مەڵبەندێکی کوردنشین بوون، لەژێر سایەی حوکمی سەلجوقییەکانی ڕۆمدا بوو،کە لە نێوان ساڵانی 1077تا1300 بە سەرئەم ناوچانەدا فەرمانڕەواییان کرد. هەرچەند ئەم بنەماڵەیە بە سەرزارەکی سەر بە مەغۆلەکان بوون، بەڵام بەڕەسمی سەربەخۆ بوون و تەنانەت زۆربەی کات سەرقاڵی شەڕە ناوخۆییەکانی نێوان خۆیان بوون. سەرەنجام بەشێك لەم موڵکانە لەلایەن کەیکاوسی دووەمەوە دەستی بەسەردا گیرا و بەشێکی دیکەشی بە قزل ئەرسەلانی چوارەم بڕا.

بەڵام کوردەکان نەیانتوانی لەم سەردەمەدا سوود لە ناکۆکی و ململانیێ نێوان دوژمنەکانیان وەرگرن و سەربەخۆبن، بەڵکو تەنها بەوە دڵخۆش و ڕازیبوون کە جاروبار ئەربابەکانیان دەگۆڕا.

لەساڵی 1297 دا کوردەکان شاری ئەربیل (هەولێر)یان گەمارۆ دا و چوون بە هانای لەشکری مەغۆلەوە، تا دەست بەسەر ئەو ناوچەیەدا بگرن کە زۆربەی دانیشتوانەکەی ئاسوری بوون، گەرەکیان بوو زۆربەیان قەتلوعام بکەن. کوردەکان بە هۆی موسڵمان بوونیانەوە لەو دەمەوەی کە ئیلخانی مەغۆل (غازان مەحموود) بووە موسڵمان، لەگەڵ مەغۆلدا هاوکارییان دەکرد، لە ماوەی دووەمین چارەکی سەدەی چواردەی زاییندا، بنەماڵەی ئێلخانی[37] مەغۆل بە هۆی ململانێی نێو خۆیانەوە بێهێز بوون و دەسەڵات کەوتە دەست ئەمیرانی مەغۆلەوە کە لە هەموویان گرنگتر (حەسەنی مەزن) و(ئەمیر چۆپان) بوون. لە ساڵی 1349دا بنەماڵەی ئێلخانەکان تەفروتونابوون. پاش ئەوەی ئەمیر حەسەنی چۆپان حکومەتێکی لە ئازەربایجاندا پێکەوە نابوو بە دەستی قپچاق

[37] بنەماڵەی ئێلخانی مەغۆلی لە نێوان ساڵانی (1256–1336) دا بەسەر ئێراندا فەرمانڕەواییان کرد.(و)

خانی مەغۆل (کە یەکێك بوو لە مەغۆلەکانی روسیا)کوژرا. شێخ ئادەمی جەلایری لە پاش یاخیبوونێکی کورت تەورێزی خستە سەر قەڵەمڕەوی موڵکەکانی خۆی، لەپاش ئەویش، (ئوەیسی حسێن) دەسەڵاتی گرتە دەست ولە پاش مەرگی (ئەمیر حسێن سەدر) یش لە ساڵی 1382دا قەڵەمڕەوی جەلایرییەکان[38] لە نێوان هەردوو برا سوڵتان ئەحمەد و بایەزید دا دابەشکرا و ناوچە کورد نشینەکان درایە دەست بایەزید.

لەم بارودۆخەدا تیرەیەکی تورکمان کە بە (قەرەقۆینلو)[39] ناسراون، حکومەتێکیان لە کوردستاندا دامەزراند و سنووری دەسەڵاتیان تا ناوچەکانی گۆمی ورمێ پەلی هاویشت، سەرەنجام تەورێزو بەغدادیشیان خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆیان . تیرەیەکی تورکمانی دیکە کە (ئاق قۆینلو)ن[40] پاشەکشێیان بە هێزی قەرە قۆینلو کرد و عێراق وئازەربایجان و کوردستانیشیان خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆیان.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە لە ڕۆژگاری هێرش و داگیرکاری

---

[38] -جەلایرییەکان: بنەماڵەیەکی مەغۆلی بوون. حەسەنی مەزن (شێخ حەسەنی جەلایری) دامەزرێنەری بوو، لە نێوان ساڵانی (1339-1411)دا لە عێراقدا فەرمانڕەواییان دەکرد، بەغدایان کردە پایتەختی خۆیان و سنوری دەسەڵاتیان تا ئازەربایجان بەرین دەبۆوە. بنەماڵەی قەرەقۆینلو تەفروتونای کردن. (و)

[39] -قەرە قۆینلو: (مەڕی ڕەش) بنەماڵەیەکی تورکمان بوون لە نێوان ساڵانی (1375-1468) بەسەر بەشێك لە ئێران و ئاسیای ناوەڕاست و ئازەربایجان و کوردستاندا فەرمانڕەواییان کرد، لەلایەن هێزەکانی (ئاق قۆینلو)ەوە تێکشکان. (و)

[40] -ئاق قۆینلو: (مەڕی سپی) بنەماڵەیەکی دیکەی تورکمان بوون، لە پاش لەشکر کێشی مەغۆلەکان ناوچەی نێوان دیار بەکر و فوراتیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، پاشان ناوچەی ژێر دەسەڵاتی (قەرە قۆینلو)یان خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆیان، دەسەڵاتیان لەسەدەی چواردەوە تا 1502ز، درێژەی کێشا، لەم ساڵەدا لە لایەن سەفەوییەکانەوە لەناوبران. (و)

سەلجوقییەکانەوە لە ساڵی 1055دا تا هەرەسهێنانی حوکمی عەباسییەکان، پێکڕای ئەم میرنشینانە لەژێر دەسەڵاتی میرەکانی تورکدا بوون و لەڕێگای جەنگاوەرانی خۆیانەوە فەرمانڕەواییان بەسەر خەڵکیدا دەکرد، ئەم کارەیان بە ناوی خەلافەتەوە بەڕێوە دەبرد. ئەم میرانە زمانی فارسی و عەرەبی فێرببوون و لە کاروباری بەڕێوەبردنی مەملەکەتی خۆیاندا بە کاریان دەهێنان، بەڵام لە پاش هێرشی مەغۆلەکانەوە زاری جەغتائی بووە زاری سیاسەت و حوکم کردن.

بنەماڵەی ئاق قۆینلو لەسەردەمی (ئۆزۆن حەسەن) دا بە ترۆپکی هێز و دەسەڵاتی خۆیان گەیشتن، ئەم میرە کیژی ئیمپراتۆری بێزەنتی مارەکرد کە (مارتا)ی ناوبوو (دواتر بە حەلیمە ناوبرا)، پاشان کیژی ئەم خانمە لە سوڵتان حەیدەری سەفەوی مارە دەبڕێ و دەبێتە دایکی شا ئیسماعیلی سەفەوی کە بنەماڵەی سەفەوییەکانی[41] لە ئێراندا دامەزران.

لە کۆتایی سەدەی چواردەی زایینیدا، داگیرکەرێکی دیکە لە ڕۆژهەڵاتەوە پەیدا بوو کە سەرتاسەری ئێرانی خستە بەرهێرش و پەلاماردان ئەویش ئەمیر تەیموری گورگانی بوو. ئەمیر تەیمور پاش داگیرکردنی ماردین و دیاربەکر، دەستی بەسەر هەموو ناوچەکانی کوردستاندا گرت. لەراستیدا کوردەکان لەم هێرش و پەلامارەدا کەمتر لە ناوچەکانی دیکەی ئێران زیانیان لێکەوت، لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا زۆربەیان دەوارنشین بوون و لە کوێستانە دوور دەست و

---

[41] –سەفەوییەکان: لە بنەڕەتدا بە ناوی شێخ سەفەدین ئەردەبیلی باپیرە گەورەیانەوە ناوبران، کە پێشەوای سۆفییەکانی ئازەربایجان بوو، سەفەوییەکان کۆتاییان بە دەسەڵاتی بنەماڵە تورکمانەکان لە ئێران وعێراق دا هێنا و دەوڵەتی سەفەوییان دامەزران، تەورێزیان کردە پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی، مەزهەبی شیعەیان کردە مەزهەبی رەسمی ئێران. لە نێوان ساڵانی 1492–1735دا فەرمان ڕەواییان کرد.(و)

دەرە قايمەكاندا دەژيان، ناوچە شار نشينەكانى ئەم مەڵبەندە بە شێوەيەكى سەرەكى ئەرمەنى و ئاسورى نشين بوون.

لەم كاتەدا كوردەكان خاوەنى سوپايەكى تۆكمەو ڕێكخراو نەبوون، پتر لە ڕێگاى شەڕى گەريلايى و زەبروەشاندن و هەڵاتنەوە پارێزگارييان لە خۆيان دەكرد.

لە ساڵى 1402دا، ئەمير تەيمور هێرشى كردە سەر ئەنادۆڵ و شكستێكى سەختى بەسەر يلدرم بايەزيدا هێنا. لەم هێرشەدا تەيمور سەربەخۆيى بۆ حەوت ميرنشينى بە ناوبانگى تورك (لەكۆى نۆ ميرنشين كە بايەزيد خستبويە سەر موڵكەكانى خۆى) نوێ كردەوە.

پاش ماوەيەكى كەم تەيمور گەڕايەوە بۆ ئەوبەرى ڕوبار[42]، لە ساڵى 1405دا لە شارى ئەترار دا لە كاتێكدا كە سەرگەرمى داگيركردنى چين بوو وەفاتى كرد. جێنشينەكانى ئەو بۆ ماوەيەك لە ناوچەكانى ڕۆژهەڵاتى ئێران و توركستاندا حوكمڕانييان كرد و سەرەنجام بە دەستى ئەميرەكانى شەيبانى كە لە دەشتەكانى سيبرياوە هاتبوون تەفروتوناكران و شا ئيسماعيلى سەفەويش (محەمەد زوهير ئەبن بابر)ى لە توركستاندا دەرپەڕاندو ناوبراو لە ناوچەكانى ئەفغانستان و كابولدا بنەماڵەى تەيمورى وئيمپراتۆريەتى مەغۆلى هندى دامەزران. واتە پاش ماوەيەك هنديشى خستە سەر قەڵەمڕەوى دەسەلاتى خۆى.

ئەو سەرزەمينەى كە ئەو كات بە كوردستان بە ناوبانگ بوو، بەشێكى بە جزيرێ ناودەبراو بەشێكى ديكەشى بە ئەردەلان.

هێندێك جار لە ژێر حوكمڕانى جەلايرييەكان و سەردەمێكيش لەژێر دەسەلاتى ئاق قۆينلو و جاروباريش لەژێر حوكمڕانى ئەرە قۆيونلوەكاندا بوو.

---

42 -مەبەست لە ئەوبەرى ڕوبارى جەيحونە (ئاموداريا) لە ئاسياى ناوەڕاستدا كە سەمەرقەندو بوخارا و چەند ناوچەيەكى ديكەى ئۆزبەكستان دەگرێتەوە.(و)

ئەم بنەماڵانە خۆیان بە ئێرانی ناو دەبرد. کوردەکانیش ئەوکات خۆیان بە ئێرانی دادەنا، هەرچەند لە نێو خۆیاندا یەکنەبوون و بەسەر چەند میرنشینێکدا دابەش ببوون.

لەگەڵ بە دەسەڵات گەیشتنی شا ئیسماعیلی سەفەویدا کۆتایی بە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی (جەلایر وئاق قۆینلو وقەرە قۆینلو) هێنرا و بنەماڵەیەکی نوێ هاتە سەرکار.

لەم کاتەدا کوردەکان خۆیان بە ئێرانی ناو دەبردو وەك هەموو گەلانی دیکەی ئێرانی، خۆیان لە چارەنوسی خاکی ئێراندا بە هاوبەش و بەشدار دەزانی و ڕێزیان لە کولتور و ئەدەبیاتی فارسی دەگرت. پاش بە دەسەڵات گەیشتنی بنەماڵەی سەفەوی، سەرپێچی کردن بەرامبەر بە دەوڵەتی ئێران لە نێو کوردەکاندا سەریهەڵدا. هۆی ئەم یاخیگەرىیە ڕوون و ئاشکرایە ، چونکە شا ئیسماعیلی سەفەوی کە بە خۆی لە بنەماڵەی سادات و ئەولادی ئیمام موسای کازم بوو، مەزهەبی شیعەی (کە لەو دەمەدا لە ئێراندا کەمینەبوو) بەسەر هەموو ئەو ئێرانیانەی دیکەدا زاڵ کرد کە پەیڕەوی مەزهەبە جیاوازەکانی بوون، کوردەکانیش کە زۆر بەیان سونی مەزهەب بوون، دەرهەق بە ئێران هەستیان بە نامۆیی و بێگانەیی کردو کەوتنە داوێنی سوڵتانەکانی عوسمانییەوە[43].

---

[43] عوسمانییەکان: بنەماڵەیەکی تورك بوون، دەوڵەتەکەیان بە ناوی (عوسمانی کوڕی توغرل)ەوە ناوبراوە کەیەکەم رابەری گەورەیان بوو، بەڕەچەڵەك دەچنەوە سەربیابان نشینەکانی ئاسیای ناوەڕاست، پاش ئەوەی هاتنە سەر ئایینی ئیسلام، هێزێکی گەورەیان پێکەوەناو هێرشیان کردە سەر ئەنا دۆڵ‌و، لە نێوان ساڵانی (1326-1516) میرنشینیان پێکهێناو لە (1516-1924)دا دەوڵەتی خەلافەتیان دامەزران. لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا (1520-1566)دا دەوڵەتی عوسمانی گەشتە ترۆپکی دەسەڵاتی خۆی لە ڕووی سیستەمی ئیدارە و هێزی سوپاوە، سوڵتان سەلیم شاری بلگراد و وڵاتی هەنگاریای داگیرکرد، ئابلۆقەی ڤێنای پایتەختی نەمسای دا ولە باشوری ئەڵمانیاشدا پێشڕەوی کرد، کوردستان و بەشێك لە ئێران و بەغداشی

پاش تێکشکانی تورکانی ئاق قۆینلو لەلایەن تورکە عوسمانییەکانەوە، کە لەگەڵ یەکدیدا لە پێناو دەست بەسەراگرتنی میرنشینی (قەرەجان)دا لە جەنگ و ململانێدا بوون، تورکانی ئاق قۆینلو ڕەوو ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان پاشەکشێیان کرد.

لەسەردەمی بایەزیدی دووەمی جێنشین و کوڕی (محەمەد فاتح) دا سنووری دەسەڵاتی عوسمانی لە دەوروبەری قەڵەمڕەوی خاکی ئێران نزیک بۆوە کە پاشتر بنەماڵەی سەفەوی تیادا دامەزرا.

شا ئیسماعیلی سەفەوی دەیویست پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا هەبێ، بەڵام بایەزید لەگەڵ نوێنەرانی ئەودا کە بە مەبەستی پیرۆزبایی کردن لە بایەزید چووبوونە ئەستەنبوڵ بە سوکایەتییەوە ڕەفتاری لەگەڵ کردن و بایەخی پێنەدان. بەدوای ئەم ڕووداوەدا تۆوی جەنگ وکینە ودوژمنایەتی لە نێوان دوو دەوڵەتدا چێنرا.

سوڵتان بایەزید بە هۆی ئەو هێرش و جەنگانەی کە لەگەڵ پاشاکانی ئەوروپادا هەیبوو، سەبارەت بە داگیرکردنی ناوچەکانی کوردستان و ئەرمەنستان هێندە بە ئارەزوو نەبوو، کە ئەو کات چرای بنەماڵەی ئاق قۆینلو لە وێدا ڕووی لە خامۆشیو کوژانەوە دەکرد. پاش ئەو سوڵتان سەلیمی کوڕی بڕیاریدا سنوورەکانی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی نە تەنها لە ئەوروپادا، بەڵکو لە ڕۆژهەڵاتو باشوریشدا بەرفراوان بکاتەوە. لە پاش ئاڵوگۆڕکردنی چەند نامەی پڕ لە هەڕەشە و دوژمنانە لەگەڵ شا ئیسماعیلدا، سوڵتان سەلیم بڕیاریدا بەرەو ڕۆژهەڵات ببزوێ، پاش تێکشکانی تیرە پەرت و بڵاوەکانی کورد، لە سوپای ئێرانییەکان نزیک بوەوەو لە پێدەشتی چاڵدێراندا

---

لە ئێران و بەغداشی داگیرکرد، قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی عوسمانییەکان گەلێك فراوان بوو، چەندین سەدە سوڵتانەکانی عوسمانی فەرمانڕەواییان بەسەر بەشێك لە ئاسیاو باکوری ئەفەریقا و ناوچەی بالکان دا، کرد.(و)

شکستێکی سەختی بەسەر شا ئیسماعیلدا هێنا. ئەم تێکشکانە پتر بە هۆی هەڵەی شا ئیسماعیلەوە بوو، کە لە بری ئەوەی سەربازانی لەشکرەکەی لە ناوچە بەرزەکانی ڕۆژهەڵاتی چاڵدێراندا جێگیر بکات ئەوانی بۆ نێو دەشتەکان ڕاپێچ کرد. پاش ئەم تێکشکانە بارودۆخی کوردەکان گۆڕانکارییەکی گەورەی بەسەردا هات، زۆربەی سەرۆك هۆزەکانی کورد بە بەڵێنەکانی سوڵتانی عوسمانی لەخشتەبران، ولایەنی هاوەڵانی سونی مەزهەبی خۆیان گرت.

مەلەکشا ئەمیر حەسەن دووبارە دەستی گرتەوە بەسەر (سرت)دا کەلەلایەن ئێرانییەکانەوە لەوێدا دەرپەڕێندرا بوو، ئەحمەد بەگ لە (میافارقین)، محەمەد بەگ لە (ساسۆن)، قاسم بەگ لە (ئاجیل)، جەمشید بەگ لە (پاتو)دا، خۆیان دایە پاڵ تورکەکان، و گەشتنە سەر سنووری حکومەتی ناوچەکانی موسڵ و جزیرێ وئەربیل. بەمجۆرە 25کەسایەتی لە سەرۆك هۆزە سەرەکییەکانی کورد چوونە پاڵ تورکە عوسمانییەکانەوە وسەرتاسەری ناوچەکانی ئەربیل و کوێستانەکانی زاگرۆس و موسڵ و دیاربەکر بەیەکجارەکی لە ئێران جیابوونەوە. مەسەلەی سنوورەکان هەمیشە ڕوو لە گۆڕان بوو. هەرچەند لە ڕۆژگاری شا طهماسب وشاعەباسدا ئێرانییەکان بۆ ماوەیەك تا ناوچەکانی موسڵیان بەدەستەوەبوو. بەڵام لەپاش جەنگی نێوان سوڵتان مورادو شاسەفی لە ساڵانی (1633–1640)دا تەواوی ئەم ناوچانە بوون بە بەشێك لە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و لەم کاتەوە تا ئێستا ئەم سنوورانە تا ڕادەیەك وەکو خۆی ماوەتەوە. لەم شەڕوکێشانە دا کوردەکان بە شێوەیەکی گشتی لایەنی تورکیان گرت، جگە لە کوردستانی باشور، کە دەسەڵاتدارانی ئەو مەڵبەندە کوردە بەشێوەیەکی هەلپەرستانە هەندێك جار ملیان بۆ ئێران کەچ دەکرد و هەندێك جاریش بۆ عوسمانییەکان.

جەنگ و دوژمنایەتی بەردەوامی نێوان ئێران و عوسمانییەکان وبەشداری کاریگەری کوردان لەم جەنگانەدا وردە وردە سەرنجی ئەوانی بۆ گرنگی

سیاسی خۆیان ڕاکێش کرد و ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئەوان لەگەڵ دوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانیدا بە جۆرێك بوو کە پێئەچێ تابە ئەمڕۆش بە میرات مابێتەوەو کاری پێبکرێت. بەم شێوەیە کە هەرکات جەورو ستەمی هەریەك لەدوو دەوڵەتی ئێران یا عوسمانی بە مەبەستی باج سەندن لە ڕادەبەدەر نارەوا بوایە، ئەوان یاخی دەبوون و ئەگەر بەرێکەوت سەرکەوتنێکیان وەدەستبهێنایە تێدەکۆشان بە باشترین شێوە سوود لەم سەرکەوتنەیان وەرگرن و چەند مافێکی تری پێدەستەبەر بکەن.لەکاتی تێکشکانیشدا لە سنوورە نەپارێزراوو بێ چاودێرییەکانی یەکێك لەو دوو دەوڵەتە دەپەڕینەوەو لە نێو ئێلە کوردە کۆچەرەکانی دەوڵەتەکەی دیکە دا نیشتەجێ دەبوون، تا هەلێکی هەمواریان بۆ دەڕەخسا.

ڕاڤەو شیکاری ژیان و گوزەرانی ئەوکاتی کوردەکان لە کتێبی (شەرەفنامە)ی میر شەرەفخانی بەتلیسیدا باسکراوە کە لەساڵی 1596دا بە فارسی نوسراوە.

لەو ڕۆژگارەدا کوردستان بەسەر چەند میرنشینێکدا دابەش ببوو، دانیشتوانی ئەم میرنشینانە لە شارو گوندەکان و هۆزە کوردەکانی هاوسێی ئەوان پێکدەهات، لە هەندێك گوندیشدا خێزانە کورد و مەسیحییەکان لە پاڵ یەکدا دەژیان. سەرۆك هۆزەکان کە بە (دەرەبەگ)یا (خوانین) ناودەبران، خاوەنی گوند و ناوچە کشتوکاڵییەکان بوون. وەرزێرو ڕەنجبەرانی کوردیش لە خزمەت ئەواندا کاریان دەکرد و هەلومەرجی کشتوکاڵی و دەرەبەگایەتی وەك ڕۆژگاری بارۆن ومیرەکانی ئەورووپای چەرخەکانی ناوەڕاست وابوو، سەرۆکە گەورەکان، سەرۆکە بچووکترەکانیان لەژێر فەرماندا بوو، ئەو هەلومەرجەی ئەوان لە کۆنفیدراسیۆنێك دەچوو کە لەسەرۆك هۆزە بچوکترەکان پێکدەهات، وەك چەرخی ناوەڕاستی ئەورووپا وابوو. بەمجۆرە ئۆرگانی سیاسی ئەم تیرە و هۆزانە پتر کارکردی فیودالی بوو.

هەم لە تورکیا وهەم لە ئێرانیشدا سەرۆکی هەمیشەیی تیرە و هۆزەکان (سەرۆکایەتی بنەماڵە بە شێوەی میراتی) یەك بە دوای یەکدا لە ناوچوون و سەرۆکەکانی ئەوان لەلایەن دەوڵەتەوە دادەنرا. بە گوێرەی مێژووی شەرەفنامە بنەماڵەی میرەکانی کورد بریتی بوون لە:

1-میرەکانی جزیریٚ کە خۆیان بەنەوەی خەلیفەکانی ئەمەوی دەزانی (دیارە ئەم مەسەلەیە لەو ڕۆژگارەدا جۆرێك بوو لە خۆ هەڵکێشان کە ئەمیرەکان و خەڵکی دیکە خۆیان بە عەرەب بزانن و شانازی بەم مەسەلەیە وە بکەن و تەنانەت بۆ ئەم مەبەستەش شەجەرەی بنەماڵەیی ساختەیشیان بۆ خۆیان دروست دەکرد).

2-میرەکانی دەڤەری موش وئیسبرد کە لە ناوچەی (هینس)ەوە هاتبوون.

3-میرەکانی شیروان لە نزیکی بۆتان وسیرت. کە لە نەوەکانی بنەماڵەی ئەیوبی کورد بوون.

4-کوردەکانی روزاجی لە ناوچەکانی عەرەب تفلیس و ساسۆندا، لە میرەکانی گورجستان بوون. پاشان دووبرا کە خۆیان بە نەوەی بنەماڵەی ساسانی ناودەبرد لە ناوچەی ئەخلاتدا دەسەڵاتیان گرتە دەست. بە دلیس و ساسۆنیان داگیرکرد. لەکاتی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی سەلجوقی وئاق قۆینلو تا سەردەمی شا ئیسماعیل، هەژدە کەس لە میرەکانی ئەم بنەماڵەیە حوکمڕانییان کرد و کاتێك کە سوڵتان سلێمانی یەکەم دەیویست ئەم ناوچەیە بکات بە پاشکۆی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، هەژدەهەمین ئەمیری ئەوان شەمسەدین بەتلیسی پەنای بردە بەر ئێران (دووەم شازادەی پەنابەرە لای بنەماڵەی سەفەوی، لە پاش ئەمیر همایۆنشای هند)، شەرەفەدین خانی بەتلیسی کوڕی ئەوە، کە مێژوونوسی شەرەفنامەیە.

5-ئەمیرەکانی ساسۆن کە خۆیان بەنەوەی عێزەدین شێرکۆ دەزانی و فەرمانڕەواییان بەسەر هۆزەکانی شیراوی، بابوسی،ساسۆنی و تا موکیدا

دەکرد، سەرەنجام چوونە پاڵ میرەکانی (روزاگی)ەوە.

6-میرەکانی سویدی کە خۆیان بە نەوەی بەرمەکییەکان (وەزیرە ئێرانییەکانی هارونە رەشید) دەزانی.

7-ئەمیرانی پازوکی کە دابەش ببوون بە دوو تیرەی، خالید بەگلو و چاکربەگلو داو، خۆیان دابووە پاڵ میرەکانی بەدلیسەوە، و لە رۆژگاری سەڵتەنەتی شاتەهماسبی یەکەمدا سەر بەئێران بوون.

8-ئەمیرانی مەردانی کە خۆیان بە نەوەی خەلیفەکانی عەباسی دەزانی.

9-ئەمیرانی چمشگزك.

10-ئەمیرانی حەسەن کیفە خۆیان بە پاشماوەی بنەماڵەی ئەیوبی دەزانی، کاتێك ئاق قۆینلو ناوچەکەی داگیرکرد. ئەمیر حەسەنی کیفە کە ئەمیر مەلەك خالید ناوێك بوو بۆ ماوەیەك پەنای بردە بەر (حەما) و پاشان بڕیاری گەڕانەوەی دا و تا بە دەسەڵات گەیشتنی عوسمانییەکان ئەم ناوچەیەی بەدەستەوە بوو.

11-ئەمیرانی سلێمانییە کە خۆیان بە نەوەی بنەماڵەی ئەمەوی دەزانی. ناوچەی خوخ تا دەوروبەری دیجلەیان بە دەستەوە بوو.

12-ئەمیرانی ئەرزاقی کە لەسوریاوە هاتبوون و عەرەبی عەلەوی (مەزهەبێکی سەر بە عەلی ئیلاهی) بوون، پاشان بوونە تورکمان و چوونە نێو ئاق قۆینلووەکانەوە.

13-ئەمیرانی کیلیس کە لە دەستو پێوەندەکانی دەرباری ئەیوبی بوون و چوونە ناوچەی ئەنتاکیا و بەشێوەی دەوارنشینی ژیانیان دەگوزەران.

14-لەنێوان ناوچەی جزیرێ وکۆیەدا. لەیەکەمین میرەکانی هەکاری بە گوێرەی شەرەفنامە، ناوی ئەمیر عێزەدین شێر براوە کە لە بەرامبەر ئەمیر تەیموردا بەرگری لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی کرد.

15-ناوچەی مەحمودی لە باکوری هەکاری. لەم ناوچەیەدا لەسەرەتادا

ئێزیدییەکان و پاشان مەروانییەکان لە نێوان سالآنی (1378–1469)دا فەرمانڕەواییان کرد.

16–تایفەی دنبلی کە زێدی ئەسڵی ئەوان ناوچەی بۆتانە. پاشان لە ناوچەی زۆر ئاباد لە باکوری ڕۆژئاوای (خوی) دا نیشتەجێ بوون. ئەم خێڵە بەسەر بەشێك لە ناوچەی شەمزینانیشدا فەرمانڕەواییان کرد، پاشان ناوچەی (خوی) لەلایەن شاتەهماسبی سەفەوییەوە بەوان سپێردرا، لەسەردەمی شاسلێمانیشدا ناوچەی باجەری لە ڕۆژئاوای ورمێ خرایە سەر قەڵەمڕەوی ئەوان (ئێستا ئەم تایفەیە ناوی نەماوە).

17–سەرانی برادۆست. کە لە کوردانی گۆران و نەوەی حەسنەوی بوون (959–1015)، تیرەیەك لەم خێڵە لە سۆمای (ڕۆژئاوای ورمێ) دا و تیرەیەکی دیکەشیان لە تراگۆڕۆ دا قەڵادار و حوکمڕان بوون (ناودارترین میری ئەوان ئەمیر خانی یەك دەست (خانی لەپ زێڕین)ە کە جەنگی قەڵای دمدمی ئەو بەناوبانگ و دیرۆکییە).

18–ئەستینیەکان کە لە سەرەتا دا لە ناوچەی شەمزیناندا نیشتەجێبوون و پاشان لە ناوچەی مسکونی هەرکیدا جێگیربوون.

19–زرزا.

20–ترزا لە باشوری ناوچەی هەکاری.

21–لە ناوچەی ئامێدیدا لە پاڵ یەکێك لەقەڵا کۆنەکانی ئەتابەك عمادەدینی زەنگیدا کە دامەزرێنەری ئەتابەکانی موسڵ بوو (1127–1262)، شاری ئامێدی دروست کرا.

22–تاسینی یا(داسنی)، یەکێك لە هۆزە گەورەکانی ئێزیدی بوون لە دەورو بەری هەولێردا.

23–ناوچەی سۆران. یەکێك لە عەرەبەکانی بەغدا کە لەگەڵ دەستو پێوەندەکانی خۆیدا پەنای برد بووە بەر ئەم ناوچەیە، قەڵای (وان)ی لە

ڕۆژهەڵاتی ڕەواندوز دا دروست کرد.

24-میرەکانی بابان کە چەند تایفە وتیرەیەکیان دەگرتەوە، ئەوان لە سەرەتادا لە ناوچەی زێی بچوکدا بە دەوارنشینییەوە ڕۆژگاریان دەگوزەران، بەڵام لە ساڵی 1784دا شاری (سلێمانی)یان دروست کردو تیایدا نیشتەجێبوون.

25-ئەمیرانی موکری کە لە باشوری گۆمی ورمێ‌دا نیشتەجێبوون و لە ئەسڵدا بەشێك بوون لە تایفەی بابان.

26-ئەردەڵان. (کە بریتی بوو لە ناوچەکانی سنە، سەقز، هەورامان، ژاورود، تا سنووری شارەزوور، لە باشوری قەسری شیرینەوە، تا سنوری کرماشان، لە ڕۆژهەڵاتەوە کلیائی، ئەسنفدئاباد، چەرداور، گرویس) پاشان ئەم ناوچەیە بە ناوی کوردستانەوە ناوبراوە و لە قەڵەمڕەوی ئێراندایە وتێکڕای دانیشتوانی کوردن، گەلێك لەو هۆزە کوردانەی گرتۆتەوە کە لە مێژەوە لەم مەڵبەندەدا نیشتەجێبوون، لە حەوت سەد ساڵ لەمەوبەرەوە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە میرەکانی ئەردەڵان بە شێوەی میراتی و پشتاوپشت حوکمڕان بوون.

27-ئێڵی گەڵباخی کە لە ژێر فەرمانڕەوایی تورکانی (الناجیو) دابوون (بە پێی دیرۆکی کورد ئەم ئێلە لە ڕۆژگاری کۆندا گەلێك مەزن بوون و ماڵ وحاڵی ئەوان بە نزیکەی پەنجا هەزار ڕەشماڵ مەزەندە دەکراو لە نێوان ناوچەی باکوری سنە و دەوروبەری قەسری شیرین و شارەزووردا کوێستان و گەرمیانیان دەکرد).

28- کەڵهوڕ. (لەسەردەمی ڕەزاشاوە بە باوندپور ناوبراون) ئەم خێڵە بە گوێرەی شەرەفنامە، خۆیان بەوەچەی گودرزی کوڕی گیو قارەمانی ئەفسانەیی (شاهنامە) دەزانن (هەروەها بە پێی ئەو سەرچاوەیە سەر حەڵقەی ئاشقان فەرهادی قوڵنگ وەشێنی کێوهەڵکەن سەر بەم خێڵە بووە)، لە نێوان کرماشان و خانەقیندا بەدەوارنشینی ژیانیان دەگوزەران.

لە کتێبی شەرەفنامەدا زۆر باس لە کوردەکانی ئێران نەکراوە (لە بەشەکانی داهاتوودا باس لەوان دەکرێ).

بۆ ڕێگرتن و بەربەست دانان لەبەردەم هێرشی ئۆزبەك و هۆزە تورکەکانی ئەوبەری ڕوبارا، شا عەباسی یەکەم[44] چەند هۆزێکی کوردی ناوچەی ئەردەڵانی بەرەو خۆراسان ڕاگواست. ئەم هۆزانە لە ناوچە کوێستانیەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی خۆراسان و دەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا نیشتەجێ کران. ئەوان هەنوکە گشت پەیوەندییەکی خۆیان بە خاکی کوردستانی دایکیانەوە لە دەستداوە و بوون بە شیعە و گەلێك ووشەو زاراوەی تورکی و ئۆزبەکیش تێکەڵ بە زمانی ئەوان بووە.

بە درێژایی مێژوو کوردەکان هەمیشە خەڵکێکی بەدین و باوەڕدار و تاکخواز بوون و گەلێك حەزیان بە تێفکرین لە کاروباری ئایینی وتەسەوف و عیرفانی بووە. هەرچەند زۆربەی هەرە زۆریان سونی شافعی مەزهەب بوون وهەن، بەڵام دامەزرێنەری چەندین تەریقەتی سۆفیگەریشن کە دوا تەریقەتی مەزهەبی ئەوان بارزانییەکانە لە لایەن شێخ ئەحمەدی بارزانی برای مەلا مستەفاوە دامەزراوە. هەر بەمجۆرە بوو کە یەکێك لە کوردەکان بە ناوی مەلیك ئەحمەد پاشاوەکە لە لایەن سوڵتان موڕادی چوارەمەوە لە ساڵی 1638 دا کرا بووە فەرمانداری دیاربەکر، یەکێك لە شێخە کوردەکانی بە ناوی شێخ

---

[44] شاعەباسی یەکەم (1585–1626) یەکەم کاری شاعەباس لە کاتی هاتنە سەرکاریدا لەناوبردنی سەردارانی سەرکەشی ناوخۆ بوو، 15 هەزار کوردی ڕاگواست و لە کێوەکانی قەرەتەپەی خۆراساندا نیشتەجێی کردن، تا پارێزگاری لە سنورەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی ئێرانیان پێبکات، شاعەباس لە کۆتایی تەمەنیدا لە کوڕەکانی بەد گومان بوو، سەفیمیرزای کوڕەگەورەی کوشت، چاوی هەموو کوڕەکانی دیکەی کوێر کرد، لە پاش خۆی سام میرزای کوڕەزای بووە جێنشینی. (و)

محەمەدەوە ڕاسپارد تا بانگەشەی مەهدی بوون بکات و خەڵکێکی زۆریشی لە دەور کۆبۆوە. تا ئەم ئاشوبە لە لایەن والی موسڵەوە دامرکایەوە و مەهدی ساختەش دەستگیر کرا.

لە ساڵی 1719 دا ئەفغانییەکان هەمەدانیان گەمارۆدا، بەڵام یەکێك لە سەرۆکەکانی کورد کە (فندون) ناوێك بوو بە سوپایەکەوە، بەمەبەستی جەنگ لەگەڵ لەشکری محەمەد ئەفغاندا ڕووی کردە هەمەدان، بەڵام ناچار بە پاشەکشیکراو چووەپاڵ تورکەکان.

لەساڵی 1726دا، دووەم داگیرکەری ئەفغان (ئەشرەف) توانی لە ئازەربایجاندا تورکانی عوسمانی تێکبشکێنێ کە لەژێر فەرماندەیی دوو میری کوردی ئەیوبیدا بوون بە ناوی حەسەن پاشاو ئەحمەد پاشاوە. ئەم تێکشکانە لە ئاکامی خیانەتکاری میرێکی کوردا بوو کە لە لایەن ئەفغانەکانەوە دەمچەور کرابوو.

لەساڵی 1726دا لەشکری تورك دەستدرێژییەکی نوێیان کردە سەر سنوورەکانی ئێران. لەم کاتەدا ئەشرەف بە هۆی هەڕەشەکانی شاتەهماسبەوە کەوتبووە مەترسییەوە، بەناچار پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ عوسمانییەکاندا مۆرکرد.بەپێی ئەم پەیماننامەیە هەموو ناوچەکانی ئازەربایجان و کوردستان و هەمەدان بە هاوبەشی بەڕێوە دەبران.

سەرهەڵدانی نادر[45] و شەڕەکانی ئەو لەگەڵ ئەفغانییەکاندا کە بووە هۆی

---

45 _نادر شا (نادر قلی ئەفشار)، (1688–1747). سەر بە تیرەیەکی ئێلی ئەفشار بوو، فەرماندەی سوپای شاتەهماسب بوو پاشان شاتەهماسبی لە کارخست و شاعەباسی سێهەمی کوڕی تەهماسبی کردە پاشا، کە منداڵێکی شیرە خۆرەبوو، لە 1735 بە خۆی بووە شای ئێران و هەموو دوژمنای ناوخۆ و دەرەوەی تێکشکان، ماوەی حوکمڕانی نادر گۆشاوگۆشە لەشەڕو کوشتار و خوێنڕێژی تەنانەت چاوی کوڕە جێنشینەکەی خۆشی کوێر کرد، سەرەنجام بەدەستی فەرماندەسەربازییەکانی خۆی کوژرا. (و)

دەرپەڕاندنی ئەوان‌و مۆڵەت نەدان بە جێ‌پێ قایمکردنی عوسمانییەکان لە ئێراندا ، نادر بە خۆی بەغداشی داگیرکرد و گشت خاکە زەوتکراوەکانی لە چنگی ئەوان هێنایەدەر.

لەم نێوەدا هەندێك لە کوردەکان لایەنی ئێران و هێندێکیشیان لایەنی عوسمانییەکانیان دەگرت. تالە کۆتاییدا پەیمانی ئاشتی لە نێوان دوو دەوڵەتدا مۆرکراو سنووری نێوان دوو دەوڵەت بە پێی ڕێکەوتننامەی 1636 دیاری کرانەوە.

لە پاش مەرگی نادر شا و برازاکانی (کە بۆ ماوەیەك ببونە جێنشینی ئەو) تایفەی (زەند) کە بە کورد دا ئەنرێ نزیکەی 44 ساڵ بەسەر بەشێکی فراوانی ئێراندا حکومەتیان کرد.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەی زاییندا، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە هۆی جەنگەوە لەگەڵ ڕوسیادا، ڕووی لە بێهێزی کرد. ئێرانیش کە لە مێژ بوو بە هۆی مەرگی نادرشاوە تووشی پشێوی ولاوازی ببوو، ئاغا محەمەد خانی قاجار[46] بووە شای ئێران . لەم بارودۆخ وهەلومەرجەدا، زۆربەی میرەکانی کورد لە دەوڵەتی تورکیا ناڕازی بوون و پاڵیان دا بە ئێرانەوە.

ئاغا محەمەد خان لە ساڵی 1798دا لە کاتی گەمارۆ دانی قەڵای شوشدا بەدەستی نۆکەرەکانی خۆی کوژرا. باباخانی برازای، بەناوی فەتحعەلی شاوە سەڵتەنەتی گرتە دەست. هەر لەم ڕۆژگارەدا هەردوو دەوڵەتی ئێران و تورکیا

[46] -ئاغا محەمەد خانی قاجار: (1742-1797) دامەزرێنەری دەوڵەتی قاجارە، لە 1786 بووە شای ئێران، تارانی کردە پایتەختی دەوڵەتی قاجار، لەبەرئەوەی ئاغا محەمەد خان لە هەرەتی لاویدا بە هۆی شکستی ئێلەکەیەوە لەشەڕدا خەسێنرابوو، لەبەرئەوە برازاکەی بووە جێنشینی. (و)

لە لایەن روسیاوە کەوتنەبەر دەستدرێژی و پەلاماردان. تورکیا لە ساڵی 1805وە تا 1812، ئێران لە ساڵی 1804 وە تا 1813 وێڕای ئەوەش تەنانەت ئەم واقیعە تاڵەش نەیتوانی ئەم دوو دەوڵەتە لە پێناو ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دوژمنی هاوبەشیاندا یەکبخات. بە درێژایی ئەو ڕۆژگارە پشێوی و نا ئارامی بە شێوەیەکی بەردەوام لە ناوچە کورد نشینەکاندا درێژەی کێشا.

## 4- کورتە باسێکی مێژووی کورد لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە تا پەیمانی سیڤەر.

لە ساڵی 1809 دا ناوچەی شارەزوور و سلێمانی، لەژێر فەرمانڕەوایی یەکێك لە میرەکانی باباندا بوو بە ناوی عەبدولرەحمان پاشاوە. کە بەهۆی نەیارییەوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا پەنای بردە بەر فەتحعەلی شا، بەڵام لە ئەنجامی ڕاسپێری و بەکارهێنانی نفوزی فەتحعەلی شا لەدەرباری عوسمانیدا، دووبارە حکومەتی بابانی گرتەوە دەست. کوڕە گەورەکەی شا بە ناوی محەمەد عەلی میرزا دەولتشاوە بووە فەرماندەی ئێران لە ناوچەی کوردستاندا کە هەموو ناوچەی ئەردەڵان و کرماشان و سلێمانی دەگرتەوە. ئێران لەسەر ئەم ناوچەیە لەگەڵ دەرباری عوسمانیدا لە مشتومڕو ناکۆکیدا بوو (لە کۆتایدا ئەم ناوچەیە وێڕای داگیرکاری محەمەد عەلی میرزاش خرایە سەر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی).

بە هۆی هەڵسوکەوت و رەفتاری پاشای بەغداوە بەرامبەر بە عەبدولڕەحمان پاشا کە هێشتا پڕ لە کینەو دوژمنایەتی بوو، ناوبراو جارێکی تر پەنای بردەوە بەر دەرباری ئێران. لەم کاتەدا سلێمان پاشای زاوای پاشای بەغدا بە لەشکرێکی سی هەزار نەفەرییەوە بە مەبەستی سەرکوتکردنی عەبدولڕەحمان پاشا کەوتەڕێ. عەبدولرەحمان پاشا بە پشتیوانی ئەو سوپایەی کە لە ئێرانەوە بە هانایەوە هاتبوون، لەشکری

عوسمانی تێکشکان. هەروەها ئێرانییەکان، لەشکری عوسمانییان لە ناوچەی بایەزید دا (ناوچەیەکە کە لە نێوان ساکور و توپراق قەڵادا) تێکشکان و لە ئاکامی ئەم تێکشکانە دا تا دەوروبەری وان و بەتلیس و شارەبانی نزیکی بەغدا کەوتە بن دەستی ئێرانییەکانەوە.

لە ساڵی 1826دا، پەیمانی ئاشتی ئەرزرۆم لە نێوان دوو دەوڵەتدا مۆرکرا، ئەم پەیمانە سنوورەکانی گەڕانەوە بۆ دۆخی ساڵی 1639و، تەنیا ناوچەی زەهاب درا بە دەوڵەتی ئێران .

دوو دەوڵەت کە خاوەنداریێتی شاری سلێمانییان لە بارودۆخێکی نا دیاردا ڕاگرتبوو. پاشتر کوێستان و گەرمیان کردنی ئێلەکانی وەلد بەگی، قوبادی، باباجانی کە لە دۆخی کۆچەریدا ژیانیان بەسەر دەبرد، هێندەی نەمابوو دووبارە ئاگری شەڕ لە نێوان دوو دەوڵەتدا هەڵگیرسێنێتەوە. تا لە کۆتایدا بە ناوبژیوانی دوو دەوڵەتی روس‌و ئینگلیز پەیمانی دووەمی ئەرزرۆم لە ساڵی1842دا مۆرکرا و شاری سلێمانی بە یەکجارەکی خرایە سەر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی و ناوچەی زەهابیش لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا دابەشکرا.

ئەو سیاسەتە ڕیفۆرم خوازانەیەی کە لەلایەن سوڵتان مەحمودی دووەمەوە (ساڵەکانی 1808-1839 دەگرێتەوە) بە ئامانجی داسەپاندنی دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی و بێهێزکردنی دەسەڵاتی میرە ناوخۆییەکان وەگەڕخرابوو، بووە هۆی سەرهەڵدانی زنجیرەیەك ناڕەزایی لە نێو سەرانی هۆزە کوردەکاندا. پاش تێکشکانی هێزی عوسمانی لە ساڵی 1832 دا لە ناوچەی حەلەب وحمص دا، سەرکردە کوردەکانی وەك ئەمیر بەدرخان[47]، سەعید بەگ،

---

[47] –ئەمیر بەدر خان(1802-1868) لە جزیریێ پایتەختی میرنشینی بۆتان هاتۆتە دنیاوە، بنەماڵەی بەدرخان بە دەسەڵاترین بنەماڵەی دەرەبەگایەتی کورد بوون،

ئیسماعیل بەگ، محەمەد پاشای ڕەواندوز[48] یەك بە دوای یەکدا یاخی بوون و شۆڕشیان وەڕێخست. محەمەد پاشای ڕەواندوز دەست و برد ناوچەکانی هەولێر و کۆیەو رانیە و ئاکرێی داگیرکرد، بەڵام بەهۆی یەکنەبوون وپەرت و بڵاوی و ڕەوینەوەی هاوکاری کردن لە نێو میرو سەرانی کوردا، کە هەر یەکە و بۆ بەرژەوەندی خۆی دەجەنگا، هێشتا ویست وداخوازی سەربەخۆیی کوردستانی گەورە لەلای ئەوان سەریهەڵنەدا بوو. لە ساڵی 1835 دا محەمەدپاشای ڕەواندوز بە سەختی لەلایەن رەشید پاشاوە تێکشکا و بە یاوەری 50کەس لە سەرۆك هۆزە ناودرەکان کە لە شۆڕشدا بەشداربوون، وەك بارمتە گواسترانەوە بۆ ئەستەنبول. ئەمیر بەدرخان کە فەرمانڕەوای بۆتان بوو، کۆنفدراسیۆنێکی لە سەرۆك هۆزەکان پێکهێناو بۆ ماوەیەك بەسەر ناوچەکانی دیاربەکر، سیورك ، وێران شار، سیرت، سلێمانی و تەنانەت لە سابلاغ

---

بەدرخان بە دوای مردنی باوکیدا لە 1821دا بووە جێنشینی، لە 1840دا ناوچەی نێوان وان ودیار بەکروموسڵی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و ڕووبە ڕووی تورکە عوسمانییەکان بۆوە، بەڵام پاشان تێکچوونی پەیوەندی نێوان کورد و مەسیحییەکان و لابەردانی یەزدانشێری فەرماندەی بەشی ڕۆژهەڵاتی هێزەکانی کورد بۆ تورکەکان، تێکشکانی بەدرخانی بە دواوە بوو، بەدرخان دوور خرایەوە بۆ کریت و پاشان بۆ دیمشق، لە وێدا وەفاتی کرد. (و)

[48] –ممحەمەد پاشای ڕەواندوز: لە ساڵی 1813 دا بووە میری میرنشینی سۆران، سنوری ئەم میر نشینە لە جزیرەوە تا زێی بچووك بەرین دەبۆوە ، میر دیوارەکانی شاری رەواندوزی قایم کرد، کارخانەی دروستکردنی شمشێر و تفەنگ و گوللە و تۆپی دامەزران. گەرەکی بوو کوردستانی سەربەخۆ دابمەزرێنی، لە 1836 دا عوسمانییەکان میرنشینەکەیان داگیرکرد، لە کاتی گەڕانەوەیدا لە ئەستەمبوڵ لە 1837 دا لە ترابزۆن دا بە دەستی نۆکەرەکانی سوڵتان کوژرا، بە (پاشای کۆرە) بە ناوبانگە، کوشتارێکی زۆری لە ئێزیدییەکان کرد. (و)

(مەهاباد)یشدا حکومڕانیێتی کرد. بەڵام ئەمیر بەدرخانیش بە هۆی پەرتەوازەیی هێزو تواناکانی کورد و ڕەوینەوەی پشتیوانی پێویستی هۆزە کوردەکانەوە، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە تێکشکا. هەروەها (نوراللە بەگ)ی ئەمیری هەکاریش هەر بەو دەردە چوو، کە چەندین ساڵ ئاسورییەکانی ئەم ناوچەیەی قەتلوعام و تالان کردبوو. پاشان هەم (نوراللە بەگ) وهەم ئەمیر بەدرخانیش دوورخرانەوە.

بەڵام برازاکەی ئەمیر بەدرخان یاخیبوونێکی نوێی لە ناوچەی بۆتاندا وەڕێخست. کە لە ساڵی 1829دا، پاش زنجیرەیەك کاری سەربازی درێژخایەن ئەویش تێکشکا.

لە جەنگەی شەڕەکانی 1829–1853ی نێوان عوسمانییەکان و روسیادا، دەوڵەتی روسیا گەلێك هەوڵیدا کوردەکان بەلای خۆیدا ڕاکێشێت. بەڵێنی ئۆتۆنۆمی پێدان و هێزێکی لە کوردەکان پێکەوەنا کە ئەفسەرانی روسی مەشقی پێدەکردن.

لە ساڵی 1877دا لە کاتێکدا کە سوپای روس و عوسمانی لە دەوروبەری وان و ئەرزرۆمدا لەشەڕدا بوون، کوڕانی ئەمیر بەدرخان لە ناوچەی هەکاریدا شوڕشێکی نوێیان وەڕێخستو، تەنیا پاش کۆتاییهاتنی جەنگ بوو کە دەوڵەتی عوسمانی توانی ئەوان تێکبشکێنێت.

بەمجۆرە شەڕ تا ساڵی 1937 درێژەی کێشا. کوردەکانی تورکیا بە شێوەیەکی بەردەوام پاش هەر شۆڕش و شکستێك، یاخیبوونێکی دیکەیان هەڵدەگیرساندوو خوازیاری پاراستنی دەسەڵاتی خۆیان بوون لە ناوچەکانی خۆیاندا، ئەو ڕۆژگارە هێشتا بیری سەربەخۆیی هەموو کوردستان (کوردانی ئێران و عوسمانی) بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە نێوا ئەواندا سەری

هەڵنەدا بوو ، بەڵکو وادیارە بنەمای بیری سەربەخۆیی کوردستانی گەورە لەلایەن ڕوسەکانەوە، لە پاش جەنگی 1876ی دژ بە عوسمانیدا بە هێوری لە نێو میللەتی کوردا تەشەنەی کرد.

## راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا (1880)

لە ساڵی 1880دا بوو کە یەکێك لە شێخە کوردەکان بە ناوی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری‌یەوە کەوتە فکری هێنانەکایەی کوردستانی گەورەو وەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لە ژێر چاودێری سوڵتانی عوسمانیدا.
تورکەکان لە دەسپێکی کاردا، پشتیوانیان لێکرد و کەوتنە هاندانی شێخ عوبەیدوڵلا، بەو ئومێدەی لەم ڕێگایەوە بتوانن ئازەربایجانی ڕۆژ ئاوا و هەموو ناوچە کوردنشینەکانی ئێران بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. شێخ عوبەیدوڵلا کوڕی شێخ تەهایە و لە کوردەکانی ناوچەی ئورامارى کوردستانی تورکیایە، لە شێخە گەورەکانی بنەماڵەی تەسەوفی نەقشبەندی و خاوەن مورید و پەیڕەوانێکی فراوان بوو، پاش کۆکردنەوەی چەندین هەزار چەکدار لە جەنگاوەرانی هۆزەکانی کورد و موریدەکانی خۆی. چووە ناوچەی سابلاغەوە (مەهاباد). لەم کاتەدا گەلێك لە هۆزە کوردەکانی دیکەی وەك باشی، مەنگوڕ، زرار، گوریك لە کوردەکانی ئێران چوونە پاڵ ئەم هێزەوە، بەمجۆرە هێزەکەی شێخ ڕووەو میاندواو دەستیان کرد بە پێشڕەوی‌و، لەم ناوچەیەدا کەوتنە کوشتاری شیعەکان و شاری ورمێیان گەمارۆدا، لەم کاتەدا سێ بە تالیۆن لە سوپای ئێران لە ورمێدا بوو کە بە زەحمەت لە بەرامبەر هێزەکانی شێخدا بەرگرییان پێدەکرا. پاشان شێخ بە مەبەستی داگیرکردنی تەورێز ڕوو و مەراغە پێشڕەوی کرد. بەڵام لە وێدا، لەگەڵ هێزی 12 هەزار نەفەری سوپای ئێراندا ڕووبەڕووبۆوەو جەنگێکی سەخت لە نێوان هەردوو لادا بەرپا بوو.
هۆزەکانی کورد کە بە ئومێدی تالان و ڕاوڕووت چووبوونە پاڵ شێخ

عوبەیدوڵلاوە ئەویان بە جێهێشت و شێخ بە ناچاری ڕووەو سنورەكانی توركیا كشایەوە. بەهۆی ناڕەزایی توندی دەوڵەتی ئێرانەوە، (باب عالی) شێخ عوبەیدوڵلای دەستگیر كرد و گواستیەوە بۆ ئەستەنبوڵ. پاش ماوەیەك شێخ عوبەیدوڵلا لە ئەستەنبوڵ هەڵات، بەڵام دووبارە دەستگیر كرایەوە و دوورخرایەوە بۆ (مەكە) تا لە ساڵی 1882دا لە (مەكە)دا وەفاتی كرد.

## سوارەی حەمیدیە و جەنگی یەكەمی جیهانی (1914-1918)

لە ساڵی 1891دا سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (1876-1909) بڕیاریدا چەند یەكەیەكی سوارەی نیزامی چریكی لە ناوچەی كوردستاندا پێكبێنێت كە (تیپ ، فەوج، بەتالیۆن) بگرێتە خۆ و كەم تا زۆر لە شێوەی قەزاقەكانی روسیدا بێت، تا لەم ڕێگایەوە هۆزە نەسرەوت و سەربزێوەكان بخاتە ژێر جۆرێك لە نەزم و ڕێكخستنەوە، سەرباری ئەوەش تا جۆرە پەیوەندییەكی مەعنەوی لە نێوان خۆی و كوردەكاندا بەدیبێنێت. فەرماندەی فەوج و بەتالیۆنەكان لە نێو سەرۆك خێڵە بچوكترەكاندا هەڵبژێرا بوو، فەرماندەیی تیپەكان بەسەرۆك خێڵە گەورەكان سپێردرا بوو. ئەم ئەفسەرانە جل وبەرگی سەربازییان نە دەپۆشی مەگەر لە ڕۆژانی ڕێو ڕەسمی ڕێپێوانی سەربازی رەسمیدا، بەڵام بە پێی پلەی نیزامیان موچەیان پێدەدرا، بەمجۆرە ڕێ لە كاری دژ بە دەوڵەتی ئەوان دەگیرا.

فەوج و بە تالیۆنەكان خاوەن ئەركانی فەرماندەیی ئاسایی بوون كە بە فەرماندەی ڕاستەقینەی ئەوان وەحساب دەهاتن. بەمجۆرە سوڵتان عەبدولحەمید چەند سەركەوتنێكی دەستەبەركرد وتەنانەت لە كاتی شۆڕشی (توركە لاوەكان)دا، یەكێك لە سەرانی ئەم هۆزانە ئیبراهیم پاشاقلی (لە ناوچەی وێران شار)دا بە ناوی سوڵتانەوە دەستی گرت بەسەر شاری

(دیمەشق)دا . لە ساڵی 1908دا، لە پاش لە کارخستنی سوڵتان عەبدولحەمید وهاتنە سەرکاری ڕژێمی مەشروتەدا، دەوڵەتی نوێی تورکیا کەوتە هاندانی خێڵە عەرەبەکانی شام، کە هەمیشە لەگەڵ کوردا لە ناحەزی ودوژمنایەتیدا بوون، تا لە گەڵ ئیبراهیم پاشا دا بجەنگێن. ئیبراهیم پاشا لە ساتەوەختی کشانەوەدا کوژرا. سەبارەت بەم مەسەلەیە پێویستە ببێژین کە کوردەکان لەشەڕی کوێستانیدا بە شێوەیەکی گشتی گەریلای کارامە و لێهاتوون بەڵام لەشەڕی دەشتدا، مێرخاسی جەنگی خۆیان لەدەست ئەدەن.

ئەز بە خۆم (نوسەر) چەندین جار ئەم سەرگوزەشتەیەم دیتووە. پاش شۆڕشەکانی 1908 و 1909 ناوی سوپای حەمیدییە گۆڕا بە (عەشیرەت ئاڵای لەری) (جەنگە عەشایرییەکان). لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (1914-1918) دا، کوردەکان سەبارەت بە دەوڵەتی تورکیا دڵسۆزو ئەمەکدار بوون.

لە ئاکامی هاندانی دەوڵەتی روسیادا، ئەرمەنییەکان کە لە هاوسێی کورد و تورکە موسڵمانەکان وەڕس وناڕازی بوون، کەوتنە فکری خۆسازدان بۆ سەربەخۆبوون. هەرچەند ژمارەی ئەرمەنییەکان تەنها نزیکەی لەسەدا (سی) دانیشتوانی کوردستانیان پێکدەهێنا، بەڵام ئەم بەشە لە کوردستان، لە ڕۆژگاری کۆندا بەشێك بوو لە حکومەتی پاشانشینی ئەرمەنستانی گەورە.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هێزەکانی حەمیدیەی کورد بەهاندانی سوڵتان دەستیان کرد بە کوشتاری ئاسورییەکان، بەڵام لەبەر ئەوەی ئاسوری و ئەرمەنییەکانیش لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بە نهێنی لەلایەن روسیاوە چەکدار کرابوون، ئەم ڕووداوانە شەڕوپێکدادانی چەکدارانەی نێوان دوولایەنی لێکەوتەوە. هەڵکشانی ئەم شەڕوپێکهەڵپژانە تەنانەت ئەستەنبوڵیشی گرتەوە و کۆڵهەڵگری بەندەرەکان کە زۆر بەیان کورد بوون کەوتنە کوشتو بڕی مەسیحییەکان.

لە ساڵی 1914دا. لە کاتی هێرشی مەینەتباری دەوڵەتی روسیا دا بۆ سەر سنوورەکانی تورکیا، ستونەکانی لەشکری روسیا لەلایەن پێشەنگی

ئۆرگانیزمەنە کراوی ئەرمەنییەوە هەم لە ئەرمەنستانی روسیا وهەم لە ئەرمەنستانی تورکیاشدا پشتیوانیان لێدەکرا. ئەم ئەرمەنییانە لەلایەن کەسایەتییەکی خوێنرێژو ئاژاوەگێڕەوە بە ناوی (ئەندرانیک)ەوە رابەری دەکران. بەخۆم لە ساڵی 1920دا لە پاریسدا ناوبراوم دیت کە دوو کەسی سەرتاپاچەکدار پارێزگارییان لێدەکرد و بەمەبەستی بەشداری کردن لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریسدا وەك نوێنەری ئەرمەنستان هاتبووە ئەوێندەر. بەڵام لە پاش چەند مانگێك لەلایەن سوپای ڕێکخراوی دەوڵەتی نوێی ئەرمەنستانەوە کوژرا.

ئەم ئەرمەنییە بەکرێگیراوانە بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە لەو رەفتارەی کە کوردەکان پێشتر بەرامبەر بە ئەرمەنییەکان پێی هەڵسابوون، دەستیان کرد بە تاوان و ڕەشەکوژی، لە ماوەی نێوان ساڵانی 1915-1918 دا نزیکەی 60000 کوردیان کوشت. بەمجۆرە بە خێرایی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە دانیشتوانەکەی چۆڵ دەکرا. چونکە پێشتریش نزیکەی 70000 ئەرمەنی لەو ناوچانەدا کۆچوڕەویان پێکرا بوو یا قەتلوعام کرا بوون. لەم کاتەدا کوردەکان بەو پەڕی مێرخاسی و دلێرییەوە، لەو جیهادەی کە سوڵتان عەبدولحەمید رایگەیاندبوو، لە دژی روسەکان جەنگان، ژمارەی سوپای حەمیدیە خۆی ئەدا لە سێ فەوج، کە بەچەندین جۆرە تفەنگی وەك (ڤرندل، ماوزەر، پێنج تیری روسی) چەکدار بوون، بەڵام بێ ڕەشاش و تۆپی چیایی بوون و دیسپلینی ئەوانیش هێندە تۆکمە و ڕێك و پێك نەبوو.

سوپاکانی حەمیدیە و عەشیرەتی لەم هۆزانەی خوارەوە پێکدەهات:

فەوجی یەکەم: لە ناوچەکانی هانین دا: زریکانلی، جوبرائیلی، زریکی، حەیدەرانلو، یوسفیانلی، چەمدانلی، کاسکالی، شادیلی.

فەوجی دووەم: لە ناوچەی قەرەمکبدا: چەمدانلی، زیانلی، ئەسپیکی، ئەمدانلی، شامانلی، قەرەپاپان، مراجلی، جەلالی.

فەوجی سێهەم: خمنان، منی، نەتیف، حەیدەرانلو، مارهارنلی، کالکانلی.

چوارەمین دیونیریۆن: ملی، هەزیر ، دیروکی ،تائی کیکی، قەرە کچی .

هێزی سوارە نیزام : وان ، ماکوری، تاکوری، شەوکەتی، شرکان، سیدان، شمشکاکی، ملیون، شیولی، لیولی.

لەسەرەتای جەنگدا (1914)، هێزێك لە سوپای توركیا كەلەلایەن سوارە نیزامی ڕێك نەخراوی كوردەوە پشتیوانی لێدەكرا ، ناوچەی مەهابادیان لە نێو خاكی ئێراندا داگیركرد و خێڵە كوردەكانی دیكەی وەك مامش، مەرگەوەرو تەرگەوەرو ئەوانی دیكەش چوونە پاڵیان و هێزەكانی روسیایان لە میاندواو دا تێكشكان وپاشان روەو تەورێز حەرەكەتیان كرد كە بەشێكی لەلایەن روسەكانەوە بەرگری لێدەكرا.

شاری تەورێزیش كەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەوانەوە، ئەم كارە ترسی خستە نێو روسەكانەوە، كە پێشتریش لە ناوچەكانی ئەرزرۆم و دەوروبەریدا زەبری كوشندەیان لێوەشاندبوون. لەبەر ئەوە فەرماندەیی باڵای سوپای روسیا لە قەفقاسدا كەوتە هەڕەشە و سزادانی ئەفسەرانی خۆی و بەمجۆرە كەرەسەی پشتیوانی بە هێز كردنی تواناكانی فەراهەم كرد و لەئاكامدا سەربازانی لەشكری روسیا دەستیان كرد بە پێشڕەوی و لەشكری كورد و عوسمانیان لە تەورێزدا دەرپەڕاند و ئەوانیان ڕوەو سابلاغ ڕاونا.

لە كاتی جەنگی یەكەمی جیهانیدا زۆربەی كوردەكانی ئێران بە تایبەتی ئەوانەی كە لەژێر فەرماندەیی سەروان عومەر ناجی بەگ دا خزمەتیان دەكرد بوێرانە لە دژی هێرشهێنەرانی روسدا جەنگان.

لە ناوچەی كوردستانی باشور و دەوروبەری كرماشاندا هۆزە كوردەكانی كەلهوڕو گۆران و ئەوانی دیكەی كە شیعە مەزهەبن، وەك كوردە سونییەكانی باكور، شێلگیرانە بایەخێكی ئەوتۆیان بەشەڕكردن لەگەڵ روسەكان نەدا ، جگە لە سنجابییەكان كە بەشێكیان لە دژی روسەكاندا دەجەنگان. هەموو هۆزەكانی دی تاڕادەیەك لەلایەن ئەڵمانەكانەوە دەمچەور كرابوون و لایەنگری (نیزام ئەلسەلتەنە)ی حوكمڕانی كرماشان بوون.

لە كۆتایی جەنگدا زۆربەی سەرۆك هۆزەكانی كورد كە تێكشكانی توركە ئەربابەكانی خۆیان لەلایەن ئینگلیزەوە دیت. روەوباكور پاشەكشێیان كردو دەربارەی جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی لەگەڵ دەوڵەتی بەریتانیا دا كەوتنە دانوستان.

یەكێك لەو هۆ هەست پێكراوانەی كە كوردەكانی بۆ جەنگ هاندا، دەست بە سەراگرتنی بڕێكی زۆر لە تەقەمەنی و چەكی سوكی وەك (تفەنگ، دە تیر، رەشاشی سووك) بوو كە لە ئەنجامی كشانەوەی سەربازانی سوپای روسیا

لەتورکیادا کەوتە دەست ئەوانەوە ، بەتایبەتی سەربازانی سوپای ڕوسیا کە بە هۆی بەرپا بوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 وە پەلەیان بوو هەرچی زووتر خۆیان بگەیەننەوە وڵاتی خۆیان . بەتایبەتی سەربازانی کوردی حەمیدیە کە ڕێکخستنی پێشوویان تێکداو گەڕانەوە بۆ ژیانی چیانشینی خۆیان، لە کاتێکدا کە بەمجۆرە چەکانە بەباشی چەکدار ببوون و هۆیەکی دیکەش هەڵاتن و کۆڕەوی گەورەی ئاسوری وئەرمەنییەکان بوو بە هۆی جەنگ و قاتوقڕییەوە.

## هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکان و پەیمانی سیڤەر

پاش کۆتایی‌هاتنی جەنگ لەگەڵ تورکیادا، بیروڕای گشتی وڵاتانی ئەمریکاو ئەوروپایی بە شێوەیەکی بەرین سەبارەت بە چارەنوسی ئەرمەنییەکان هاودەردییان لەخۆ نیشاندا، لەوێدا کە لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە، ئەرمەنییەکان لە پێناو بە دەستهێنانی سەربەخۆیدا شێلگیرانە لە هەوڵ وتەقەلا دا بوون چەند پارتێکیان پێکهێنابوو. سەرانی دەوڵەتە گەورەکانی بەشدار لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس[49] وپەیمانی سیڤەردا[50] بڕیاریاندا دەوڵەتی سەربەخۆی ئەرمەنستان لە ناوچەکانی ئەرزرۆم، ترابزۆن

[49] کۆنگرەی ئاشتی پاریس (1919–1920) کۆنگرەیەکی نێو دەوڵەتی بوو کە لە پاش کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی لەلایەن وڵاتانی سەرکەوتووی جەنگەوە بانگەشە بۆ بەستنی کرا بەمەبەستی بڕیاردان لەسەر هەلومەرجی ئایندەی جیهان، گرنگترین بەشدارانی کۆنگرە ولسۆن و کلیمنسۆو لوید جۆرج و ئۆرلاندۆبوون، گرنگترین ئاکامەکانی دامەزرانی کۆمەڵەی گەلان و پەیمانی ڤێرسای و سان جرمان و سیڤەربوو. کۆنگرەی ئاشتی پاریس لە بنەڕەتدا بۆ دابەشکردنی ناوچەی نفوزی وڵاتانی سەرکەوتووی جەنگ، لە ئاسیا و ئەفریقادا، بەرپاکرابوو، لەڕێگەی دامەزرانی کۆمەڵەی گەلان و سیستەمی ئینتیدابیشەوە شەرعیەتیان دا بە کارەکانیان. (و)

[50] –پەیمانی سیڤەر: لە 1920/8/10 دا بەسترا. (و)

ئەرزرۆم، ترابزۆن و وان و بە تليسدا دابمەزرێنن. بەلأم سياسەتمەدارانى توركيا بەرهەلستى ئەم بڕيارەيان كردو ڕايانگەياند كە ئەرمەنييەكان لەم ناوچانەدا كەمايەتييەكى كەمى (47000) كەسى پێكدێنن، لە كاتێكدا ژمارەى موسلمانانى ئەم ناوچانە (كورد و تورك) نزيكەى سێ مليۆن كەس دەبن. بەمجۆرە بڕيارى پێكهێنانى دەولەتى ئەرمەنستان لەو هەلومەرجەدا بووە مايەى جۆشدانى ناڕەزايى كوردەكان و توركەكان. بە تايبەتى كوردەكان كە دێرينترين گەلى ئەو مەلبەندە بوون و بەر لە ئەرمەنييەكان لەو ناوچانەدا نيشتەجێ ببوون . وێڕاى ئەوەش كوردەكان بەباشى چەكدار بوون و ناوچە ستراتيجييەكانيشيان لەبن دەستدا بوو. بەسەرنجدان لەم كەندو كۆسپانە، هاوپەيمانانيش بايەخێكى ئەوتۆو شێلگيرانەيان سەبارەت بە پێكەوەنانى دەولەتى ئەرمەنستان لە خۆنيشان نەدا. تەنانەت ئەگەر ئەتا توركيش[51] بەدەسەلأت نەگەشتبايە، ديسان ئەگەرى پێكهێنانى ئەو دەولەتە گەلێك لاواز بوو.

## مادەى 62ى ( پەيمانى سيڤەر ) لە بارەى ئۆتۆنۆمى كوردەوە:

(كۆميسيۆنێك لە نوێنەرانى سێ دەولەتى بەريتانيا، فەرەنساو ئيتاليا پێكدەهێنرێت كە لە شارى ئەستانبولدا جێگير دەبێ و لە ماوەى شەش مانگ پاش بەرێوە چوونى ئەم پەيمانەدا ڕاپۆرتێك ئامادەكەن سەبارەت بە مافى ئۆتۆنۆمى ناوچەيى بۆ ئەو ناوچانەى كە زۆربەى دانيشتوانى كوردن و

---

[51] -ئەتا تورك (مستەفا كەمال): (1881-1938) دامەزرێنەرى كۆمارى توركياى نوێ وسەركردەى بەرگرى سەربازى وسياسى دژ بە پەيمانى سيڤەر بوو، لە 1923دا بووە يەكەم سەرۆك كۆمارى توركيا، گۆڕانكارى و نوێسازييەكانى ئەتا تورك كاريگەرييەكى گەورەيان لەسەر ئاستەكانى ژيانى سياسى و كۆمەلأيەتى و ڕۆشنبيرى بە عەلمانى كردنى توركيا هەبوو. (و)

دەكەوێتە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی فورات و باشوری سنوورەكانی ئەرمەنستان (كە مومكینە پاشتر دیاری بكرێت)، باكوری ئەم ناوچەیە سنوورەكانی توركیا و سوریا و میزۆپۆتامیا دەگرێتەوە. كە لە بەندی (27)ی مادەكانی دوو، سیْدا هاتووە، هەركات كۆمیسیۆن لە مەركێشەیەك لە كێشەكان بڕیاریان نەدا ئەوا كێشەكە بەرەو ڕووی ئەو دەوڵەتانە دەكرێتەوە كە بەرپرسن لە جێبەجێكردنی گەلاڵەی ئەم ئۆتۆنۆمییە، دەبێ مافی ئاسورییەكان و كلدانییەكان و باقی كەمایەتییە ڕەگەزی و ئاینییەكان دەستەبەربكات.

بۆ دابینكردنی ئەم مەبەستە لیژنەیەك لە نوێنەرانی بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا، ئێران و كوردەكان پێكدەهێنرێت و سەرلەم ناوچەیە دەدات، ئەگەر پێویست بوو دەتوانێ لە بارەی پێداهاتنەوەو گۆڕانكاری سنوورەكانی توركیا كە بە پێی ئەم پەیمانە لەگەڵ سنوورەكانی ئێراندا هاوبەشە، بڕیاربدات.

**مادەی 64:**

(لە ماوەی ساڵێك پاش جێبەجێكردنی ئەم پەیمانەدا، بێتوو كوردەكانی دانیشتووی ئەو ناوچانەی كە مادەی 62 دەیانگرێتەوە شایستەیی و ئامادەگی خۆیان بۆ ئەنجومەنی كۆمەڵەی نەتەوەكان بسەلمێنن كە وەك زۆربەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە خوازیاری سەربەخۆیی لە توركیا و ئارەزووی جیابوونەوەیان كردو،ئەگەر بەرپرسانی ئەنجومەنیش بۆی دەربكەوێ كە ئەم خەڵكە شیاوی سەربەخۆیی و بەڕێوەبردنی خۆیانن، توركیا لەسەریەتی كە لەو كاتدا ئۆتۆنۆمی قبوڵ بكات و دەست لەهەموو مافێكی خۆی هەڵگرێ.

پاشكۆی یەكالای ئەم ئەزموونە لەڕێكەوتننامەیەكی جودای دیكەدا لە نێوان هاوپەیمانان و دەوڵەتی توركیادا ئیمزا دەكرێ.

هەركات جیابوونەوەیەكی بەو جۆرە سەربگرێت، دەوڵەتانی هاوپەیمان هیچ چەشنە كەندو كۆسپێك ناخەنە بەردەم چوونە پاڵی ئەو بەشەی كوردستان كە لە نێو ویلایەتی موسڵدایە ، ئەگەر بخوازێ بە باقی كوردستانی ئازادەوە پەیوەست بێ).

وەك ئاشكرایە، بزووتنەوەی توركیا بەرابەری كەمال ئەتا تورك تەنانەت بواری ئەزموونكردنی ئەو پڕۆژەیەشی نەدا. هەم كوردستانی گەورە وهەم دەوڵەتی ئەرمەنستان وەك پڕۆژەیەك لە سەر كاغەزدا مانەوە. هەر چۆنێك بوو

بێت ئەرمەنییەکان لە سەرزەمین و زێدی خۆیان دەرپەڕێنرا بوون، لە کاتێکدا کە کوردەکان نزیك بە دوو ملیۆنیان (لە کوردستانی باکوردا) (تورکیا)دا لە بەشێك لە خاکی کوردستانی دایکی خۆیاندا مابوونەوەو نیشتەجێبوون. بەمجۆرە ئەو ژمارە کەمە کوردەی، کە لە ئەستانبوڵدا یالە وڵاتانی دەرەوە (ئەوروپا) دا نیشتەجێببوون و لە زانیاری و خوێندەواری نوێ بە ئاگابوون ، دەستیان کرد بە چالاکی لە پێناو سەربەخۆیی کورد دا و بە پشت بەستن بە پەیمانی سیڤەر و مادەی 12ی ولسن[52] خۆیان بە شیاوی ئەم سەربەخۆییە دەزانی.

## مادەی 12ی راگەیاندننامەی ولسن:

(دەبێت سەربەخۆیی ناوچەی تورکنشینی وڵاتی هەنوکەی عوسمانی دابین بکرێت، بەڵام پێویستە سەربەخۆیی ئەو میللەتانەش زامن بکرێت کە ئێستا لە ژێر سایەی حوکمڕانێتی دەوڵەتی عوسمانیدان، دەبێ ڕێ لە هەر جۆرەکەندو کۆسپێك بگیرێ لە بەردەم گەیشتنی ئەوان بەو سەربەخۆییەدا).

بەمەبەستی دەستەبەر کردنی هاودەردی هێزەگەورەکان (هاوپەیمانان) بە گشتیو ئەمریکاییەکان بە تایبەتی، چەند گروپێکی بچووك لە کوردە خوێندەوارو هوشیارەکان کە زۆربەیان کارمەندی پێشووی دەوڵەت بوون کەوتنە خۆو ڕایانگەیاند کە کوردەکان لەگەڵ پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی ئەرمەنیدا لە ناوچەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دا هاوکۆکن و بۆ دابین کردنی ئەم مەبەستەش ئامادەی هاوکاری کردنن، ئەگەر لە ڕابردووشدا کێشەو بەدحاڵیبوونێك لە نێوانیاندا هەبووبێت، بە هۆی هاندانی بەردەوامی دەوڵەتی عوسمانییەوە بووە، کە لە ڕێگای سیاسەتی چەپەڵانەو دێرینی خۆیەوە (پەرتکە و زاڵبە ) ڕێگر بووە لە بەردەم بەدیهێنانی زەمینەی هاریکاری ولێکحاڵی بوونی نێوان نەتەوە غەیرە تورکەکانی بن دەستی خۆی.

[52] -ولسن: (1856-1924)، سیوهەشتەمین سەرۆك کۆماری ئەمەریکا بوو(1913-1921).(و)

کۆمیتەیەك بە ناوی(خۆیبون)ەوە[53] لە پاریسدا دامەزرا، کە لە ژێر چاودێری دیبلۆماتی پێشووی دەوڵەتی تورکیا (شەریف پاشا)دا بەڕێوەدەبرا.

ئەز ئەوم لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەناسی، ئەوکاتە لە ڤیلاکەی خۆیدا بە ناوی (مۆنت کیف) ەوە لە هاوسێی ڤێلاکەی باوکمدا (کە ئێستا بە ڤێلای ئەسفەهان ناودەبریٚ) ژیانی بەسەر دەبرد، ئەوم بەباشی دەناسی، یەکێك بوو لە دۆستە دێرینەکانی باوکم، ئەوکاتەی شەریف پاشا وەك باڵوێزی عوسمانی لە (ستۆکهۆڵم) دا ژیانی دەگوزەران، باوکی منیش وەك نوێنەری ئێران لە دەرباری سویددا کاری دەکرد، ئەو بە یەکێك لە لایەنگرانی سەرسەختی ڕژێمی لە کارکەوتووی سوڵتان عەبدولحەمید دا دەنرا ، هەرچەند لەوە بەدوا خۆی لەگەڵ ڕژێمی نوێی مەشروتەدا سازان، بەلاّم سەبارەت بە مەسەلەی بڕیاردانی تورکیادا بۆ بەشداربوون لە جەنگی دژ بە هاوپەیمانانداا لەگەڵ ئەنجومەن و ئیتحادوتەرەقی (تەلعەت پاشا، شەوکەت و ئەنوەر پاشادا) بەرەنگار بۆوە و لەلایەن ژمارەیەك لەو تورکە شێلگیرانەی کە لە فەرەنسادا نیشتەجێبوون و هاوبیری ئەوبوون پشتیوانی لێدەکرا.

ئەو نمونەی خانەدان وئەشرافی عوسمانی کۆن و پیاوێکی لە ڕادەبەدەر خۆشگوزەران بوو، ئارەزووی چوونە کلوپەکان وبارەکانی شەونشینی و شەمپانیابوو. پێدەچوو گەلێك غەنی وزەنگین بیٚ لەبەر ئەوەی هەرچییەك حەزی لێبایە دەیکرد . ئێمە زۆرجار بۆ دیدەنی ومیوانی ئەو دەچووین، ئەز دواتر پێمزانی کە ئەو کوردەو بە کەسایەتییەکی چالاکی مەسەلەی سەربەخۆیی کورد ناودەبرێت.

لە ئاخرونۆخری جەنگدا، شەریف پاشا چووە پاریس‌و، بەهۆی کەسێتی ناسراوی خۆی و کارنامەو ئەو ئەزموونەی لە ڕۆژگاری خزمەتی دیبلۆماتیکی خۆیەوە بە دەستی هاوردبوو، بە هۆی ئاشنایی لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی

[53]--خۆیبون: لە 1927 دا لە شاری (بحەمدون)ی لوبناندا دامەزرا، گرنگترین رابەرانی کامەران، جەلادەت، سور بەدر خان،و ئیحسان نوری پاشابوون، خۆیبون واتە سەربەخۆیی، شام و بێروت و حەسەکە مەڵبەندی سەرەکی خەباتی خۆیبون بوو. (و)

بالاّی کۆمیسیۆنی ئاشتی و نوێنەرانی دەولّەتە گەورەکاندا کە بە مەبەستی بەشداری کردن لە کۆنگرەی ئاشتیدا هاتبونە پاریس ، ئەندامانی بەشداری کونگرەی ئاشتی بەڕێزو هاودەردییەوە گوێیان لە داخوازییەکانی ڕادەگرت کە سەبارەت بەسەربەخۆیی کورد بوون . دیارە ئەویش هێند ژیرو زرنگ بوو، بۆ ئەوەی دوژمنایەتی دەولّەتی ئێران نەوروژێنێ، پێی لەسەر سەربەخۆیی کوردەکانی ئێران دانەگرت، یا بۆ ئەوەی ئەمریکا و بەریتانیا لەسەر مەسەلەی ئەرمەنستان لەخۆی نەڕەنجێنێت، نە تەنها سەبارەت بەسەربەخۆیی ئەرمەنستان بەرهەلّستی نەکرد، بەلّکو رایگەیاند کە دەبێ کورد و ئەرمەنییەکان پێکەوە کۆنفدرا سیۆنێك پێکبێنن، تا بتوانن لە بەرامبەر ئەگەری دەستدرێژی ئایندەی تورکەکان یا روسەکاندا بەرگری لە خۆیان بکەن.

بەلاّم بە هۆی سەرکەوتنی تورکەکان بەسەر یۆناندا لە ساڵی 1922دا، و بە هۆی سەرهەلّدانی دەولّەتی نویێ تورکیاوە، وەك هێزو دەسەلاّتێکی نیزامی کە بوون و شەرعییەتی خۆی لە پەیمانی( لۆزان[1] ) ی 1923دا زامن کرد. ئاواتەکانی شەریف پاشا بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی کورد، بووە بلّقی سەرئاو.

---

[1] –پەیمانی لۆزان: لە 1923/6/24 دا لە ئاکامی جێبەجێ نەکردن و ڕەتکردنەوەی پەیمانی سیڤەر لە لایەن تورکیاوە، بەسترا، پەیمانی لۆزان سەوداکردنێك بوو لە نێوان دەولّەتی تورکیاو ولاّتانی ئەورپادا، بە پێی ئەم سەوداکردنە ولاّتانی ئەورپا دەستیان لە داخوازی جێبەجێکردنی پەیمانی سیڤەر هەلّگرت ومافی چارەی خۆ نووسییان لە کورد سەندەوە، دەولّەتی تورکیاش دەستی لە داواکردنەوەی ئەو زەوییانەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەلّگرت کە ولاّتانی ئەوروپا داگیری کردبوون، وەك دورگەی قوبرس لەلایەن بەریتانیاوەو دورگەکانی دەریای ئیجە لەلایەن یۆنانەوە. (و)

# بەشی دووەم
# كوردەكانی توركیا

هاوكاری سوڵتان محەمەدی شەشەم (وەحیدە دین) لەگەڵ هێزە داگیر كەرەكاندا بووە مایەی جۆشدانی ناڕەزایی زۆربەی خەڵكی توركیا، سوڵتان محەمەد لە پێناو پاراستنی دەسەڵات و تەختی پاشایەتی خۆیدا بەرژەوەندیەكانی میللەتی توركی پێشێل كرد و ئەوانی كرد بە گژ سوپای میللی دا كە ئەو كات بەرگرییان لە سەربەخۆیی و یەكپارچەیی خاكی توركیا دەكرد. سەرەنجام سوڵتان شەوێك بەر لەوەی سوپای میللی بگەنە نێو ئەستانبوڵ، كە پێشتر یۆنانییەكانیان لە توركیادا دەرپەڕاندبوو، نائومێدانە كۆشكی سەڵتەنەتی (دڵماباغچە)ی بەجێهێشت وپەنای بردە بەر نوێنەری جەنگی بەریتانیا، بەمجۆرە كۆتایی بە حوكمی 600ساڵەی سەڵتەنەتی (ئال عوسمان) هێنرا و كۆماری توركیا ڕاگەیەندرا.

ئەز لە گەشتێكی پەنجاڕۆژیدا كە سەرتاسەری توركیام بەسوارەیی تەیكرد و زۆربەی شەوانم لە كوختی گوندنشینانی كورد یا توركدا بەسەر دەبرد، كە لەگەڵ خانەخوێكانی خۆمدا ئەدوام، هەستی قوڵی ئەوان سەبارەت بە بنەماڵەی عوسمانی سەرنجی ڕادەكێشام. لەسەرەتای ئاخاوتنمدا لەگەڵ كوردەكاندا، پێم وابوو ئەم ڕووداوە كاریگەرییەكی ئەوتۆی لەسەرئەوان نەبووە ، بەڵام پاشان دركم بە وە كردكە بەهۆی پەیوەست بوونیان بەدینەوە گەلێك بەرامبەر بە سوڵتانەكانی عوسمانی بە ئەمەك و دڵسۆز بوون كە ئەوان خۆیان بە خەلیفەی ئیسلام[54] دەزانی. پێیان وا بوو كە كۆمار خوازەكان تەنها

---

[54] —پێویستە لەم بارەوە ئاماژە بەوە بكەین كە لە پاش داگیركردنی بەغدا لەلایەن هۆلاكۆ خانی مەغۆلەوە لە 1258دا و لە ناوبردنی خەلافەتی عەباسییەكانەوە. مامی دوا خەلیفەی عەباسی پەنا دەباتە بەر میسر، سوڵتانی ئەویٚ كە لە مەمالیكەكان بوو، پێشوازی لێكرد و دەسەڵاتی دینی وروحانی پێسپارد، فەرمانڕەوایانی میسر

بۆ ئەو مەبەستە ڕابوون تا خەلیفەكانی عوسمانی لە ناو بەرن. ئەوان دەیانویست بەلانی كەمەوە پایەو مەقامی خەلافەت پارێزراو و پایەداربێت.

## 1-شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران (1925)

لەسالی 1924دا، بارودۆخ بە هۆی دەرپەڕاندنی سولتان و كۆتایی هێنان بە ڕژێمی سەلتەنەتیدا، لە بەرژەوەندی كۆماری خوازەكاندا گۆڕا. لەم ساڵەدا خەلیفە سوڵتان عەبدولحەمید لەگەڵ گشت ئەندامانی خێزانی سەلتەنەتیدا بە فەرمانی ئەنجومەنی میللی ناچاركران كە لە ماوەی 24كاتژمێردا خاكی توركیا بەجێبێڵن.

پێشتر توركەكان لە سالی (1922)ەوە پەیان بە ئاكامی ئەم گۆڕانكاریانە بردبوو، كوردەكانیش وردە وردە وە ئاگاهاتنەوە كە حكومەتی نوێ سوورە لەسەر ئەوەی بۆ یەكجارەكی سیاسەت و ئایین لە یەكدی جودابكاتەوە. دیارە پێچانەوەی دامودەزگاكانی خەلافەت تەنها كوردەكانی دڵگران نەكرد، بەڵكو ژمارەیەكی زۆر لە خودی توركەكانیش لەم بەسەرهاتە بەتوندی ناڕازی و نیگەران بوون. لە كاتی ئەم ڕووداوانەدا گەلێك لەسەرۆك هۆزەكانی كورد لەلایەن بێگانەوە بۆ ڕابوون وخەبات لە دژی ڕژێمی نوێو گێڕانەوەی خەلافەت و شەریعەت هاندران.

لە شوباتی 1924دا (شێخ سەعید كوڕی شێخ عەلی ئەفەندی) دامەزرێنەری سەر حەلقەی تەریقەتی نەقشبەندی كە پەیڕەوانێكی زۆر و گیانبازانێكی بێ

---

گەرەكیان بوو لەم ڕێگەیەوە شەرعییەت بە كارەكانی خۆیان بدەن. ناوی خەلیفە و خەلافەت هێندە بەلای موسڵمانانەوە گرنگ بوو، سوڵتانەكانی عوسمانیش لەم مەسەلەیە بە ئاگابوون، لەبەر ئەوە ئەم چیرۆكەیان خستە سەر زاری خەڵكی كە دوا پاشماوەی بنەماڵەی عەباسی لە كاتی سەرەمەرگدا خەلافەتی بە سوڵتان سلێمان سپاردووە، بەمجۆرە ئەوانیش خۆیان بە خەلیفەی پێغەمبەر دەزانی. (و)

ئەژماری هەبوو. شۆڕشێکی ئیسلامی لە دژی تورکەکان وەگەڕخست، وجیهادی پیرۆزی لەدژی تورکە بێ ئیمان و خوانەناسەکان ڕاگەیاند، هەموو موسڵمانانی بانگهێشت کرد تا بە مەبەستی گەڕانەوەی سوڵتان و لە ناو بردنی کۆماری بێنەپاڵ ڕاپەڕینەکەیەوە.

شێخ سەعید خاوەنی دەسەڵاتێکی ئایینی گەورە بوو لەسەرتاسەری تورکیادا، بەتایبەتی لە ناوچەی وان و ڕۆژئاوای فوراتدا. تەنانەت لەودیو مەلاتییەشەوە خاوەنی مورید و پەیڕەوانێك بوو، وێڕای ئەوەش پێوەندی و وابەستەیی ئەو بەشێخ عەبدوڵلاحوسنی و خالید بەگی دێرسیمەوە هەیبەتێکی زیاتری پێدابوو، کە خانەقاکەی هەمیشە جمەی دەهات لەو سۆفیانەی لەسەرتاسەری ئەم ناوچانەوە ڕوویان تێدەکرد بۆ زیارەت و دیتنی.

سەرهەڵدانی ئەم ڕاپەڕینە کاربەدەستانی تورکی غافڵگیر کرد، هەرچەند ئەوان چاوەڕوانی هەڵگیرسانی ئەم یاخیبوونە بوون بەڵام پێیان وابوو ئەگەری سەرهەڵدانی لەمانگی مارسدا دەبێ ، دەسەڵاتدارانی تورك هۆکاری دەستپێکردنی ئەو ڕاپەڕینەیان دەگەڕانەوە بۆ دەستگیرکردنی دوو کەس لە پەیڕەوانی شێخ سەعید کە ڕەنگە دەستگیرکردنی ژمارەیەکی دیکەشی بەدوا دا بهاتایە.

ناوچەکانی چنگوش، ئەرگانی(ئەرغەیدە)، بالوپیران و ئەلازیك و هاریوت بەخێرایی کەوتنە بن دەستی یاخیبوانی کوردەوە. بەڵام دانیشتوانی ئەم ناوچانە کە لەسەرەتای ئەم کارەدا لەگەڵ یاخیبووەکاندا هاریکارو هاودەست بوون، بە زوویی لەگەڵ تالان وبڕۆی مالو موڵکی خۆیان لەلایەن ئەوانەوە ڕووبەڕوو بوونەوە، چەتەوڕێگرو ئەو کەسە هەلپەرستانەی کە بۆ ئەم مەبەستە خۆیان دابووە پاڵ یاخیبووانەوە دەستیان بۆ گیان و ماڵی خەڵکی درێژ کرد.

لە هەندێك شاردا خەڵکی کۆمەکیان بە هێزەکانی دەوڵەت کردو چوون بەگژ یاخیبووەکاندا. وێڕای ئەم بارودۆخەش دیسان شۆڕش هەر بەرینتر دەبۆوەو

هەموو ناوچەکانی دیاریەکر، لیسە، قوشی لەلایەن یاخیبووانی کوردەوە دەستیان بەسەر داگیرا، بەهۆی پەیوەندی کردنی پێکڕای هۆزەکانی کورد پێیانەوە، ژمارەی یاخیبووان گەشتە (7000)کەس و بەخێرایش ڕووی لە زیاد بوون دەنا . دەوڵەت، لەو ناوچە داگیرکراوانەدا، حکومەتی سەربازی ڕاگەیاند. زۆربەی کۆماریخوازە توندڕەوەکان خوازیاری دامەزراندنی حکومەتی سەربازی بوون لە ناوچەی تەرابزۆن و ئەستانبولیشدا، کە پێدەچوو بیروڕای گشتی ژمارەیەکی زۆر لە تورکەکانی ئەم ناوچانەش هاوکۆکی ئەویاخیبووانە بێت، لە پاش ئەوەی زانرا کە یاخیبوونی شێخ سەعید بە ماوەیەکی کەم بەدوای لێدوانی یەکێك لە نوێنەرە کۆنەپەرستەکان بە ناوی حاجی (زیائەدین ئەفەندی) ەوە لە ئەنجومەنی میللی ئەنقەرەدا، وەگەڕخراوە.

دەوڵەتی تورکیا بە مەبەستی ئامادەکردنی بیروڕای گشتی لە دژی یاخیبووەکان ڕایگەیاند کە دروشمە دینییەکان تەنها بەهانەو دەستکێش و ڕووپۆشی مەسەلەکەن، یاخیبوون چەندین هۆکار وئامانجی دیکەی لە پشتەوەیە، وەك سەربەخۆ خوازی کوردەکان وپارچە پارچە کردنی خاکی تورکیا. کە دەخوازن لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا یەکبگرن. دەسەڵاتدارانی تورك بەریتانیاشیان بەوە تاوانبار کرد کە دەستیان لە دنەدانی شۆڕشگێڕانی کوردا هەبووە بۆ ئاژاوە و یاخیگەری. لەبەر ئەوەی لەوڕۆژانە دا لە نێوان بەریتانیاو تورکیا دا لەسەر دەست بەسەراگرتنی ویلایەتی موسڵ گێرمەو کێشە لە ئارادابوو. لە کۆتاییدا بڕیاری چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بەکۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان سپێردرا و ویلایەتی موسڵ خرایە سەر قەڵەمڕەوی عێراق.

دەوڵەتی تورکیا ئەنجومەنێکی لە رابەرانی نەیاری شۆڕش پێکهێنا ، لەوانە کازم قەرە بەکر پاشا فەرماندەی گشتی لەشکری پێشووی ناوچەی ڕۆژهەڵات، ڕەئوف بەگ فەرماندەی پێشووی سوپای حەمیدییە کە بەشدار بوونی لە جەنگەکانی دژ بەیۆناندا لە ناوچەکانی بالکاندا ئەوی کرد بووە قارەمانێکی

نیشتمانی، بەمجۆرە دەوڵەت بەرەیەکی دژ بە یاخیبووانی دامەزران.

لەسەرەتای مارتدا، یاخیبووەکان دەستیان کرد بە پێشڕەوی کردن بەرەو باکورو هێزەکانی تورکیایان لەو ناوچانەدا پاشە کشێ پێکرد. کیجی وهەنگول کەوتنە بندەستی یاخیبووانی کورد و دەستیان کردبە پێشڕەوی ڕوەو بونیك ومەلازگەرد، لە کۆتاییدا دەستیان گرت بەسەر سیرواندا لە باکوری سیرت دا.

لە کۆتایی مارتدا تورکەکان هێزێکی گەورەی سی‌وپێنج هەزار کەسیان پێکهێنا و هێزی سەرەکی یاخیبووەکانیان گەمارۆدا و بەمجۆرە ڕێیان لە تەشەنەکردنی دەسەلاتی ئەوان گرت لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی گۆلی (وان)دا. لە باکوریشەوە پێشڕەوی ئەوانیان ڕوەو چالدێران و لە باشوریشەوە ڕوە و هەکاری ڕاگرت. بەمجۆرە ڕێی پاشەکشێی ئەوانیان ڕوەو سنورەکانی ئێران و عێراق داخست.

لەسەرەتای نیساندا هێزەکانی تورك دەستیان کرد بە هێرشی هەمەلایەنەی خۆیان و کوردەکانیان پاشەکشێ پێکرد و ئەوانیان لە ناوچەکانی ئارگانی، هانی، ئەلازیگ، دیاربەکر، پیران، لیسەو، بولانیکیان دا دەرپەڕاند. یاخیبووەکان هەوڵیان دا هێزی سەرەکی بەرگری کردن لە ناوچە شاخاوییەکانی پالووچیگوشدا دابمەزرێنن. بەلام لە ناوچەی چیگوشدا تێکشکان و لەم قۆناغەشدا شێخ سەعیدیش بە خۆی بەدیل گیرا.وەك باسدەکرا ئەم کارە لە ئاکامی خیانەتی هەندێك لە هاوڕێکانیدا بووە . (مێجەر قاسم) ناوێك لەوەبەدوا بۆ ئەم مەبەستە داوای پاداشتی لەدەوڵەت دەکرد.

وێڕای شێخ سەعید، ژمارەیەك سەرکردەی دیکەی گرنگی یاخیبووەکان بە دیل گیران وەك شێخ عەلی، شێخ عەبدوڵلا، دکتۆر فوئاد و 25کەسی دیکەش. سەرەنجام لە 28ی نیساندا دوا دەستەکانی یاخیبووەکان کە لە کوێستانەکاندا پەرەوازە بوون، تەفرو توناکران، یا خۆیان دا بەدەست هێزەکانی دەوڵەتەوە ،

چەندین هۆ سەرکەوتنی سوپای تورکیای بەسەر یاخیبووانی کوردا زامن کرد، وەك فرەیی ژمارەی هێزەکانی دەوڵەتو، کەرەسەی مۆدرێنی سەربازیو، تۆکمەیی دیسپلین و بە ئاگایی لە میتۆدە جەنگیەکان و لەهەمووی گرنگتریش پشت بەستن بوو بە هێزی هەوایی وفڕۆکەی جەنگی، کە هەموو هێرش و پێشڕەوی کردنێك دەپێشدا بە بۆردومانێکی توندی ناوچەی مەبەست دەست پێدەکرا.

شێخ سەعید و نۆ کەس لە هەڤاڵانی دادگایی و مەحکوم بە مەرگ کران و ئەوانی دیکەش حوکمی زیندان و دوورخرانەوەیان بەسەردا درا. گەلێك هۆ لە پشت هەڵگیرسانی شۆڕشەوە بوون کە وێڕای هەستی ئایینی، پێویستە کاریگەری هەلومەرجی سەخت و نالە باری ئابوری لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا لە بەرچاو بگیرێ، دیسان سەرۆکە ناوچەییەکانیش کە بە هۆی هاتنە سەرکاری حکومەتی نوێوە پێگەو دەسەڵاتی خۆیان لە مەترسیدا دەدی، هاندەرێکی گرنگ بوو بۆ بەشداری کردنیان لەو یاخیبوون و ڕابوونەدا.

وەك باس دەکرێت دەوڵەتی تورکیا بڕی دوو ملیۆن لیرەی بۆ دامرکاندنەوەی ئەم شۆڕشە خەرج کرد و پاش ئەم سەرکەوتنەش، دەستی کرد بە ڕاگواستنی خێڵە کوردەکان و نیشتەجێکردنیان لە ناوچە ناو خۆییەکانی دوور لە ناوچەکانی کوردستانی تورکیادا.

تێکشکانی ئەم شۆڕش و یاخیبوونە لەو مەڵبەندەدا کە کوردەکان زۆرینەیان پێکدەهێنا تیایدا و بە شێوەیەکی سەرەکی هۆکاری ئایینی هەبوو، هیواو ئاواتی پارێزگارانی تورکیشی کردە بڵقی سەر ئاو و هەلی بۆ دەوڵەتی ئەتا تورك ڕەخساند تا ڕیفۆرمی خۆی لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا دەستپێبکات.

یەکێك لە گرنگترین ئەو ڕیفۆرمانە گۆڕینی ڕێنوسە ، کە لە ساڵی 1924دا ئەنجامدرا، و ئەلف وبێی لاتینی لەبری ئەلف وبێی عەرەبی لە نوسیندا

بەکارهێنرا، (ئێستا ئەم ڕێنوسی لاتینی‌یە لە لایەن ناسیۆنالیستەکانی کوردەوە لە ئێران و عێراقدا سوودی لێوەردەگیرێ). هەر لە هەمان ساڵدا یەکێك لەسەرانی کوردی ناوچەی شەمدینان کە باوکی (سەناتور)و ئەندامی کابینەی پێشوو، و زاوای فەرید پاشا بوو، شۆڕشێکی دیکەی وەڕێخست، بەڵام لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە تێکشکێنراو پەنای بردە بەر عێراق.

ئەو ڕەفتارە دڕندانەیەی کە لە و دەمەوە تورکەکان لەمەڕ کوردەکان پەیڕەوییان کرد، زۆربەی هۆزەکانی کوردی، بە تایبەتی لە ناوچەی موسڵدا (کە لەلایەن دەوڵەتی تورکیا و بەریتانیاوە ململانێی لەسەر دەکرا) والێکرد کێشەکە بە کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان بسپێرن و بەپێی بڕیاری هەمان کۆمیسیۆن ناوچەی موسڵ خرایە سەر قەڵەمڕەوی خاکی عێراق.

## 2-یاخیبوون لە کوردستانی باکوردا (ئەحسان نوری پاشاو جەلالیەکان)

پاش تێکشکانی کوردەکان لە ساڵی 1925 دا بەسەرکردایەتی شێخ سەعید بزوتنەوەی کورد سیمای دینی خۆی لەدەست دا و پتر سیمای ناسیۆنالیستی پوختی بەخۆوەگرت. جوڵانەوەی کورد نە تەنها لە تورکیادا بەڵکو لە عێراق و ئێران‌وسوریاشدا بەهەمان شێوە گۆڕانکاری بەسەردا هات و ڕێبازێکی تری گرتە بەر. بەڵام ئەم شۆڕش و ڕاپەڕینانە هەموویان پێکەوە گرێ نەدرا بوون،بەڵکو لە هەر یەك لەم وڵاتانەدا سەرۆك خێڵ و هۆزەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان کاریان دەکرد، یا بە سەرزارەکی بەمجۆرە خۆیان پیشان ئەدا تا لەیەك کاتدا چەند دەوڵەت نەکەن بەدوژمنی خۆیان، ئومێدیشیان بەوە بوو کە لە کاتی تێکشکاندا بتوانن پەنا بۆ دەوڵەتی دراوسێ بەرن، یا بۆ ئەوەی بتوانن سوود لە یارمەتی کوردەکانی وڵاتانی عێراق یا ئێران وسوریا وەربگرن.

(سەلاحەدین)ی کوری شێخ سەعید کە پەنای بردبووە بەر عێراق بە یارمەتی کاربەدەستێکی ئینگلیز کە (هامیلتۆن) ناوێك بوو، چووە کۆلیجی ئەفسەری بەغداوە، لەم کاتەدا کە لەو شارەدا خەریکی خوێندن بوو لەگەڵ ئەنجومەنێکی ناسیۆنالیستی کورد دا بە ناوی (ئەنجومەنی هەڤاڵانی کورد)ەوە کە لەلایەن کوردە ئاوارەکانەوە دامەزرا بوو، پەیوەندی بەست، ئەم ئەنجومەنە چەند لقێکی لە حەلەب و دیمەشقیشدا هەبوو. سەلاحەدین دەستی لە خوێندنی کۆلیج هەڵگرت و هەموو خەم وخولیای خۆی لە کاروباری سیاسیدا بەخت کرد، تا بتوانێت تۆڵەی خوێنی باوکی لە دەوڵەتی تورکیا بستێنێ ، بەسوود وەرگرتن لەو (لێبوردنە گشتی)یەی کە لە تورکیادا ڕاگەیەندرا بوو گەڕایەوە ئەو وڵاتەو سەرەتا لە هانیس و پاشان لە ئەرزرۆمدا لەگەڵ زۆربەی کوردە ناسیۆنالیستەکاندا پەیوەندی بەست و (ئەنجومەنی کوردەکانی باکور)ی دامەزراند، پاش ماوەیەکی کەم دەستگیر کرا و برایە ئەنقەرە و لەم شارەدا دادگایی و زیندانی کرا. هاوکات لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا بە خێرایی زەمینە بۆ شۆڕشێکی نوێ سازدەکرا. لە 20ی حوزەیرانی 1930 دا کوردەکانی خێڵی جەلالی کە لە سنوورەکانی ئێران و تورکیادا بە دەوار نشینییەوە لە بنارەکانی ئاراراتدا ڕۆژگاریان بەسەردەبرد، لە پێدەشتەکانی ناوچەی زیلان دا پەلاماری هێزی تورکیایان دا، بەم کارە، کە لەلایەن ڕابەرانی ناسیۆنالیستی کوردەوە سەرپەرشتی دەکرا، ولەلایەن هۆزە کوردەکانی حەیدەر ئانلوو هالیکانلووە وەپیشتیوانی لێدەکراو، توانییان دەست بگرن بەسەر ناوچەکانی زیلانی مورادی و چاڵدێران دا و بە هێوریش زۆربەی خێڵەکانی ئەم ناوچانەش پەیوەندییان بەم یاخیبوونەوە دەکرد، ئەم کارە نزیکەی سێ مانگ درێژەی کێشا، تورکەکان لەسەرەتادا 12هەزار جەندرمەیان بەرابەری ژەنراڵ ساڵح پاشا لە نزیکی سنوورەکانی روسیا دا جێگیر کرد و پاشان ڕوەو ڕۆژهەڵات پێشڕەویان کرد. ژەنراڵ پاشا کە سۆسەی پێشڕەوی

كوردەكانی ڕوە و ناوچەكانی ئەرجیش وپانتۆس كردبوو، چونكە ئومێدیان بەوە بوو هۆزەكانی ئەوناوچانەش كە پێشتر بە هۆی شۆڕشەكانی ڕابردووەوە لەلایەن دەوڵەتی توركیاوە بەتوندی سەركوت و ئازاردرابوون بە نیازی تۆڵە سەندنەوە بێنە ڕیزی ئەوانەوە. لەم قۆناغەدا كوردەكان بە باشی چەكدار بوون و لەلایەن ژمارەیەك لە ئەفسەرانی پێشووی سوپای توركیاوە ڕابەری دەكران، كە گرنگترینیان حسێن كەوسەر، میرا، دمیر عەبدولقادر، ئەبدال وكاپتن ئەحسان نوری پاشابوون. كوردەكان لەدوو لاوە هەم لە ناوچەی جەلازگەردو هەم لە ناوچەی ئەوزولایەوە كەوتنە بەرهێرش و پەلاماردان. لە ناوچەی قەرەگوزیشەوە ئەركانی فەرماندەیی ژەنراڵساڵح پاشاش هێرشێكی دیكەی لە دژی ئەوان دەستپێكرد كە كشانەوەی كوردەكانی ڕوەو سنوورەكانی ئێرانی خستە مەترسییەوە. لە ناوچەی زیلان دا كوردەكان پاش لە دەستدانی هەزار كوژراو، بوون بە دوو بەشەوە، بەشێكیان ڕێگای ئێرانیان گرتە بەرو بەشێكیشیان خۆیان گەیاندە كەژو كێوەكانی ئارارات كە كوێستان و هەوارگەی هاوینەی ئەوان بوو. بەو ئومێدەی كە بەسوود وەرگرتن لە ناوچە شاخاوییە چەتوون ودەرە وپەناگە قایمەكان بتوانن بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ لە بەرامبەر سوپای توركیا دا خۆڕاگری و بەرگری بكەن. كە لە جەنگی یەكەمەوە تا ساڵی 1918 ئەم كوێستان و كەژو كێوانە پەناگەی هۆزی جەلالی بوو، تەنانەت پاش پێشڕەوی سوپای ڕوسیاش بۆ نێو خۆی توركیا هێشتا ئەم هۆزە تا كۆتایی جەنگ لەم ناوچەیەدا مانەوە . كوردەكان دەیانویست لەم ناوچەیەدا پێگەیەكی قایم و پتەودابمەزرێنن و پاشان سەربەخۆیی خۆیان ڕابگەیەنن، تا بەڵكو بەو جۆرە لەلایەن كۆمیسیۆنی كۆمەڵەی گەلان و زۆربەی دەوڵەتانی لایەنگریانەوە بە ڕەسمی بناسێندرێن و پشتگیرییان لێبكرێ .

لەم كاتەدا توركەكان سكاڵانامەیەكی توندیان دا بە دەوڵەتی ئێران تا ڕێ لە پەنابردنی كوردە یاخیبووەكان بۆ نێو خاكی ئێران بگرن، دەوڵەتی

ئێرانیش کە دەیویست پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا دا هەبێت، هێزێکی بەسەرۆکایەتی کۆلۆنێل حیکمەت عەلی خانی نەخجەوان بە مەبەستی شەڕ لەگەڵ جەلالییەکاندا ڕەوانە کرد ئەویش لە ناوچەی ئاراراتی بچوکدا هێزەکانی جەلالی خستەبەر هێرش و پەلاماردان، لەم کاتەدا دەوڵەتی تورکیا. ئیدعای خاوەندارێتی خاکی ئاراراتی بچووکی دەکرد کە لەبن دەسەڵاتی ئێراندا بوو. دیارە لەم بارودۆخەدا دەیتوانی هێڵی گەمارۆدانی چوار دەوری جەلالییەکان زامن بکات، لە ئاکامدا لە ساڵی 1932 دا ئەم ئیدعایەی تورکیا لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە سەلمێندرا و لەپای ئەوەشدا بەهەمان ئەندازە زەوی لە ناوچەی پاجیوك لە رۆژئاوای ورمێدا درا بە ئێران .

لەو مەڵبەندە داکە کوردەکان لە ناوچە ستراتیژییەکانی ئەم کوێستانەدا خۆیان حەشاردابوو. گەورەترین کەندو کۆسپیان بۆ پێشڕەوی کردنی تورکەکان دروست دەکرد . هەر جۆرە پێشڕەوییەکی پیادە نیزام تەنانەت بە پشتیوانی فڕۆکەش مەترسیداربوو. لەم کاتەدا تورکەکان باڵا دەستییەکی بەرچاویان بەسەر کوردەکاندا هەبوو، ئەویش بریتی بوو لە هێزێکی هەوایی بەهێز، کە سەر باری دلێری و کارامەیی چەکدارانی کورد. زیانێکی قورسیان بە مەڕو ماڵات و بە ژن و منداڵانی کورد گەیاند لە پێدەشتەکاندا. لەم ناوچە زۆزان و کوێستانییەشدا بنارەکانی ئارارات سەرتاسەر ڕووتەڵەن، بەڵام بە هۆی هەبوونی ژمارەیەك ئەشکەوتەوە، چەکدارنی کورد دەیانتوانی لە کاتی بۆردوومانداخۆیان لەو ئەشکەوتانەدا حەشاربدەن. هەر لەم کاتەدا ئەرکانی فەرماندەیی کوردەکان ئەم پەیامەی خوارەوە ی لە سەرتاسەری کوردستانی تورکیا و عێراقدا بە شێوەیەکی نهێنی بلاوکردەوە، و نوسخەی ئەو پەیامە ی بۆ لقەکانی بێروت وپاریسی کومەڵەی گەلان نارد:

(برایانی کورد، ئێوەی بە توانا شیاوی ئەوەن کە ببنە میللەتێکی گەورە و ئازاد، چۆن میللەتی نەجیبی کورد رێگە ئەدات وەك کۆیلە لە ژێر دەستی

تورکەکاندا ژیان بەسەربەرێت، وادە و بەڵێنی مەڵبەندێکی فراوان لە نێوان عێراق و ئێراندا بە ئێمە دراوە، یەکبگرن و تێبکۆشن تا براکانمان لەژێر دەستی تورکاندا ڕزگار بکەین، با ئەم مەڵبەندو خاکە ڕزگار بکەین کە بە درێژایی مێژوو نیشتمانی ئێمە بووە).

لە 21ی تەموزدا، هێزەکانی تورك ناوچەی باشورو ڕۆژهەڵاتی چیاکانی ئاراراتیان لە کوردەکان پاك کردەوە و لەبەرەی ئۆجیرەوە دەستیان کرد بە پێشڕەوی کردن بەرەو باکور. لەم کاتەدا ئەو سەرۆکە کوردانەی کە لەسوریادا (وڵاتی ئینتیدابی فەڕنسا)بوون بە پشتیوانی جەلادەت و سورەیا بەدرخان (نەوەکانی ئەمیر بەدرخان کە لە ساڵانی 1833–1840 دا لە دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەڕیبوو) دەستیان کرد بە پڕوپاگەندە کردن لە دژی ئۆپراسیۆنی دەوڵەتی تورکیا.

قادرخان و یەکێك لە سەرانی کورد کە حەقۆ ناوێك بوو، هێزێکی چەکداری دووسەد کەسییان ئامادە کردو پەلاماری بنکە سنوورییەکانی تورکیایان دا. لە 5ی ئابدا دەستیان گرت بەسەر گوندی (هابات)دا وبلاڤۆکێکیان بۆ بانگەواز کردن لە میللەتی کورد بە مەبەستی ڕابوون لە دژی تورکەکان بڵاوکردەوە، تا بەمجۆرە زۆربەی هۆزە کوردەکان بێنە ڕیزی تێکۆشەرانی کوردە وە لە چیاکانی ئاراراتدا.

بەڵام ئەم هێزانە لەلایەن جەندرمەکانی تورکیاوە بەرپەرچدرانەوە و ناچار بە پاشەکشێ کران.

دەوڵەتی فەرەنسا بە شێوەیەکی نارەسمی سەبارەت بە کوردەکان هەستی هاودەردی دەردەبڕی، تەنانەت ڕێگای بە نوێنەرانی کورد دا کە لەسوریادا کۆنگرەیەك پێکبهێنن و چەند ئەفسەرێکیشیان بۆ مەشق پێکردنی سەربازی کوردەکان ناردە نێو ئەوانەوە. بەڵام تورکیا یاداشتێکی ناڕەزایی توندی دا بە نوێنەری فەڕەنسا ولەوەش بەدوا هەڵوێست و ڕەفتاری فەرەنسا گۆڕانکاری

بەسەرداهات، تەنانەت چەند کەسایەتییەکی لە نوێنەرانی کورد لە سوریا دا دوور خستەوە.

بزاڤی کوردەکانی سوریا بە مەبەستی یارمەتیدان بەو کوردانەی کە لە مەودای نزیک بە چوار سەد کیلۆ مەتر دوورتر لەوانەوە تێدەکۆشان نیشاندەری ئەوە بوو کە جوولانەوەی کورد ڕووی لە خەملاندن دەکرد، ئیدی لە پێناو مەبەستی تاکە کەسی فلانە شەخس یا وابەستە بە فلانە سەرۆك خێڵەوە نییە. ئەوان لە پێناو (بیرۆکەی ناسیۆنالیزمی کورد) دا تێدەکۆشان کە ئامانجیان سەربەخۆیی یا جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی فراوان بوو. بانگەشەی سەربەخۆیی کە لە ژێر دروشمی ئۆتۆنۆمیدا دەخرایە ڕوو بە هۆی دابەشبوونی کوردەکانەوە لە نێوان دەوڵەتەکانی ئێران-تورکیا-عێراق - سوریا دا مەحاڵ بوو. بەهەمان شێوە، کوردەکانی عێراقیش پشتیوانیان لە ڕاپەڕینی کوردەکانی تورکیا کردو شێخ ئەحمەدی بارزانی 500 چەکداری سوارەی بارزانی بە هانای کوڕی حسێن کوردەوە نارد. ئەم چەکدارانە لە ناوچەی ئورامار دا پەلاماری هێزەکانی تورکیایان دا، بەلام ناچار بە پاشەکشێ کران و لەم پێکدادانەشدا کوڕی حسێن کورد گیانی لەدەست دا.

پێدەچوو لە تورکیادا،کوردەکان لە پاش ئەم شکست وسەرکوت و تەمێکردنە توندانە ئیدی ئارام بن وسەری تەسلیم لە بەرامبەر بڕیارەکانی دەوڵەتدا کەچ بکەن. بەلام ئەم نەژادە سەربزێو و سەرکەشە، ئامادەنەبوون دەست لە ئازادییەکانی ڕۆژگاری دێرینیان هەڵگرن و سەربەخۆیی خۆیان لە کۆت و بەندی یاساکان و بڕیارە ئیدارییەکانی دەوڵەتدا زیندانی بکەن. ئەو ڕۆژگارە گەشانەی ڕابردوو بوو کە شۆڕشی ئەوانی جۆش ئەدا بۆ سەربەخۆیی و ڕزگار بوون لە کۆتی دەوڵەتەکانی دراوسێ.

## 3-سەید ڕەزای دێرسیم

لە حوزەیرانی 1937دا، کاتێك دەوڵەتی تورکیا خەریکی دامەزراندنی بنکەی جەندرمەو قوتابخانە و نوێکردنەوەی ڕێگاوبانی ناوچە کوردنشینەکان بوو، کوردەکانی ناوچەی دێرسیم کەوتنە خۆیان و لە پاش کۆبوونەوەی سەرۆك خێڵەکان لە کورپیك (سێ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی مارکیرت)دا، یەکێك لە سەرۆك خێڵە خۆجێییەکان بە ناوی سەید ڕەزاوە کە لە هۆزی (عەباس ئۆشاقی)بوو، بەزوویی چەند هەزار جەنگاوەرێکی لە عەشیرەتەکان کە زۆر بەیان لە خێڵی یوسف خان و دمنان بوون، ئامادەکرد، (بەگوێرەی لێدوانی عیسمەت ئینینۆی[55] سەرۆك وەزیر، لە ئەنجومەنی گەورەی میللیدا ژمارەیەك چەکدار کە نزیکەی هەزار یا هەزار و پێنج سەد کەس دەبن پەلاماری بنکەکانی جەندرمەیان داوەو جەندرمەکانیان لەوێندەر دا دیل کردووە یا دەرپەڕاندووە)، سەرەنجام شاری دێرسیم کەوتە دەست کوردەکانەوە.

دەوڵەتی تورکیا هێزێکی سوپایی گەورەی لە ناوچەکانی ئەرزینکان ، ئەرزرۆم، مەلاتییەو دیار بەکردا جێگیر کردو توانی یاخیبووانی کورد لە چوارچێوەی ڕووبەرێکی 200کیلۆمەتریدا گەمارۆ بدات، لەم کاتەدا کوردەکان هێرشیان کردە سەرناوچەی نازمیە، بەڵام هێرشەکەیان تێکشکێنرا و پاشە کشێیان پێکرا. فەرماندەی لەشکر کێشییەکە عیسمەت پاشابوو کە لە بەرگرنگی ناوچەکە، بە خۆی هاتبووە ئەو مەڵبەندە و هێندەشی نەبرد لەبری (جەلال بیار) بووە سەرۆك وەزیر. هەر لەم کاتەدا ژمارەیەك لە کوردەکانی

---

[55] -عیسمەت ئینینۆ: (1884-1972) دۆستی دێرینی ئەتاتورك ، لە ساڵانی 1920-1922 سەرۆك ئەرکانی سوپای تورکیا بوو، لە نێوان ساڵانی 1925-1937 سەرۆك وەزیر بوو، لەپاش مەرگی ئەتا تورك لە 1938 دا بووە سەرۆك کۆماری تورکیا. کاتێك لە 1950دا حیزبی دیموکراتی نەیاری ئینینۆ لە هەڵبژاردندا بردییەوە، دەستی لە کارکێشایەوە. (و)

سوریا کە بەمەبەستی پەرەدان بە شۆرش چووبوونە نێو تورکیاوە، بە هۆی کەمی ژمارەوە ناچار بە پاشەکشێ کران و ژمارەیەکیشیان لێکوژرا کە دووکەسیان سەید عەبدولڕەحیمی برای سەید رەزا و کۆرجەمیل شەیدا بوون.

لە 11ی ئوتدا، رۆژنامەی (رابط العربي)ی عێراقی بەیاننامەی دوو کەسایەتی لە ڕابەرانی سیاسی کوردی (ئیمام قاسم و ئیسماعیل حەقی) بلاوکردەوە، لەم بەیاننامەیەدا داوا لە دەوڵەتی عێراق و نوێنەرانی ولاتانی بیانی نیشتەجێی بەغدا کرابوو کە لەبەرامبەر ڕەفتاری نا مرۆڤانەی تورکدا سەبارەت بە میللەتی کورد ناڕەزایی دەربېڕن کە سوود لە هەموو ئامڕازە نایاساییە جەنگییەکانی وەك گازە ژەهراوییەکان وەردەگرێ بۆ لە ناوبردنی میللەتی کورد. هەروەها داوای پێکهێنانی کۆمیسیۆ نێکیان دەکرد تالە هەلومەرجی شاری دێرسیم بکۆڵێتەوە.

کوردەکان بە هۆی هاتنی وەرزی زستانەوە بە ناچار لە ناوچەی کۆێستانی مرگان داغ و مەنزور دا جێگیر ببوون، بەو ئومێدەی لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهاردا، بە کۆمەکی زۆربەی هۆزەکان دەست بەکاری جەنگی بکەنەوە. بەلام بەهۆی هێرش وپەلاماردانی توندی هێزەکانی تورکەوە ڕۆژبە ڕۆژ بازنەی گەمارۆکە تەنگتر دەبۆ وە لە سەریان، تا لە کۆتاییدا سەیدڕەزا و دوو کوڕەکەی بەدیل گیران و بەیاوەری لەگەڵ چەندین کەسی دیکەدا لە سەرۆك هۆزەکان، دادگایی و مەحکوم بەمەرگ کران، هەموو ئەو کەسانەش کە لەم یاخیبوونە دا بەشدار ببون مەحکوم بە دوور خستنەوە یا زیندانی کران و زۆربەی ئەوئێل و هۆزانەش کە لەم یاخیبوونە دا بەشدارییان کردبوو بە زۆرەملێ ڕاگوێزران و دوورخرانەوە.

لە 19ی نۆڤەمبەری 1937 دا پرسەی ماتەم وشینی شەهیدانی ڕێگای سەربەخۆی کورد لە کۆڕی کوردەکانی دیمەشقدا پێکهێنرا.

## 4-سیاسەتی دەوڵەتی تورکیا بەرامبەر بە کورد

سزای دوور خستنەوەو هەموو ئەو بەربەست و سەرکوت کردنە سەختانەی دەوڵەتی تورکیا بەرامبەر بە کوردەکان بەکاریهێنا، چ لە سەردەمی ئەتا تورکداو چ لە پاش مەرگی ئەویش، ئەگەری هەڵگیرسانی شۆڕشی کوردی لە خاکی تورکیادا بە سەختی لاواز کرد، وێڕای ئەوەش ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی کە لە نێوان دەوڵەتەکانی ئێران -تورکیا-عێراقدا پێکهات، ئەگەری هەرجۆرە یارمەتییەکی بە کوردی وڵاتەکەی دیکە لە کاتی سەرهەڵدانی شۆڕش و یاخیبووندا کەمکردەوە. لەدەیەی سێهەم و چوارەمی سەدەی بیستدا سێ هێڵی سەرەکی ڕێگای ئاسن لەسەرتاسەری خاکی تورکیادا ڕاکێشرا، کە ئەنادۆڵی ڕۆژئاوای بە شارەکانی ڕۆژهەڵاتەوە دەبەستەوە. لەو ڕێگایانە، لە (سیواس)ەوە بۆ ئەرزنیکان وئەرزرۆم، لەمەلاتییەوە بۆ ئەلازیك و موش (کە پرۆژەی بەستنەوەی ئەو ڕێگایە بە هێڵی ئاسنی ئێرانەوە لە ناوچەی قتور دا لەدەست پێکردندایە)، لە دیاربەکرەوە بۆ کورت لان کە دەگاتە (جزیرەی ابن عومەر) و سنوری عێراق. ئەم ڕێگایانە لە بنچینەدا ستراتیجی بوون و بە مەبەستی ئامادەباشی لە کاتی سەرهەڵدانی هەرجۆرە مەترسییەکی جەنگدا لە سنوورەکانی تورکیا-روسیادا و هەروەها بە مەبەستی گەیاندنی خێرای سەربازو کەرەسەی جەنگی بوو بۆ ناوچە کوردنشینەکان لە کاتی هەڵگیرسانی شۆڕش و یاخیبووندا. لە ڕەهەندی ئابوریشەوە دەوڵەتی تورکیا ناوچە کوردنشینەکانی ڕۆژهەڵاتی کردەوە بە بازاڕی ساغکردنەوەی کاڵا دەرەکی و ناوخۆییەکانی خۆی. هەروەها بە ئەنجام گەیاندنی پرۆژەی دانانی تۆڕێکی ڕێگاوبانی قیرتاوکراو لەم ناوچەیەدا، بە تایبەتی لە نێوان سالانی 1950-1961دا کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لە بەدیهێنانی ئاشتیدا لەم ناوچەیەدا، سەرباری ئەوەش هێشتا ناوچەی ڕۆژهەڵاتی تورکیا بەشێوەیەکی پوخت بە کوردنشینی ماوەتەوەو سیمای

کوردەواری خۆی پاراستووە. ئەو تورکانەی کە لەناوچەی بالکانەوە بۆ ناوخۆی تورکیا ڕاگوێزران، زۆربەیان لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆلدا نیشتەجێبوون کە کەشو هەوای ئەم ناوچانە لەگەڵ ژیانی ئەواندا دەگونجا. ئەو ژمارە کەمە تورکەش لە ناوچە کوردنشینەکاندا نیشتەجێ بوون، درەنگ یازوو لە ژیان هەڵکردن لەو ناوچەیەدا بێزار وشەکەت بوون یا بەهۆی ترس و هەڕەشەی کوردەکانەوە بۆ ناوچەکانی ئەزمیر، ئەستانبوڵ و ئەدەنە ڕەویان کرد.

وێڕای دانانی ڕێگای ئاسن و شەقامو ڕێگاو بانەکان، بەڵام گرژی و ئاڵۆزی بارودۆخی ناوخۆ و قەیرانی ئابوری وسیاسی تورکیا ڕێگر بووە لە بەردەم جێبەجێکردنی پرۆژەکانی نوێسازیو بەرنامەکانی بە پیشەسازی کردن و دامەزراندنی کارگەکاندا لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیادا. ئەم پرۆژانە لە ناوچە تورکنشینەکانی ڕۆژئاوا دا پراکتیزە کراوە و لەم بارەوە تورکیا پێشکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە.

سیاسەتی دەوڵەتی تورکیا لەمەڕ کوردەکان بە شێوەیەکی سەرەکی بریتی بووە لە تێکدانی بنەمای سیستەمی عەشایری کە بە درێژایی چەندین سەدە، میرایەتی تیرە و هۆزەکان وەك نەریت لە بابەوە بە میراتی بۆ کوڕی وان دەمایەوە وخاوەن هەیبەت و شکۆیەکی گرنگ بوون و بە قورساییەکی کاریگەر دا دەنران لە هاوکێشەی سیاسیدا. زۆر لەم سەرۆك خێڵانە وێڕای دەسەلاتی دنیایشیان خاوەنی پایەو مەقامێکی ئایینیش بوون، کوردەکان لە مێژەوە وەك نەریت خەڵکێکی بەدین و باوەڕداربوون، وعیرفان وتەسەوفیان ئاوێتە بە ئیسلام کردووە و زۆربەشیان پەیڕەوی تەریقەتی جیاوازی سۆفیگەرین. ڕامالینی ئەو هەلومەرجەش لە تورکیا دا زیاتر لە ناوچە کوردنشینەکاندا بەڕێوەبرا. وێڕای ئەوەش دەوڵەتی توکیا مافی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە کوردەکان زەوت کرد و ئەوانی ناچار کرد کە خۆیان بە تورکی چیایی ناوببەن

نەك هەر لە ڕووی ئیدارییەوە بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە هەموو بوارەکاندا بەزەبری هێز قەدەغە کرا و تەنانەت کوردەکانی ناچار کرد دەست لە پۆشینی جلوبەرگی میللی خۆیان هەڵگرن و پۆشاکی چاکەت و پانتۆڵ بپۆشن.

قەدەغە کردنی جلوبەرگی میللی پاش چەند ساڵێك لە ئێرانیشدا بەڕێوە برا، ئێمەو مانان ئاگاداری ئەوە بووین، کە کوردەکان تاچ ڕادەیەك لەم بەسەرهاتەدا بێزارو نیگەران بوون، بەڵام ئەم کێشەیە لە ئێراندا زۆری نەخایاند، هەر لەگەڵ هاتنە سەرکاری (شا)ی ئێستادا[56] خەڵکی ئازاد کران لە پۆشینی جلوبەرگی میللی خۆیاندا.

کونترۆڵ کردن وچاودێری کردنی تۆکمەی سنوورەکانی ڕۆژهەلات و باشوری ڕۆژهەلات ڕێی لە هاتنە ناوەوەی بڕێکی زۆر لە چەك بۆ ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا گرت و پرۆسەی چەکداماڵینی تیرە و هۆزەکانیش ئەم مەڵبەندانەی بێ بەرگری و بێهێز کرد و هەرجۆرە ئەگەری بەرپاکردنی یاخیبوونێکی لەوان زەوت کرد.

لە ساڵی 1960دا ئەنجومەنی سەربازی تورکیا، لە ناڕەزایی کوردەکان سەبارەت بە ڕژێمی نوێ بەخەبەر هات کە ڕژێمی تورکیایان بە ڕادیکال و علمانی ناودەبرد، دەوڵەتی تورکیا هۆی ئەم ناڕەزاییەیان لەبن سەری ئاغاکاندا دەدی و هاندانی ئاغاکانیان بە هۆکاری تەشەنەکردنی ناڕەزایی و بێزاری دەزانی، لەبەرئەوە بڕیاریدا ژمارەیەکی زۆریان لێدووربخاتەوە بۆ ناوچەکانی دیکەی تورکیا، ڕۆژانە بۆ هەریەکێکیان 50لیرەی تورکی بڕایەوە، بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە هەریەك لە دوورخراوەکان ژمارەیەك لە ئەندامانی

---

[56] -مەبەست لە محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی‌یە (1919–1980)، لە 1941دا بووە شای ئێران، لە 1979دا لە ئاکامی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئیسلامیدا ئێرانی بە جێهێشت، لە میسردا مرد. (و)

خێزانەکانیان لە گەڵدا بوو ئەم بڕە پارەیە بژێوی ئەوانی دابین نەدەکردو وێڕای ئەوەش ئەو بڕە پارەیە بەڕێکوپێکی نەدەدرا. ئەم کێشەیە لە نێو کەسوکار و پشتیوانانی ئەواندا ناڕەزاییەکی توندی بەدیهێنا، ئەم بڕیارەی دەوڵەتی تورکیا، نەك ناڕەزایی دانەمرکاندەوە، بەڵکو بووە هۆی سەرهەڵدانی چەتەیی و ڕاوڕووتی چەکدارانە و ڕێگری لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا بە جۆرێك کە تا ماوەیەك کەسێك جورئەتی سەفەرکردنی بۆ ئەو ناوچانە نەدەکرد، سەرەنجام دەوڵەتی تورکیا بە ناچار دوور خراوەکانی ئازاد کرد و لە ئاکامدا سەر لە نوێ ئاسایش و ئارامی سەقامگیر بۆوە.

ئایا کوردەکانی تورکیا لە بارودۆخی ئێستەی خۆیان ڕازین ؟

بە پێی دەموزمانی ئەو ژمارە کوردەی کە توانیویانە ڕوەو ئەودیووی سنوورەکانی تورکیا هەڵبێن یا بەبەهانەی بازرگانی کردنەوە لەو وڵاتە دەرکەون، کوردەکانی تورکیا بە هیچ جۆرێك ویست و ئارەزووی سەربەخۆییان لە دەستنەداوە و سۆزوهاودەردییەکی قوڵ سەبارەت بە برایانی کوردی خۆیان لە عێراقدا دەردەبڕن کە دروشمی (سەربەخۆیی یا مەرگ) یان کردۆتە پیشەی خۆیان، کوردەکان خۆیان بە گەلێك دەزانن کە پیلان وسیاسەتە دەرەکییەکان وڵاتی ئەوانی پارچە پارچە کردووە. بەڵام لە ڕاستیدا هەستی مەزنی نەتەوەیی و کولتووری و زمان، ئیحساسی وان پێکەوە پەیوەست دەکات و ئەو سنوورە دەستکردانەی بە هۆی جەنگ و سیاسەتە دەرەکییەکانەوە بەسەر نیشتمانی ئەواندا داسەپاوە نابێتە هۆی ڕەزینەوەو لە دەستدانی ئەم هەستە قوڵەی یەکبوون و هاریکاری کردن.

# بەشی سێهەم
# كوردەكانی ئێران

كوردەكانی ئێرانیش وەك كوردەكانی توركیا بەشێكی شارنشین و بەشێكی چادرنشین و بەشێكی گوندنشین یا نیمچە چادرنشینن، هەندێكیان زستانان لە دێهاتی خۆیاندا نیشتەجێن و هاوینان بەمەبەستی لەوەڕاندنی مەڕو مالات بەرە و كوێستانە بەرزەكان كۆچ دەكەن. كوردەكان لە سێ ئوستانی ئێراندا: ئازەربایجان و كوردستان وكرماشان دا دەژین و، مەڵبەندی دەوروبەری زاگرۆسیان لە هەردوو دیوەوە بەدرێژایی سنووری ڕۆژئاوای ئێران داگیركردووە.

لە كرماشاندا زۆربەی تیرەو هۆزەكانی كورد لە گۆران و لۆڕەكان پێكدێن، ئوستانی كوردستان پێكڕا كوردنشینە. لە ئازەربایجانیشدا بە درێژایی سنووری ڕۆژئاوا و دەوروبەری شارەكانی خوی، ماكۆ، ورمێ، مەهاباد كوردنشینە و هەموو پێكەوە دانیشتوانێكی نزیك بەیەك ملیۆن پێكدێنن. زۆربەی كوردەكانی ئێران سەر بەعەشیرەت و خێڵەكین و بەسەرچەند تیرەیەكدا دابەش دەبن و دەناسرێنەوە، ئەم هەلومەرجە هەر لە مێژەوە تا بە ئەمڕۆ لەسەر ئەم ڕێچكە و ڕێبازە ماوەتەوە، هەرچەند ئۆرگانی خێڵایەتی كورد لە ئێراندا وەك توركیا هێندە گۆڕانكاری بەسەردا نەهاتووە، بەلام كۆنترۆڵی توندی دەوڵەت و دامەزراندن و نوێسازی فەرمانگەو قوتابخانەو شت گەلێكی دیكە بۆتە هۆی بەدیهێنانی گۆڕانكارییەكی ڕیشەیی لەو هەلومەرجەدا، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە ئیدارات لە وێدا ڕاستەوخۆ لەگەڵ خودی خەڵكیدا سەروكاریان هەیە نەك لەگەڵ سەرانی خێڵەكانداو لە بەڕێوەبردنی یاساكاندا هاوسەنگییەك بەدیهاتووە. وەرزێرو جوتیاران ماف وئەركێكی یەكسانیان هەیە لەگەڵ خاوەن موڵك و سەرۆك عەشیرەتەكاندا و لەسەردەمی ڕیفۆرمی

کشتوکاڵییەوە پێشڤەچوونێکی گەورە لە هەلومەرجی هۆزو عەشایریدا هاتۆتە کایەوە.

لەسەردەمی دامەزرانی دەوڵەتی ڕەزاشاوە بەرنامەی چەك داماڵینی عەشایر دەستپێکراو، جگە لەو ڕاوەستانەی کەلەم ڕووەوە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەدیهات، تا ڕادەیەك تا بەئەمڕۆ ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی تۆکمە بەڕێوە براوە. سەرۆك هۆزە گرنگ و بە دەسەڵاتەکانی کورد لە مێژەوە لەلایەن دەوڵەتەوە بەڕەسمی ناسراون و ئەرکی پاسەوانیو پاراستنی سنورەکانیان پێسپێردراوەو بە بەردەوامی مووچەی ساڵانەیان پێدەدرێت، بەمجۆرە ئەم هۆزانە بەکردەوە سەربەخۆبوون. بە تایبەتی لە پاش شۆڕشی مەشروتەوە لە 1907 دا، کەدەسەڵاتی دەوڵەتی قاجار لاوازبوو، زۆربەی ناوچە کوردنشینەکان لەلایەن سوپای عوسمانییەوە و پاشان لەلایەن هێزەکانی ڕوسیاوە لە ساڵی 1911 تا 1917 داگیرکران. لەکاتی جەنگی یەکەمدا کوردەکان لەلایەن دەوڵەتانی ئەڵمانیاو تورکیاوە بە مەبەستی جەنگ دژی ڕوسیا بە باشی چەکدار کرابوون، لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917ی ڕوسیاش، لەئاکامی کشانەوەی سوپای ڕوسدا، کە پاش کوشتنی ئەفسەرەکانیان دەیانویست هەرچی زووتر خۆیان بگەیەننەوە ڕوسیا و لە شۆڕشدا بەشدار بن، چەکێکی زۆر کەوتە دەست کوردەکانەوە.

## 1-ئیسماعیل ئاغای شوکاك ( سمکۆ )

پاش شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا لە ساڵی 1880دا، ئیدی شۆڕشێکی گەورە بەمەبەستی. بەدەستهێنانی سەربەخۆیی یا تەنانەت ئۆتۆنۆمی کورد لەلایەن کوردەکانی ئێرانەوە هەڵنەگیرسا.

یاخیبوونە پەرت و بڵاوەکانی هۆزی گەڵباخی لە کوردستانی ناوەڕاستدا پتر سیمای شەڕی خێڵەکیو تاڵانو بڕۆی پێوە دیار بوو، تەنها یەك هۆزی

دەگرتەوە و کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو لەسەر بارودۆخی گشتی دەڤەرەکە. هەرچۆنێك بێت لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا یاخیبوونێکی گەورە لە ناوچەی کوردنشینی ئازەربایجاندا وەگەڕخرا. لەومەڵبەندەدا سەرۆکی بەدەسەلاتی هۆزی شوکاك (ئیسماعیل ئاغا) بوو کە کەسێتی بەهێز و دلێری و بێ ڕەحمی ودڵڕەقی ئەوی کردبووە سەرکردەیەکی بێهاوتا لە نێو هەموو ئێل و هۆزەکاندا. دەسەلاتی ئەو لە باکوری (خوی) یەوە بەرین دەبۆوە تا دەوروبەری (سەقز و بانە).

ئیسماعیل ئاغا کوڕی محەمەد ئاغای شوکاك بوو، لە ساڵی 1920 دا هۆزەکەیان خۆی ئەدا لە دووهەزار خێزان، (ئێستا نزیکەی چوار هەزار خێزان دەبێ). ئەم هۆزە لە دووبەش پێکهاتبوون، (عەبدەوی) کە لە دەوروبەری (چهریق)دا لە ڕۆژئاوای (سەلماس)دا نیشتەجێ بوون و ڕاستەوخۆ لە ژێر سەرۆکایەتی ئیسماعیل ئاغادا بوون، (مەهدەوی) کە لەژێر سەرۆکایەتی (عومەرخاڵ)ی مامی ئیسماعیل ئاغادا بوون و ، بەلاّم هەردوو بەشەکە ئیسماعیل ئاغایان وەك سەرۆکی خۆیان پێقبوڵ بوو، ئەم هۆزە لە ڕابردوودا هەندێجار ئاشتی خواز و سەردەمێکیش یاخی و سەرکەش بوون، جەعفەر ئاغای گەورە کوڕی محەمەد ئاغا پیاوێکی سەربزێوو یاخیبوو. ببوە مایەی ئاژاوەنانەوە و نائارامی بۆ حکومەتی ئەیالەتی ئازەربایجان. نیزام سەلتەنەی حوکمڕانی تەورێز کە لە هۆزی (قەرەچەداغ)بوو بڕیاریدا بە هەرشێوەیەك بووبێ. خۆی لەشەڕی ئەو ڕزگار بکاو ئاسودەبێ، بۆ ئەو مەبەستە جەعفەر ئاغای بانگ کرد تا لەگەڵ ژمارەیەك لە سوارەکانیدا بێتە تەورێز و لە دابین کردنی ئاسایشی شاردا یارمەتی بدەن کە بەهۆی شۆڕشی 1905ی روسیاوە، بارودۆخی ئازەربایجان و قەفقاس ڕووی لە پشێوی و نائارامی نابوو، هەموو ڕۆژێك کوشتوبڕ لە نێوان گروپە ئەرمەنی و قەفقاسیەکانی نیشتەجێی تەورێز دا ڕووی ئەدا.

پاش تێپەڕ بوونی چەند ڕۆژێك بەسەر هاتنی جەعفەر ئاغادا بۆ تەورێز، (نیزام ئەلسەلتەنە) ئەوی بۆ ڕاوێژکردن لە بارەی کاروباری شارەوە بۆ (دار الحکومە) داوەت کرد، ناوبراو پێشتر ژمارەیەك دەستوپێوەند و نۆکەری خۆی لە پشت پەردەوە دامەزراند بوو، لەگەڵ هاتنی جەعفەر ئاغادا بۆ نێو سەراکەی هەڵیان کوتایە سەری و بەزەبری خەنجەر ئەویان کوشت (1907).

ئەم کارە ناجوامێرانەیەی حکومەتی تەورێز لەبری چاوترساندنی خێڵی شوکاك، ئەوانی زیاتر سەرکەش و یاخی کرد.

لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، هەلومەرج وباردۆخی ئەیالەتی ئازەربایجانی ئێران لە ترۆپکی نا ئارامی و پشێویدا بوو، خەڵکی بەدەست سەربازانی پەرتەوازەی ڕووسییەوە گیرۆدە بوون. ئازوقە دەگمەن و ڕێکخستنی ئیداری لە گێژەنە چوو بوو، پەتاو نەخۆشیش، سەرباری هەموو ئەو کێشانەبوو.

ناوچەی ڕۆژئاوای گۆمی ورمێ لە دوو بەش پێکدێ.کە دانیشتوانەکەی تێکەڵێکە لە تورکی شیعە مەزهەب و ئاسوری مەسیحی، سێ لە چواری ئەوان موسڵمان و یەك لە چواریشیان مەسیحین، دەشتەکانی باکوری سەلماس (شاهپوری ئێستا) کە نزیکەی 160 گوند دەبێ و باشوری ورمێش نزیك بە سێ سەد گوندی تێدا هەڵکەوتوە، سەرجەم ناوچە کوێستانیەکانی ڕۆژئاواش نیشتەنیەکانی لە کورد پێکدێ، بە کورتی دەوروبەری ورمێ زیاتر لە کورد پێك دێ ودانیشتوانی ناوشاریش پتر لە تورکەکان پێکدێ لەگەڵ کەمینەیەك لە ئاسورییەکان.

لە کاتی جەنگدا، نزیکەی بیست وپێنج هەزار ئاسوری لە ئاسورییەکانی تورکیا کە بە (جەلۆ) ناسرا بوون. لە ترسی ئەوەی نەبادا بە دەردی ئەرمەنییەکان بچن و گیرۆدەی چارەنوسێکی هاوشێوەی ئەوان بن، ئاودیووی خاکی ئێران بوون و لە ناوچەی ورمێدا نشتەجێ بوون. ئەم کۆڕەوە ژمارەی

دانیشتوانی ئاسوری ئەم ناوچەیەی بە دوو بەرامبەر گەیاند. ئەوان لە ژێر سەرپەرشتی ئەو مژدەدەرە ئەمریکییانە دا بوون کە هەوڵیان ئەدا ئەم مەسیحییە نەستۆریانە[57] بکەنە پرۆتستانت[58]. تورکەکان گەرەکیان بوو لەگەڵ

---

[57] –نەستۆری:بە پەیڕەوانی (نەستۆر)ی پاتریارکی سەدەی پێنجەمی کوستەنتینەی پایتەختی رۆمی بێزەنتی دەوترێ، نەستۆر پێی وابوو مەسیح دوو سروشت و ئەقنومی هەیە، یەکێکیان کوڕی خودایەو ئەوەی دییان کوڕی مرۆیە، مریەمیش دایکی خوداوەند نییەو دایکی مرۆڤە، کۆڕی (ئەفس) لە 431 ز دا ئەم باوەڕەی بە کفر و لە دینی مەسیح وەرگەڕان دانا و پەیڕەوانی کەوتنە بەر شالاوی کوشتن و ڕاونانەوە، بە کۆمەڵ پەنایان بۆ چیاکانی کوردستان هێنا، ئاسورییەکانی کوردستان پێکڕا پەیڕەوانی نەستۆر بوون، بەلام کاتێك لەسەدەی شانزەهەمدا (مارشەمعونی پێنجەم) بە مەبەستی ڕێگرتن لەدەستتێوەردانی مژدەدەرانی کاسۆلیك ودەسەلاتدارانی تورك، هەڵبژاردنی ئازادی پاتریارکی ڕەتکردەوەو جێنشینی بە میرات لە باوکەوە بۆ کوڕ کرد بە نەریت لە کەنیسەی ئاشوریدا، هەندێك لە ئاشورییەکان بەهاندانی مژدەدەرە کاسۆلیکەکان ملیان ڕانەکێشا بۆ ئەو بڕیارەو (یوسف سولاقا)یان بە پاتریارکی خۆیان هەڵبژارد . ئەم کارە ئاسورییەکانی کرد بە دوو لقی (شەمعونییەکان) و (یوسفییەکان)ەوە، پاشان لە 1553دا یوسفییەکان بوون بە کاسۆلیك‌و باوەڕیان بەیەك سروشتی مەسیح هێناو بە (کلدان) ناوبران، بۆ جیاکردنەوەی خۆشیان و وەك توانجیش (شەمعونییەکان )بە نەستۆری ناوبرد.(و)

[58] –پرۆتستانت: نارەزایی بەرامبەر بە کارە چەوت و نارەواکانی ڤاتیکان و پاپالیوی دەیەم لە سەدەی شانزەهەمدا، جیهانی مەسیحی رۆژئاوای کرد بە دوو بەشی گەورەی (کاسۆنیك)و (پرۆتستانت)ەوە، کەنیسەی پرۆتستانت چەندین لق و پۆپی لێدەبێتەوە، کە گرنگترینیان لۆسەری و کالڤینی و پیورتانت و ئەنگلیکانە، سەرەڕای جیاوازییان، هەموویان لەڕەتکردنەوەی دەسەلاتی روحی پاپاو باوەڕ نەهێنان بە پیرۆزی پارساکان و خوانی ڕەبانی‌و نەپەرستنی مریەم و دانانی ئینجیل بە تاکە سەرچاوەی ئیماندا یەکدەگرنەوە: ئەمریکا وبەریتانیا و ئەلمانیا و وڵاتانی ئەسکەندناڤیا مەڵبەندی سەرەکی کەنیسەی پرۆتستانتە. مژدەدەرانی پرۆتستانت لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە لە نێو مەسیحییە ئەرسۆزکسەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕستدا چالاك بوون، لەم روەوە حەرەکاتی تەبشیری ئەمریکییەکان لە ئینگلیزو ئەلمانەکان

لەگەڵ ئاسوورییەکانی هاوسێیاندا پەیوەندییان دۆستانەبێ، بەڵام پڕوپاگەندەی ڕوسەکان ومژدەدەرە ئەمریکییەکان (کە تەنانەت بەر لە هاتنە ناو جەنگەوەی ئەمریکاش، هزروبیریان دژ بە تورکیا بوو) وایلێکردن چارەنووسی خۆیان لەگەڵ چارەنووسی ڕوسەکاندا گرێبدەن، لەو مەڵبەندەدا کە ڕوسەکان نەیانتوانی لە ناوچەی (وان) پتر پێشرەوەی بکەن، جەلۆکان بڕیاریاندا ڕوەو ئێران ڕەوبکەن کە بۆ ئەوان هەموار تربوو. ئەم جەلۆیانە لەسەرتاسەری ڕێگای خۆیاندا لەگەڵ کوردەکانی ئورامار، ئەتروش، بەرواری و بارزانییەکاندا جەنگین و لە کۆتاییدا لە دەوروبەری ورمێدا بنەو بارگەیان خست و گیرسانەوە. تائەو دەمە موسڵمان و ئاسوورییەکانی ئەو دەڤەرە پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ یەکدا هەبوو. بەڵام هاتنی ئەم خەڵکە چەکدار و جەنگاوەرە، پەیوەندی نێوانیانی بە تەواوی تێکدا، جەلۆکان کە ژمارەیان نزیکەی 25هەزار کەس دەبوو، لە بەرئەوەی بۆ بژێوی ئەو ڕێگایە دراویان پێنەبوو، دەبوو پێداویستی خۆیان بە تاڵان و بڕۆدابین بکەن.

دانیشتوانی ورمێ خەڵکی وڵاتێك بوون کە ڕەوشی بێلایەنیی ئەو لە لایەن هێزە دەستدرێژکارەکانی هاوسێییەوە پێشێل کرابوو، لە کاتێکدا کە ئێران، وڵاتێکی بەشداری جەنگ نەبوو، بە هیچ جۆرێك خۆیان بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ ئەوتازەهاتوانەدا ئامادە نەکردبوو.

لەوێدا کە جەلۆکان لەلایەن ڕوسیاوە بە باشی چەکدار کرابوون، دەستیان کرد بەوە تاڵان وبڕۆی دوکان و بازاڕەکانی ورمێ، تا خەڵکی موسڵمان

---

چالاکتربوون، چەندین دەزگای ئایینی و قوتابخانەیان بە تایبەتی لە لوبناندا دامەزران، بەڵام لە ناو کاسۆلیکەکاندا ڕووبەڕووی چەندین کۆسپ دەبوونەوە کە مژدەدەرە کاسۆلیکە فەرەنسیەکان لە نێویاندا چالاك بوون، حەرەکاتی تەبشیرو مژدەدەران ڕۆڵێکی زۆر چەپەڵ و خراپیان گێراوە کە هەرچی زیاتر تەبایی و هاوکۆکی میللەتانی ئەم ناوچەیە و تەنانەت یەکێتی نێو یەك مەزهەبیشیان تێکداوەو ناکۆکییان خستۆتە نێویانەوە. زۆربەیان مەبەستی سیاسییان لە پشتەوە بووە. (و)

گەیشتەتینیان و کەوتنە بەرگری کردن لە خۆیان . ئاسورییەکانی نیشتەجێی ورمێش بوونە هاودەستی جەلۆکان و کەوتنە قەتلوعامی موسڵمانەکان، نوێنەری پاپا (مانسیۆر سن تاگ) هەوڵیدا ڕێ لە کوشتار و خوێنڕێژی بگرێ، بەڵام (دکتۆر شیدید) مسیۆنێری ئەمریکی بە توندی پشتگیری لە ئاسورییەکان کرد و ئەوانی بۆ درێژە دان بە کوشتوبڕی ئێرانییەکان هاندا.

پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەرو گەڕانەوەی سەربازانی روسیا، هاوپەیمانەکان لەگەڵ نائارامیو پشێوی بارودۆخی قەفقاسو بەرەی باکورو باکوری ڕۆژهەڵاتدا ڕووبەڕوو بوونەوەو، دانیشتوانی قەفقاسیان بە ئەگەری پەلاماری تورکەکان ترساند و هانیاندان بۆ ئەوەی خۆیان جێی روسەکان بگرنەوە، تا بەمجۆرە ڕێ لە داگیرکردنی ئەم ناوچانە لە لایەن تورکیاوە بگرن وناوچەی پڕ لە نەوتی باکۆش لە ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بێت. بەڵام ئەم پیلانە ڕووبەڕووی شکست بۆوەو قەفقاسیەکان ئامادەی شەڕکردن نەبوون لەگەڵ هاوئایینانی خۆیان و خەڵکی گورجستاندا، کە زیاتر لە تورکەکان، لە ئەرمەنییەکان بە ترس وبەگومان بوون. لە بەر ئەوە ئەرمەنییەکان تەنها لە ناوچە سنوورییەکاندا مانەوە ودواتریش دابەش کران. ئەرمەنییەکانی ڕوسیا یا ئەرمەنییەکانی قەفقاس کە بەرامبەر بە بەلشەفیەکەکان[59] هەستی هاودەردی وهەماهەنگیان پیشان ئەداو، کەوتنە شوێن ئەو ڕەوشەی کە دەوڵەتی نوێی سۆڤیەت گرتبویە بەر. لە پاشدا ئەوانیش خوازیاری دەستبەسەراگرتنی ناوچە ئەرمەنی نشینەکانی تورکیا نەبوون.

هەرچۆنێك بێت، ئاسورییە جەنگاوەرەکانی جەلۆ کە پێشتر لە ناوچەی

---

[59] -بەلشەفیك: لە ساڵی 1898دا، مارکسییەکانی روسیا حیزبی (سۆسیال دیموکرات)یان دامەزراند، لە ساڵی 1903دا ئەم حیزبە بووە دوو باڵی (بەلشەفیك و مەنشەفیك)، لە ساڵی 1917دا بەلشەفیکەکان لە روسیادا دەسەڵاتیان گرتە دەست، لە ساڵی 1918دا ناوی بەلشەفیك گۆڕا بۆ (حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت). (و)

ورمێدا نیشتەجێببون، تینووی تۆڵەسەندنەوە بوون لە تورکەکان، بەشێك لەو چەکانەی هاوپەیمانان بۆ روسیایان ناردبوو دراپێیان و بەشێکیشی گواسترایەوە بۆ پایتەختی گورجستان.

بێگومان بیرۆکەی ئەو ئاسوریانەی کە لەلایەن (مارشەمعون) و پیاوێکی قین لەدڵی وەك (ئاغا بترۆس)ەوە رابەرایەتی دەکران، ئەوە بوو بە هەر نرخێك بێ ناوچەی ورمێو ئەگەر بکرێ سەلماسیش پاوان بکەن بۆ خۆیان و بە نیشتمانی خۆیانی ناوببەن. بێ بایەخدان بەوەی کەئەم سەرزەمینە سەر بە وڵاتێکە کە بێلایەنی ئەو بە درێژایی جەنگ لەلایەن وڵاتانی بەشداری جەنگەوە پێشێل کراوەو دەستدرێژی کراوەتەسەر. ئیسماعیل ئاغا و ئێلی شوکاك لە کاتی جەنگدا بە وریایی ڕەوشێکی بێلایەنیان گرتبووە بەر. هەر چەند لە بەرامبەر ویستی ئاسورییە کۆچەرییەکاندا نیگەران بوون. دیارە ویستی ئاسوورییەکان، لەم بارەوە کە وڵاتی ئێرانیش بێلایەن بوو، بە سوودو بەرژەوەندی ئیسماعیل ئاغا تەواو دەبوو.

مارشەمعون کە تینووی بە دەستهێنانی سەربەخۆیی یا لانی کەمی ئۆتۆنۆمی ئاسورییەکان بوو، گەرەکی بوو بە هەر نرخێك بووبێت لە پاش جەنگ ناچار بە گەڕانەوە بۆ ناوچەی (سنگلاخ)ی هەکاری و ناچار بەشەڕی بەردەوام نەبێ لەگەڵ هۆزە کوردەکاندا. مارشەمعون پەی بەوە برد بوو کە بەبێ هاریکاری و پشتیوانی کوردەکانی ئەم مەڵبەندە توانای بەڕێوەبردنی نەخشەی پیلانی خۆی نابێت، هەرچەند لە کرۆکدا گەرەکی بوو لە پاش سەرکەوتنی کۆتایی هاوپەیمانەکان و شکستی دەوڵەتی تورکیا، ئەوانیش لە ناو ببات. بۆ ئەو مەبەستە سمکۆی هەڵبژارد، کە ناسراوترین و هەڵکەوتووترین سەرۆك ئێلی ئەم مەڵبەندە بوو، لە پاش دەستەبەرکردنی لایەنگری کەسانی گوێڕایەڵ بە تایبەت ئەرمەنییەکان، ئەم کوردە ژیرەی بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ ئاسوورییەکاندا دیاری کرد. بەمجۆرە بڕیار لەسەر

ئەوەدرا كە دوو ڕابەر بە مەبەستی دانوستان بێنە (كۆنەشار) تا دەربارەی پیلان و نەخشەی ئایندەی شەڕ لەگەڵ تورك و دەوڵەتی ئێراندا گفتوگۆ بكرێت.

سمكۆ كە خولیای ڕابەرایەتی كوردەكانی ئەم مەڵبەندەی لەسەر دابوو دەیزانی كە بەهەر نرخێك بێ پێویستە لە پێشدا لە دەست ئاسورییەكان ڕزگاری بێت، لە بەر ئەوەی بە هیچ جۆرێك نەدەكرا حوكمڕانێتی ئەو قبوڵ بكەن، دەشیزانی ئەگەر لەدژی موسڵمانان لەگەڵ ئاسورییەكاندا یەكبگرێت، توانای زامن كردنی پشتیوانی هۆزە كوردەكانی دیكەی وەك هەركی، مەرگەوەرو تەرگەوەرو ئەوانی دی نابێت، كە گەلێك لە ئاسورییەكان بەقین بوون و بەر لە ماوەیەك لە كاتی كۆچوڕەوی خۆیاندا بەرەو ورمێ ماڵ و موڵكی ئەوانیان تاڵان كردبوو.

لە 25 شوباتی 1918دا، مارشەمعون لە كاتێكدا لەلایەن 150پیاوی چەكداری ئاسوری جەلۆوە دەپارێزرا گەشتە كۆنەشار. لە حاڵێكدا ئیسماعیل ئاغا تەنها چەند كەسێكی لەگەڵدا بوو. تا ئەوان بە گومان نەبن و هەست بە پیلانەكەی نەكەن. بەڵام پاش دەسپێكردنی دانوستان هێندەی نەبرد هێزێكی گەورەی چەكداری كورد گەشتنە ئەوێندەرو لە بانێژەی ماڵە هاوسێكاندا خۆیان حەشار دا، ئەم كۆبوونەوەیە لە نێو ژوورێكدا ئەنجام دەدرا. لەم ماوەیەدا گاردی پاسەوانی مارشەمعون بەسەر ئەسپەكانی خۆیانەوە لە حەوشەی ماڵەكە دا چاوەڕوانی كۆتایی هاتنی وتوویژ بوون. پاش ماوەیەك مارشەمعون لە كاتێكدا كە لەلایەن ئیسماعیل ئاغاوە بە ڕێدەكرا، لەژوور هاتە دەر و بە گەرمی پێكەوە تەوقەیان كرد و خودا حافیزییان كرد. لە ساتێكدا كە مارشەمعون دەیویست سواری گالیسكەكەی خۆی بێت، لەپڕ ئیسماعیل ئاغا تفەنگێكی لە دەست یەكێ لە هەڤاڵانی خۆی وەرگرت و گوللەیەكی نا بە دەفەی شانێوە. ناوبراو كەوتە سەرزەوی وبراكەی سمكۆش بە دەمانچە

گوللەیەكی تری پێوە ناو كوشتی. ئەم گوللە تەقاندنە بە مانای ئاماژەدان بوو بە كوردەكانی هاوڕێی ئیسماعیل ئاغا، ئەوانیش لەسەر بانەكانەوە بە توندی دەستیان كرد بە تەقە كردن و لەماوەی چەند خولەكێكدا سەرجەم ئاسورییەكان، جگە لە دوو سێ یەكیان كە یەكێ لەوان (دیڤید)ی برا گچكەی مارشەمعون بوو توانیان هەڵبێن، هەموویان كوژران. ئیسماعیل ئاغاش لەتەك هاوڕێیانی خۆیدا گەڕایەوە چهریق.

كاتێك ئاسورییەكان لەم كارە خیانەت ئامێزە وە خەبەرهاتن لە پێشدا تیغی تۆڵەیان ئاڕاستەی توركەكانی ئازەربایجان كردوسەدان كەس لەپیاوو ژن و زارۆكی ئەوانیان كوشتو ماڵ و موڵكە كانیشیان بە تالان بردن، پاشان چەند هەزار كەس لەوان بەرەو كۆنەشار كەوتنە ڕێ و پاش تالان كردنی ، كەوتنە كوشت وبڕی خەڵكەكەی وپاشان ڕوەو چهریق پێشڕەوییان كرد، كەمێك بەر لە گەشتنی ئەوان سمكۆ ئەوێندەری بە جێهێشت و ڕودو كەژوكێوەكان پاشەكشێی كرد.

ئاسورییەكان ئەوێیان وێران كرد وگەڕانەوە ورمێ. لەكاتی گەڕانەوەیاندا ناوچەی سەلماس و دیلمانیان خستەبەر هێرش و پەلاماردان، بەلاّم لەلایەن خەڵكیەوە ڕاونران.

لەم سەروەختەدا سوپای توركیا بە مەبەستی بەهێز كردنی سنوورەكانی خۆی لەبەشی قەفقاسدا، لە میزۆپۆتامیا و سوریاو ئەرزنجانەوە ڕوەو ئەرزرۆم پاشەكشێیان كرد، لەوێدا چەند یەكە لە جەنگاوەرانی ئەرمەنییان بە فەرماندەیی (ئەندریاتیك) تێكشكان و دەستیان گرت بە سەر (قارس) دا. چەند یەكەیەك لە سوپای ئەڵمانیاش تفلیسیان داگیركردو دەوڵەتی لایەنگر بە خۆیان لەوێدا پێكهێنا.

ئەندریاتیك كە لەلایەن هێزەكانی هاوپەیمانەوە پشتیوانی لێدەكرا، خاكی توركیای بەجێهێشت و بە مەبەستی چوونە پاڵ ئەو ئاسوریانەی كە لەژێر

فەرماندەیی ئاغا بترۆسدا بوون، ئاودیووی خاکی ئێران بوو، لە نێوانی ڕێگادا هێرشی کردەسەر (خوی)، لەم کاتەدا ئاسورییەکانیش دەستیان گرت بەسەر شاهپوردا، پاش کوشتارو تالان و بڕۆی ئەو ناوچانە، بەرەو باشور پێشڕەوییان کرد. خەڵکی خوی بەیارمەتی تورکەکان ئەندریاتیکیان تێکشکان وئەویشیان بەرەو (یەریڤان) ڕاونا. ئاسورییەکانیش گەڕانەوە ورمێ. هەرچەند تورکەکان (سوپای عوسمانی) ورمێیان نەخستە بەر شاڵاو وپەلامارداانی خۆیان، بەڵام ئامادەبوونی سەرلە نوێی ئەوان لە ئازەربایجاندا بووە مایەی ئەوەی کە کوردەکان دووبارە گڕوتینیان تێبکەوێ و دەستبدەنە شەڕ و ڕاونانی ئاسورییەکان کە لەو دەمەدا لە ڕووی چەك و کەرەسەی جەنگییەوە لە تەنگانە دا بوون و ئەو هەوڵانەی بەمەبەستی دەست بە سەراگرتنی ئەنباری چەکی روسەکان لە شەرەفخانەدا دابویان، بە کۆمەکی خەڵکی و لەشکری تەوریز بێ ئاکام مابۆوە، لەم کاتەدا هێزێك لە سوپای بەریتانیا بەمەبەستی داگیرکردنی بیرەنەوتەکانی باکۆ هاتنە خاکی ئێرانەوە. لێپرسراوی ئەم گروپە ژەنراڵ (دسن ترویس) بوو. ناوبراو هەر لەگەڵ هاتنە نێو خاکی ئێرانەوە، کە لە بوونی ئاسورییەکانی ورمێ بەخەبەرهات، کەوتە پیلان دانان بۆ ئەوەی بە پێدانی بڕێك پارە وچەك و کەلوپەلی سەربازی پێیان، بتوانێت لەشەڕی دژ بە هێزەکانی تورکیا وبڕینی هێڵی پەیوەندی ئەواندا ، سوودیان لێوەر بگرێ. بەمجۆرە فڕۆکەیەکیان ناردە ورمێ و فڕۆکەوانەکەی (ستوان پتی تون) ی ئینگلیزی بە گەرمی لەلایەن ئاسورییەکانەوە پێشوازی لێکرا. پاشان بڕیار لەسەر ئەوە درا کە ستونێك لە هێزی ئاسورییەکان هێڵی گەمارۆی هێزەکانی کورد وتورك لە مەهاباد دا بشکێنن و بەرە و شاهێن قەڵا پێشڕەوی بکەن تا لەوێدا چەك و کەرەسەی سەربازی و پارەی تەواویان پێبدرێت. قۆناغی یەکەمی ئەم نەخشەیە بە باشی بەڕێوە برا، بەڵام کەمێك بەر لە گەشتنی ئەوان بۆ شاهێن قەڵا، هێزی ئینگلیز ئەم ناوچەیەیان بەجێهێشتبوو، لەم نێوەدا ئەو

بەشە لە ئاسورییەکان کە بۆ ڕێگرتن لە هێزی عوسمانییەکان ڕۆشتبوون ڕوە و شار گەڕانەوە و لەگەڵ وەئاگاهاتنیان لە ڕۆشتنی بترۆس ئاغا بەرەو باشوور، لەترسی ئەوەی نەبادا گیرۆدەی هێرشی تورکەکان و کوردەکانی سەر بە سمکۆ بن وبێکەسکوژ بکرێن-ژن ومناڵ ومەڕو ماڵاتی خۆیان کۆکردەوەو لە شار وەدەرکەوتن . بڕیاریان‌دا لەڕێگای جەنگ و هەڵاتنەوە لە دژی ئێلە کوردەکانی دەوروبەری مەهابادا، خۆیان بگەیەننە ناوچەی باشور، بەڵام کەوتنە بەرهێرش وپەلاماردانی لەشکری ئێران بە فەرماندەیی (مەجید ئەلسەلتەنە) کە لە لایەن ئیحسان پاشای تورکەوە بە فەرمانداری تەورێز دانرا بوو. لە هاوینی 1919دا، حوکمڕانێکی نوێ بۆ ئازەربایجان دانرا. لەم کاتەدا سمکۆ بڕیاریدا بە مەبەستی بەرفراوان کردنەوەی شۆڕش و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی دەستبەسەر ورمێدا بگرێت. لەسەرەتادا، بەندەری (گلخانی) داگیرکردو تاکە ڕێگای بەستنەوەی ورمێی بە تەورێزەوە کۆنترۆڵ کرد، پاشان هێزێکی چەکداری نارده نێو شار، ئەوان بارەگای حکومەتیان داگیرکرد وئەو ژمارە سەربازە کەمەش کە لەوێدا مابوونەوە، بەدیل گیران، پاشان کوردەکان بە تەواوی شاریان تاڵان کرد. دواتر هێرشیان کردە سە رشاهپور و لەپاش دوو ڕۆژ لە جەنگی خوێناوی، دەست بەسەر شارداگیرا، خەڵکی بەرەو ناوچەی لاکستان هەڵاتن وزۆربەیان لە نێوانی ڕێگادا کوژران.

حوکمڕانی تەورێز زۆربەی جەنگاوەرانی ژێر فەرمانی خۆی کۆکردەوە و ڕەوانەی ناوچەی شەرەفخانە و ناوچەی تاسوجی باکوری دەریاچەی ورمێی کردن. فەرماندەی ئەم جەنگاوەرانە (سەروان فلیپۆف)ی تیپی قەزاق[60] بوو کە

---

[60] -قەزاق: دامەزرانی هێزی قەزاق لە ئێراندا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1879 کە ناسرەدین شای قاجار، داوای لە تزاری روسیا کرد تا ئەفسەرانی قەزاقی ڕوسی بێنە ئێران و (مەشقی قەزاق)ی بەسەربازانی ئێرانی بکەن، سەربازانی هێزی قەزاق لە ئێراندا ئێرانی بوون و ئەفسەرو فەرماندەکانیشیان روسی بوون، ئەرکی سەرەکییان

لە تارانەوە ناردبوویان، لەم ناوچەیەدا هێرشی کردە سەر کوردەکان وئەوانی بەرەو چهریق ڕاونا. بەدبەختانە لە بری ئەوەی درێژە بەم سەرکەوتنانە بدەن و کۆتایی بە کاری سمکۆ بێنن، دەرگای گفتوگۆیان بۆ والاکردو ڕێیان پێدا لە ناوچەی چهریقدا بمێنێتەوە و دەست لە کوشتارو تالانی ناوچە دراوسێکانی هەڵگرێت. لە ساڵی 1920دا ئیسماعیل ئاغا بەشێوەیەکی هەمە لایەنە باسی لەسەربەخۆیی کورد دەکرد، بەسەرنجدان لە کەسێتی گرنگی خۆی و فراوانی لایەنگرانی ئەم کارە بەلای ئەوەوە ئەوپەڕی ئاسان بوو. ئەو دەیویست ئەیالەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێت کەسەرجەم کوردەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا لە خۆبگرێ، هەرچەند خەڵکی ئەو مەڵبەندە زیاتر ئازەری (تورکی شیعە مەزهەب بوون) و لە ڕووی ئاداب و ڕەوشت و نەریتی ژیانەوە لەگەڵ کوردەکاندا تەواو جیاواز بوون، کوردەکان خەڵکێکی سەربزێو و چادرنشین بوون وتورکەکانیش بە پێچەوانەوە خەڵکێکی ئارام و گوندنشین بوون.

پاش گەڕانەوەی فلیپۆف وهێزەکەی، (ئیسماعیل ئاغا) سەرلەنوێ دەستو پێوەندەکەی کۆکردەوە و عەشیرەتی هەرکیشی کردە هاودەستی خۆی و دووبارە دەستی گرتەوە بەسەر ئەوزەویانەدا کە ماوەیەك لەمەوبەر لەژێر دەسەڵاتی ئەودابوون. دیسان شاری خوی کەوتە بەر هەڕەشەی سمکۆ و ویستی‌دەستی بەسەردابگرێ.

ئەو هێزەی کە بۆ شەڕکردن لە دژی‌ئەو ڕەوانەکرابوون، بەتوندی تێکشکا و لە پاش لە دەستدانی 60 کوژراو گەڕانەوە تەوریز (1920).

لە هاوینی 1920دا، هێزێکی ژاندارم کە لە سێ دەستەی پیادە نیزام و

---

پاراستنی نفوزی روسەکان بوو لەئێراندا لە دژی نفوزی ئینگلیزەکان، لە شۆڕشی مەشروتەدا بەرگرییان لە محەمەد عەلی شاکرد. ڕەزاخان کە بە خۆی لە هێزی قەزاقدا کاری دەکرد، لە پاش هاتنە سەرکاری ، هێزی قەزاقەکانی لەگەڵ پێکڕای هێزەکانی تری ئێراندا لە ژێر فەرماندەیی خۆیدا یەکخست. (و)

یەکەیەکی تفەنگچی ودوو ئوسکادرانی سوارە پێکهاتبوون، بەمەبەستی بەهێزکردنی هێزەکەی تەورێز لە تارانەوە ڕەوانەکران، ئەز لەم ئەرکەدا فەرماندەی ئوسکادرانێکی سوارەبووم. لە مانگی سێپتەمبەردا، من و ئوسکادرانی سوارەو هێزی چەکداری سوارە بەمەبەستی بەهێزکردنی ئەو هێزە حەوت سەد نەفەرییەی کە لە ناوچەی میاندواو دا جێگیر بوون ڕەوانەکراین، کاتێك گەیشتینە میاندواو، هەواڵی تێکشکانی هێزی ناوبراویان لەلایەن کوردەکانەوە پێڕاگەیاندین، کە لە پاش لەدەستدانی 400 کوژراو، پاشماوەی هێزەکە هەڵهاتبوون، هەموو ئەوانەی بە دیلی کەوتبوونە دەست سمکۆ و دەستو پێوەندەکەیەوە گوللە باران کرابوون. بەدوای ئەم سەرکەوتنەدا، زۆربەی هۆزە کوردەکانی وەك مامش، مەنگوڕ، دێبوکری، پیران، زرزا، گویك، فەیزوڵڵابەگی،پشدەری، بانە وقادرخانی، چوونە پاڵ ئیسماعیل خان و ناوچەکانی میاندواو و مەهاباد لە مەترسی داگیر کردنی ئەواندا بوو، لەم کاتەدا ئەز تەنها سەد نەفەرم لە ژێر فەرماندا بوو، هەموو ئەو سەربازانەی کە لەجەنگی پێشوودا هەڵاتبوون و گەڕابوونەوە لامان. بەڕادەیەك ورەیان بەردا بوو کە ناچار بووم پێکڕایان بنێرمەوە بۆ تەورێز.

خۆشبەختانە لە پاش گەشتنم بە میاندواو، توانیم نزیکەی 500 چەکدارلە هۆزی ئەفشار کۆبکەمەوەو بەمجۆرە کۆی هێزەکەی من خۆی ئەدا لە 600 نەفەر. بەم هێزە هێڵی زێی (تاتاهوم) داگیرکرد کە بەسنووری سروشتی لێکجیاکردنەوەی زاری کوردی و تورکە ئازەرییەکان دادەنرێت.

پاشان سێ سەد نەفەر لە سوارەی قەزاقیش گەیشتنە ئەوێ و لە (خوی)دا هاتنە پاڵ هێزەکەی ئێمەوە، ئەوکات حوکمداری ئازەربایجان پیاوێکی پیری ڕوناکبیر بوو بە ناوی (مخبر السلطنه هیدایەت)ەوە، کە چەند کتێبی بە زمانی ئەڵمانی دەربارەی جەنگ خوێندبۆوە و لە عەمەلیاتی نیزامی دژ بە عەشایردا خۆی بە کارامەو لێزان دەزانی، لەم بارەوە فەرمانی دا بە کۆکردنەوەی چەند

یەکەیەکی سەربازی لاواز لە ئازەربایجاندا. لە کاتێکدا کە کوردەکان بە خێرایی توانای بزاوت و مانۆڕیان هەبوو، هەرکات دەیانتوانی خاڵە لاوازەکانی بەرەی جەنگ بخەنە بەر پەلاماردانی خۆیانەوە. لەگەڵ گەشتنم دا بۆ (خوی)، ئەرکی فەرماندەیی سەربازانی خۆم و هێزێکی 600 نەفەریم لە ژاندارمەری پێسپێردرا، کە بەمەبەستی پشتیوانی کردن لە ئێمە ئامادەکرابوون. ئەم هێزە بەرەو ناوچەی (هیرسا) پێشڕەوی کرد بە ومەبەستەی کە لەوێدا دوو هەزار چەکداری دیکە لە هۆزی (قەرەچەداغ) بەسەرۆکایەتی (ئەمیر ئەرشەد) بێنە پاڵ هێزەکەی ئێمەوە. ئەم هێزە لە (سۆفیان) و (شەرەفخان)ەوە ڕوەو سەلماس دەستیان کردبە پێشڕەوی کردن، قەرەچەداغییەکان بە هۆی چەك دامالینی ئەرمەنییەکانەوە لە ساڵی 1920 دا بە چاکی چەکدار ببوون و چەند ئەفسەرێکی روسیشیان لە نێودا بوو کە لە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە پەنایان هێنابووە بەر ئێران. هێزەکەی ئیسماعیل ئاغا بە چاپوکی و پەلاماردانی لە ناکاو، ڕێی لەم یەکگرتن و بەیەك گەشتنە گرت و دەستی کرد بە پێشڕەوی کردن بە ئاڕاستەی ئەوزنجیرە کێوانەی کە دەشتی (خوی)یان لە ناوچەی (تاسوج) جیادەکردەوە، پاشان کتوپڕ بەلای ڕاستدا وەرچەرخان ولە باڵی ڕاستەوە پەلاماری قەرەچەداغییەکانیان دا و هێرشیان کردە سەر هێزەکەیان، بە تەواوی ڕێی پێشڕەوی کردنیان بەرەو (قەرا لجە) لێگرتن. ئەم هێرشە لە ناکاوە سوارە ڕێکنەخراوەکانی قەرەچەداغییەکانی پەرتەوازەکرد و بەرەو شەرەفخانە ڕاونران. لە حالێکدا کە دوو سەد کوژراویان لەدوای خۆیانەوە بەجێهێشتبوو، لە نێو کوژراوەکاندا خودی ئەمیر ئەرشەدیش دەبینرا. پاش ئەم سەرکەوتنە ئیسماعیل ئاغا ڕوەو ستونەکەی ئێمە وەرچەرخا، ژاندارمەکانی تاران لە پاش هەندەك خۆڕاگری کەرەسەی سەربازییان ڕووی لە تەواو بوون ناوبەرەو (خوی) پاشەکشێمان کرد. کوردەکان وەك گشت جارێك خۆیان لەوە دووکەوتنی ئێدە بوارد. لە مانگی نۆڤەمبەردا من کەوتمە خۆ

کۆکردنەوە و هەوڵدان بۆ ئەوەی بەڵکو بە پەلامارێکی لە ناکاوی دەستەی سوارە دەست بەسەر گوندی (ئەزدیکان) دابگرین، بە کۆنترۆڵکردنی ئەم گوندە کوردنشینە ئێمە دەمانتوانی عەمەلیات بەرەو دەشتی سەلماس درێژە پێبدەین بەڵام یەکێك لە سەرانی تورکی ئازەری کە لە ماڵی ئەودا میوان بووم و دەبوو ڕۆڵی پارێزگاری کردن لە من ببینێ ، لەڕێپێوانی شەوانەماندا ئێمەی بە تەنها بە جێهێشت وبەرەو لای کوردەکان هەڵات و هەواڵی ئەم پیلانەی پێگەیاندن، بە هۆی ئەوەوە بەر لەوەی ئێمە بتوانین ئەوان غافڵگیر بکەین، ئەوان ئێمەیان غافڵگیرکرد. لە نیوەشەودا کەوتینە نێو گەمارۆی کوردەکانی ئەزدیکان و کرسنییەکانەوە. پاش شەش کاتژمێر لە جەنگێکی سەخت کە ئەسپەکەی منیشی تیا کوژرا، ناچار بە پاشەکشێ کراین. لە حاڵێکدا کە تەرمی50 کوژراو و 9 دیلمان لەدەست کوردەکاندا بەجێهێشتبوو، ئەم نۆ کەسە دەبەنە لای سمکۆو ئەو داوایان لێدەکات کە میکانیزمی یەکێ لەو ڕەشاشانەیان بۆ ڕاڤە بکات کە وەك دەستکەوت لە ئێمەیان گرتبوو. یەکێ لەوانەی کە بەر پرسی ئەم کارە بوو، لە کاتی فێرکردنی میکانیزمی ڕەشاشەکە دا گوللە دەخاتە ناو ڕەشاشەکەوەو لولەکەی ئاڕاستەی سمکۆ دەکات، سمکۆ بروسکە ئاسا هەڵئە کوتێتە سەری ودەستی پیاوەکە دەگرێ وپێی دەڵێ کە شێوەی کارکردنی فێربووە. ئەم جوامێری و چاوقایمییە هێندە سمکۆی خۆشحاڵ کرد کە هەر یەکە و لیرەیەکی زێڕی وەك خەڵات پێبەخشین و ئازادی کردن.

لە پاش ئەم بەسەرهاتە، تەواوی ستونەکە سەر لەنوێ چەکدار کرانەوەو لە لایەن سەد نەفەر لە سوارەکانی تورکی هۆزی ئورسەلان، لوی ماکۆوە کە لە ژێر فەرماندەیی (بەیات ماکۆ)ی سەرۆکی خۆیاندا پشتیوانییان لێدەکراو لە بەرزاییەکانی قەرەتەپەوە هێرشیان کردە سەر کوردەکان، ئەم هێزە لەوپەڕی مێرخاسیدا دەجەنگا. لەم شەڕەدا نزیکەی 60 نەفەری لێکوژرا. بەڵام 600 نەفەر ژاندارم لە بەرامبەر سێ هەزار چەکداری سمکۆدا قابیلی بەراورد کردن

نەبوو. عەشیرەتەكانی (ماكۆ)یش كە لە باڵی ڕاستەوە لە دژی هێزەكەی سمكۆ دەجەنگان بە بێمۆڵەت پێدان سەنگەریان چۆڵ كرد، لە ترسی ئەوەی نەبادا بكەونە گەمارۆوەو ڕێگای گەڕانەوەیان بۆ (خوی) لێبگیرێت. فەرمانی پاشەكشێ درا و هێزەكە كشایەوە. ڕۆژی دواتر سەرجەم ستونەكە شاری (خوی)یان بە جێهێشت وبەرەو شەرەفخانە كەوتنە ڕێ. بەڵام كوردەكان نەهێرشیان كردە سەر (خوی)و نەوەدووی پاشەكشێی ئێمەش كەوتن.

لە مایسی 1922 دا، پاش چوڵكردنی (گیلان) لە هێزەكانی سۆڤیەت و تەسلیم بوونەوەی هێزی 700 چەكداری كۆمۆنیستی ژێر فەرماندەیی (خالۆ قوربان) ئەم هێزە هاتە نێو ڕیزی سوپاوە وبەمەبەستی شەڕكردن لەگەڵ سمكۆدا ڕەوانەی ئازەربایجان كران، بۆ ئەوەی هێزی سمكۆ لە ئاڕاستەی میاندواوە بەرەو مەهاباد پێشڕەوی نەكات. ئەم فەرمانە بەبێ پشتیوانی دیسپلینی نیزامی بوو، هەرچەندە ئەم هێزە لە ناوچە زێدێكانی خۆیاندا جەنگاوەری كارامەبوون، بەڵام بە هۆی ئاشنانەبوونیان بە جەنگی دەشت و كێوەكانی ئەو دەڤەرە و ڕانەهاتنیشیان بە كەش و هەوای ئەو كوێستانە لە دەوروبەری مەهاباد دا، كەوتنە بەر هێرشی عەشایرەكان، پاش كوژرانی خالۆ قوربان و 150 كەس لە هەڤاڵانی، پاشماوەی هێزەكە بەسەرو پێشكاوی ڕوەو مەراغە كشانەوە و سەرەنجام لە وێشەوە ڕەوانەی ناوچەی خۆیان لە گیلان داكرانەوە. بەشی دووەمی ئەم عەمەلیاتە درێژخایەنە لە دژی كوردەكان بە شێوەیەكی تەواو جیاواز بەڕێوە برا.

ڕەزاخان[61] سەركردەی سوپاو وەزیری جەنگ و فەرماندەی گشتی

---

[61] -ڕەزاخان :( 1878-1944)، دامەزرێنەری دەوڵەتی پەهلەوی بوو لە ئێراندا، لە 1921 دا كودەتای كردو تارانی داگیركرد،لە 1925 دا بووە شای ئێران، لە پاش داگیركردنی ئێران لەلایەن هێزەكانی هاوپەیمانەوە لە 1941دا، ڕەزا شا لە سەركار لابراو دوورخرایەوە بۆ ئەفریقای باشورو لەوێشدا مرد. (و)

هێزەکانی ئێران، لە پاش کودەتا سەرکەوتوانەکەی خۆی لە شوباتی 1921دا بۆ یەکەمین جار لەشکرێکی یەکپارچە و یەکگرتووی لە هێزە جیاوازەکانی سوپای ئێران، لە قەزاق و ژاندارم و سەربازو چریك، پێکهێناوپەی بەودبرد کە ناردنی دەستە وگروهی بچوك بۆ جەنگی یاخیبووان ئەنجامەکەی شکستی سەربازان و لە دەستدانی ورەی ئەوان و بەرزکردنەوەی ورەی عەشایرەکان دەبێ. لە بەرئەوە فەرمانی دا تیپێکی نوێ لە 5 بەتالیۆنی پیادە، سێ یەکەی تۆپخانە، سێ بەتالیۆنی سوارە و یەك ستونی چەکدار پێکبێ و ڕووەو ئازەربایجان ببزوێ. لە هەمان کاتیشدا فەرمانی دا تا پێکڕای هێزە پەرت و بڵاوەکانی ئازەر بایجان بچنە ڕیزی ئەوانەوە . بەمجۆرە لە چوارگۆشەی ئێرانەوە هێزی کۆکردەوە، ئەم هێزە نزیك بە 8000 نەفەر دەبوو، فەرماندەی ئەم هێزە (ئەمانەڵلاخان جهانبانی) بوو، کە بە ئەزموونترین ئەفسەری ئەرکان بوو، خوێندنی نیزامی لە روسیادا تەواوکردبوو، ئەم سوپایە لە مانگی تەموزدا لە دەشتی (تاسوج)ی باکوری گۆمی ورمێدا جێگیر بوو، لە 23ی تەموزی 1922دا، کۆی هێزە کە بوونە دووستون و بەدرێژایی دوو دیووی زنجیرەچیاکاندا روە و سەلماس پێشڕەوییان کرد لەحاڵێکدا کە لە لایەن دەستەی سوارەوە، لە هەر دوولاوە دەپارێزران.

ئەم دوو ستونە لە کاتژمێر 8ی بەیانیدا لەلایەن هێزەکانی سمکۆوە هێرشیان کرایە سەر. ئیسماعیل ئاغا لەم کاتەدا نزیکەی 10000 چەکداری لە عەشایری کورد، لە مەهابادەوە تاقطور و ژمارەیەك کوردی تورکیاشی کۆکردبۆوە. لە بەرەبەیاندا کوردەکان چوار جار بەشێوەی پیادە ئێمەیان خستەبەر هێرش و پەلاماردان. لە باشوری (بزداغ)ەوە لە گاردی ڕیزی پێشەوەی ئێمەدا دزەیان کرد. لەم پەلاماردانەدا بە پێچەوانەی نەریتی ئاسایی شەڕی کوردەکانەوە بە شێوەیەکی بێپێشینە سوودیان لە چەکی گەرم وەرنەگرت ، بەڵکو بە شمشێر و خەنجەرەوە هەڵیان کوتایە سەرمان وهێرشیان

بۆ هێنـاین، ئـەم جـۆرە پەلاماردانـە لـە نێـو عەشـایردا بێپێشـینە بـوو، بەشێوەیەکی بەردەوام پاشە کشێیان پێدەکرا و ڕاودەنـران. هـەرچۆنێك بـێ، هەردوو لا لەم شەڕە ڕووبەڕوو ودەستەو یەخەیەدا زیانێکی قورسیان لێکەوت.
ئەوان دەیانویست لە دەرەیەکەوە ئەم هێرشە دەست پێبکەن کە مەودای 5 میل نێوانی ئەوان‌و بریگادی تەورێزی لێکجودا دەکردەوە. بەڵام ئەم ئوسکادرانەی کـە مـن فـەرماندەیم دەکـرد و زۆربـەیان پیـادە بـوون، لـەم کـەلێن و پەناوپەسێوانەدا سەنگەریان لێگرتبـوون، و ئـەوانیان دایـە بـەر دەسـتڕێژی ئاگری تفەنگ و کوردەکانیان ناچار بە پاشە کشێ کرد. لەم شەڕەدا تۆپخانەی کوردەکان لەلایەن تۆپچیانی تورکەوە ئیدارە دەکرا و بەچاکی کارەکەی ئەنجام ئـەدا بـەڵام خۆشـبەختانە زۆربـەی گوللـەکانی نەدەتەقییـەوە و بـەمجۆرەش زیـانێکی ئەوتۆی نەدەگەیاند. لـە کاتژمێر پێنجی پـاش نیـوەڕۆدا کوردەکـان کەوتنە پاشەکشێ‌کردن، لە ڕێگەی دووربینەکانی خۆمانەوە تۆپخانـەی ئـەوانم دەدی کـە لەسـەر پشتی بارگیر باردەکران وپاشـان بـە شـێوەیەکی چـاوەڕوان نەکراو پەرت و بڵاو بوونەوەو لە قوڵایی دەربەندودەرەکاندا دیارنـەمان. سوارە نـیزام، کەوتنـە تـاقیب کردنـی ئـەوان و لـەکاتی ئـەم تـاقیب کردنـەدا سـێ تۆپـی چیایی ئەوان کەوتە دەست هێزەکانی ئێمەوەو، تۆپچییەکانیشی بەدیل گیران، کە دواتر درانەوە بە دەوڵەتی تورکیا.

لە کاتژمێر 6ی پاش نیوەڕۆدا، پیادە نیزامی ئێمە چوونـە نێـو شـاهپورەوە کە دانیشتوانەکەی لە چەند هەزار کەسەوە ببوە چەند سەد کەسێك. لـە دەمـەو خۆرئـاوا بـوون وتـاریکی سـەر لـە ئێـوارەدا ، هـێزە دەهـەزار کەسـییەکەی کوردەکان هاتبووە سەر هەزار کەسی شوکاك کە لەژێر چاودێری خودی سمکۆ دا بوون، تەواوی هاوپەیمانەکانی پشتیان تێکردو گەڕانەوە سەر زەوی‌و زاری خۆیـان وداوای لێبوردنیـان لـە دەوڵـەت دەکرد بە بەهانـەی ئـەوەی کە سمکـۆ ئەوانی لە خشتە بردووە.

سمکۆ لە پاش هەڵهاتن بۆ نێو خاکی تورکیا، هەوڵیدا سەر لە نوێ بێتە خاکی ئێرانەوە، بەڵام لە شەڕێکی کورتدا تێکشکا و بە ناچار کشایەوە بەرەو تورکیا. کە لە وێدا چەك کرا و لە سنوورەکانی ئێران دوورخرایەوە. قەڵا و کۆشکەکەشی لە (چهریق)دا لەلایەن هێزی نیزامییەوە وێران کرا. لە ساڵی 1924 دا، سمکۆ لەلایەن دەوڵەتەوە بەخشرا لە ساڵی 1925یشدا لەلایەن ڕەزاشاوە پێشوازی لێکرا و سوێندی وەفاداری خوارد.

وێڕای هەموو ئەوانەش لە ساڵی 1926داو بێ هیچ بەهانەو هۆیەك خۆی لەگەڵ بەگزادەی هەرکی و مەرگەوەروتەر گەوەردا یەکخست و هێرشی کردە سەر دەشتی سەلماس، ویستی دەست بەسەر شاهپوردا بگرێ، بەڵام بەرپەرچی هێرشەکەی درایەوە. لەم کاتەدا هیچ هێزێك لە تارانەوە ڕەوانە نەکرا، بەڵام ڕەزا شا (ژەنڕاڵ شەیبانی) ناردە ئازەربایجان، تا سەرپەرشتی عەمەلیاتەکە بکات. شەیبانی چەند ئەفسەرێکیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو کەیەکێ لەوانە (ئیبراهیم ئەرفەع)ی برام بوو. سمکۆ گەمارۆی شاهپوری دا بەڵام هێزەکانی سوپای ئێران کە لە ورمێ، خوی، شەرەفخانەدا جێگیر بوون، بەتوندی لە باشوورەوە پەلاماری کوردەکانیان دا. هێزەکانی پادگانی شاهپوریش لە شاروە دەرکەوتن و بەهانای ئەوانەوەهاتن. لەم شەڕەدا کوردەکان زیانێکی قورسیان لێکەوت و بەرەو دوا کشانەوە و هەڵهاتن، سوارە نیزام و فڕۆکەش تا نزیکی سەر سنوور شوێن ئەوان کەوتن و ڕاونران.

لەم شەڕەدا بەندەرمەی سوپای تورکیاش، هاوکاری ئێمەیان کردو هەر لەگەڵ گەشتنی سمکۆ و هەڤاڵەکانیدا بۆ ئەو دیووی سنوور ئەوانیان گەمارۆ داو، لە پاش پێکدادانێکی کورت، بە ناچاری خۆیان دا بەدەستەوە، دەوڵەتی تورکیا لە پاش چەك کردنیان ئەوانی بۆ ناوخۆی تورکیا گواستەوە، سمکۆ چەند ساڵێکی ژیانی لە دوورخراوەییدا بەسەر برد و چەند ساڵێك بەدوای

ئەوەشدا ، لە پێکدادانێکی کورتدا لە نزیك شاری شنۆدا کوژرا.[62]

ئەو کاتەی ئێمە دووبارە دەستمان بەسەر شاری ورمێدا گرتەوە، گشت خەڵکی ورمێ لە شار هاتنە دەرو بە پێشوازیمانەوە هاتن. بەڵام تەنها چوار یا پێنج هەزارکەس لەدانیشتوانی بیست وپێنج هەزار کەسی ورمێ لە شاردا مابوونەوە، ئەم کەسانەش وەك داهۆڵی گەڕۆك دەهاتنە بەرچاو کە لە پەڕۆکۆنەوە پێچرابێتن، ئەوان بە شێوەیەکی دڕندانە کەوتنە بەر تالان وپەلاماردانی ئاسورییەکانەوە و نزیك بە سەد هەزار کەسیان لە تورکانی ئازەربایجانی کوشت. پاشان لەلایەن کوردەکانەوە تالان کران ودانیشتوانی نزیك بەسێ سەد گوند ڕەویان کردبوو، گوندەکانیشیان وێران کرابوو.

چەندین ساڵی خایاند تا دووبارە لەم ناوچانە دا خەڵکی نیشتەجێ بوونەوە و دەستیان بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵ و درەخت چاندن کردەوە، بەو شێوەیەی کە ئێستا ئێمە ئەو ئاوەدانییە لە دەوروبەری ورمێدا دەبینین.

ڕەنگە یاخیبوونی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ بە هەوەڵین هەوڵ و کۆشش دابنرێ کە کوردەکانی ئێران لە پێناو بە دەستهێنانی سەربەخۆیدا بەرپایان کردبێ. بەڵام ناکرێ بزاوت و ڕەفتاری سمکۆ بخرێتە خانەی جوڵانەوەیەکی ڕاستەقینەوە و لە چەمکێکی نوێدا دا بنرێ بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی کە گونجاوی هەلومەرج و بارودۆخی ئێستای دنیا بێت. بەڵکو ناوبراو لە بنەڕەتدا خولیا و تینووی تالان و کوشتاری خەڵکی بوو، لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی ئەم بەڵایە بەسەر خودی کوردەکاندا بێنێت، پەلاماری ئەو ناوچانەی ئەدا لە (سەلماس) و (ورمێ) و (خوی)دا، کە کورد نەبوون، لە ئاکامی ئەم پەلامارو هێرشانەدا، دانیشتوانی ئەم ناوچانە بە شێوەیەکی دیار و بەرچاو ڕووی لە کەمی کرد.

---

[62] –سمکۆ لە 1930/7/20دا، بە پیلانی دەوڵەتی ئێران کوژرا. (و)

## 2-ياخيبوونى كوردەكان لە ئوستانى كوردستاندا.

ڕووداوە گرنگەكانى سالّى 1926، كە لە باشوورى ئوستانى كوردستاندا ڕوويانداوە، چ پەيوەندييەكيان بە جموجوڵەكانى سمكۆوە نىيە. لەبەر ئەوەى كە بزربوونى ئەو كەسايەتييە ناسراوەى كە سەر هەواڵى سالّانى پێش جەنگى يەكەم بوو لە ئێراندا، لە يادى خەڵكيدا فەرامۆش كرابوو، سەرلە نوێ هاتەوە نێو مەيدانى ڕووداوەكانەوە، ئەم پياوە (سالار ئەلدەولە)[63] ى قاجارە كە لەسەرەتادا لە دژى محەمەد عەلى شا ڕاپەڕى وپاشان لە سالّى 1911شدا لە دژى ئەحمەدشاى قاجار شۆڕشى بەرپاكرد. هاوپەيمانەكانى، سەرانى هۆزە كوردەكان بوو كە ناوبراو لە ڕێگاى فرە ژنخوازييە وە لەگەڵ ئەواندا پەيوەندى بەستبوو. كاتێك پيلانەكانى ڕووبەڕووى شكست بۆوە، ناوبراو ڕوەو هەندەران هەڵهات و لە پاش چەند سالّێك هاتەوە عێراق و، بڕيارىدا لەگەڵ چەند هەڤاڵێكدا بێتە نێو خاكى ئێرانەوە. ئەم جموجوڵەى لە لايەن ئەفسەرێكى ئينگليزى چاودێرى سنوورەوە دەبينرێ، بەلاّم لەبەر ئەوەى فەرمانى دەستگيركردنى ناوبراوى پێنابێ، تەنها هەواڵەكە بە بەغدا دەگەيەنێت. سەر فەرماندەيى هێزى ئينگليزيش لە بەغدا، دەوڵەتى ئێرانى لەم جموجوڵە ئاگاداركردەوە. دواكەوتنى ئەم ئاگادار كردنەوەيە هەلى بۆ (سالار ئەلدەولە) ڕەخساند تا لەگەڵ سەرانى كوردا بكەوێتە گفتوگۆوە و زەمينەى ياخيبوون ئامادە بكات.

پياوى سەركەشى ئەو دەمى ئەم دەڤەرە، عەباس خانى سەردار ڕەشيد بوو كە گەلێك جار شۆڕشى لە دژى حكومەتە ناوچەييەكان هەڵدەگيرسان و ياخى

---

[63] -سالار ئەلدەولە: (1881-1959) سێهەم كوڕى موزە فەرەدين شاى قاجار بوو، لە 1905 دا كرايە والى كوردستان. چەندين جار بە پشتيوانى عەشيرەتە كوردەكان لە دژى دەوڵەتى مەركەزى شۆڕشى بەرپاكرد و ياخى بوو، لە شارى ئەسكەندەريەى ميسردا مرد. (و)

دەبوو، عەباس خان پاش بەسەر بردنی ماوەیەك لە دوور خراوەییدا، لەلایەن ڕەزا شاوە بەخشرابوو، ئەوکات لە نێو زەوی‌و زارەکانی خۆیدا لە (ڕەوانسەر)دا ژیانی بەسەر دەبرد ، لەم کاتەدا زەمینەی بۆ یاخیبوونێکی نوێ ڕێکخستبوو ، هەموو کوردی بانگهێشت کردبوو بۆ یەکبوون و خەبات کردن لە دژی دەوڵەت و پشتیوانی کردن لە (سالار ئەلدەولە). دەستەیەکی سوارە نیزامی ئێرانی لە نزیکی ڕەوانسەر دا لە لایەن کوردەکانەوە هێرشی کرایە سەرو زیانێکی قورسی لێکەوت، هۆزەکانی نیشتەجێی بانە، سەقز، سەردەشت، گوریك، سوسنی، پشدەری، ملکاری یاخیبوون‌و کەوتنە پەلاماردانی بنکە دەوڵەتییەکان ومەخفەرەکانی ژاندارمری. شاری سەردەشت لە لایەن یاخیبوانەوە کۆنترۆڵ کراوبینا دەوڵەتییەکان ئاگریان تێبەردرا. لە ناوچەکانی باشوریشدا هۆزەکانی مەریوان و هەورامان بەسەرکردایەتی (مەحموود خانی‌کانی سانانی) و(مەحموود خانی دزلی) و(جەعفەرسانی هەورامی) یاخی بوون و چوونە پاڵ هێزی (سالار ئەلدەولە)وە، تەنانەت (شێخ مەحموودی حەفید)یش کە لەم کاتەدا بە هۆی جەنگ و دژایەتی کردنی ئینگلیزەکانەوە پەنای هێنابووە بەرئێران ولە مەریواندا بوو، پشتگیری مەعنەوی خۆی بۆ (سالار ئەلدەولە) ڕاگەیاند. شێخ مەحموود لە بنەماڵەی سادات و شێخەکانی بەرزنجەیە کەلە شەجەرەی نەسەبدا دەگاتەوە بە ئیمام موسای کازم. شێخ مەحموود نە تەنها ڕابەرێکی ئایینی بەڵکو فیودالیکی گەورە و خاوەن زەوی‌و زارێکی فراوان بوو، خاوەن دەسەلاتێکی گەورەش بوو لە شاری سلێمانیدا کە زۆربەی زەوی‌و زارەکانی ئەو ناوچەیە موڵکی خۆی بوو، تەنانەت لە کوردستانی ئێرانیشدا خاوەنی موڵك و زەوی وزار بوو.

هۆزە یاخی بووەکان بەرەو سنە (مەرکەزی ئوستانی کوردستان) پێشڕەوییان کرد، کە لە هەردوو لای باکورو باشورەوە ڕێگای هاتوچۆی نێوان ئەو شارەیان لەگەڵ سەقزو کرماشاندا کۆنترۆڵ کرد، بەڵام ڕێگای هاتوو چۆی

نێوان سنەو هەمەدان کۆنترۆڵ نەکرابوو( ئەو ڕێگایەی کە لەم دواییەدا بۆ هاتوچۆ کردنی ئۆتۆمۆبێل بەکارهێنرا)، لە ماوەی 48 کاتژمێردا (فەوجی پیادەی نادری) لەم ڕێگایەوە چوونە ناو شارەوە و بەدوای ئەوانیشدا دوو بەتالیۆنی سوارە نیزام ڕەوانەکران. لە سێپەتەمبەری 1926دا، هێزەکانی تەورێزیش بەرەو کوردستان حەرەکەتیان کردو سەرلە نوێ دەستیان گرتەوە بەسەر بانە و سەردەشتدا. لە ناوچەی جوانڕۆو ڕەوانسەردا (سەردار رەشید) لەلایەن هێزی کرماشان و سنەوە هێرشی کرایە سەر و سەرەنجام لەگەڵ (سالار ئەلدەولە) دا بەرەو عێراق هەڵاتن. سەرانی گشت عەشیرەتەکانی دیکەش خۆیان دا بەدەست هێزەکانی دەوڵەتەوەو داوای لێبووردنیان کرد و دووبارە ئارامی و ئاسایش گەڕایەوە بۆ ئەم ناوچانە، بەڵام ڕەزاشا بڕیاری دا بۆ یەکجارەکی کوردە یاخیبووەکانی سەرسنوور بگێڕێتەوە بۆ ژێر ڕکێفی دەوڵەت. بۆ ئەم مەبەستەش فەرمانی چەك داماڵینی گشتی داو دەستیکرد بە دامەزراندنی فەرمانگەو ئیداراتی دەوڵەتی لەو ناوچانەدا. ئەو هێزانەی لە تارانەوە ڕەوانەکرابوون لە هەمەداندا جێگیر بوون، تا خۆیان بۆ عەمەلیاتی وەرزی بەهار ئامادەبکەن. هەر لەم کاتەدا بریگاردێکیش لە سنەدا جێگیر بوو.

ژەنراڵ (عەبدوڵلاخان ئەمیر تەهماسپ)ی وەزیری جەنگی پێشوو بە مەبەستی وتووێژکردن لەگەڵ سەرانی کوردا لە تارانەوە ڕەوانەکرا، تا ئەوان ناچار بە خۆبەدەستەوەدان و لایەنگری کردن لە دەوڵەت بکات. ناوبراو توانی سەرکەوتووانە چەندین خێڵ وعەشیرەت لە دژی هەندێك لە سەرۆکە یاخیبووەکانی کورد یەکبخات. ئەوانەش کە تەسلیم بە دەوڵەت بوونەوە بریتی بوون لە جەعفەر سانی هەورامی و مەحموودخانی دزلی و ژمارەیەك لە هۆزەکانی دەوروبەری بانە. بەڵام مەحمود خانی کانی سانانی (کە پەنای بردبووەبەر شێخ مەحمود)، لەگەڵ کوردەکانی ڕازاو دا لە هەوراماندا لە حاڵی سەربزێوی و یاخیگەریدا مانەوە.

لەحوزەیرانی 1927دا، هێزەکانی تاران لە هەمەدانەوە بەرەو سنەو لەوێشەوە بەرەو مەریوان حەرەکەتیان کرد . لەم کاتەدا مەحموود خانی دزلی لەبەری ڕۆژئاواوەو محەمەد ئەمینی لهۆنی کوڕی جەعفەر سانیش لەبەری باشوورەوە هێرشیان کردە سەر عەشیرەتە یاخیبووەکان. هێندەی نەبرد محەمەد ئەمینی لهۆنی دەستی لە هێرش وپەلاماردان هەڵگرت و بەبێ لایەنی بەرەو نەوسود گەڕایەوە، نزیکەی 2500نەفەر لە هێزەکانی دەوڵەت لە کەژوکێوە بەرزەکانەوە پێشڕەوییان کردو لە پاش ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هەندەك بەرهەڵستی لاوازوبێبایەخدا سەرەنجام دەستیان گرت بەسەر مەریواندا. شێخ مەحموود گەڕایەوە بۆ عێراق ومەحموود خانی کانیسانانیش دەستگیر کراو بەدیلی برایە تاران. جگە لە پێکدادانێکی کورت کە لە نزیکی (ڕازاو) دا ڕوویداو منیشی تیادا بەشدار بووم، پێشڕەوی ئێمە بە بێ بەرەنگاری و جەنگ و خوێنڕێژی بەڕێوەبرا.

ئەم شەڕانە لە بنەڕەتدا لەگەڵ ئەو شەڕانەی کە لەدژی سمکۆ و کوردەکانی ئازەربایجان دا ئەنجام درا، شایەنی بەراوردکردن نەبوو. لەبەر ئەوەی کوردەکانی ئەم مەڵبەندە لە پێناو سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمی کوردا نەدەجەنگان. بەڵکو ئامانجی ئەوان پاراستنی دەسەلاتی ناوخۆیی خۆیان بوو. بەهەرحاڵ، لە کۆتایی ئەم شەڕانە دا یاخیبووەکان جگە لەوانەی کە لەگەڵ ئێمەدا هاوکارییان کردبوو، هەموویان چەك کران. بەڵام مەحموود خانی دزلی ئامادە نەبوو چەکەکانی تەسلیم بە دەوڵەت بکاتەوە، تا لە دیسەمبەری 1930دا، لە پاش هێرشێکی لەناکاو کە لە نیوە شەودا لە لایەن تیپی سنەوە ئەنجام درا، ناوبراو. تێکشکاو بەرەو عێراق هەڵات. جەعفەر سان کە زیاتر خۆڕاگری و بەرهەڵستی کرد، لە پاش جەنگێکی سەخت لە ملەی (شمشێر)دا لەلایەن هێزی ڕەوانە کراوی کرماشانەوە بە فەرماندەیی کۆلۆنێل ڕەزم ئارا (کە پاشان بووە سەرۆك وەزیرو سەرەنجام تیرۆرکرا) ڕووبەڕووی شکست بۆوە.

بەرەو عێراق هەڵات.

لە پاش ئەم ڕووداوانە تەنها جەنگی سەختی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ کوردەکاندا، لە ناوچەی ماکۆدا لە دژی هۆزەکانی جەلالی، ڕوویدا. لەم عەمەلیاتەدا یەکەکانی سوپای تورکیاش هاوکارییان کردین لە 1930-1931دا.

## 3- یاخیبوونی محەمەد ڕەشیدخان

(یەکەمین یاخیبوونی کوردەکانی ئێران لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا).

داگیرکردنی ئێران لە لایەن هێزەکانی سۆڤیەت و بەریتانیاوە بووە، هۆی لە شیرازە چوونی ئۆرگانیزمی سەربازی سوپای ئێران ولاوازی دەوڵەتی مەرکەزی لە کۆنترۆڵ کردنی ئەم ناوچە داگیرکراوانەدا. سەربازانی سوپاش بەهۆی ئەو فەرمانە هەڵەیەوە کە (ژەنراڵ ئەحمەد نەخجەوان) ڕایگەیاند بوو، بە توندی ڕوحییەی خۆیان لەدەستدا، هەرچەند لە ماوەیەکی کورتدا ئەم فەرمانە چاکسازی کرا، بەڵام ئیدی گەلەك درەنگ بوو. کاتی ئەوە بەسەر چووبوو کە بتوانێت ئەوان بگێڕێتەوە بۆ خزمەتکردن، بە تایبەتی لە ناوچەیەکی خێڵەکی وەك کوردستاندا.

کوردی ناوچە سنوورییەکان بە یارمەتی ئەو کوردانەی کە لە عێراقەوە هاتبوون، پەلاماری سەربازخانەو بنکەکانی ژاندار مریياندا وچەکیان کردن، بەمجۆرە چەکێکی زۆر کەوتە دەست عەشیرەتەکانەوە. سەربازخانەی (خوبانی) لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە داگیرکراو سەربازەکانیشی بەدیل گیران وئەفسەرەکانیشی ڕەوانەی باکورکران. ئەوان شاری (سنە)شیان بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك داگیرکرد، بەڵام بەهۆی ڕێکەوتننامەی (سۆڤیەت - بەریتانیا)وە سەبارەت بەدابەشکردنی ناوچە داگیرکراوەکان، لەوێدا پاشەکشێیان کرد و هێزەکانی ئینگلیز کە لە تیپێکی (مۆتۆریزەی هندی)

پێکهاتبوون شاری سنەیان داگیرکرد.

هەر لەگەڵ چوونە دەری سوپای سۆڤیەت لە بانەدا،( محەمەد رەشید خان)، یەکێك لەسەرانی کوردی بانە، کە لەزەوی و زارەکانی خۆیدا لە (وێنەو دارۆخان)دا لە نێو سنووری عێراقدا ژیانی بەسەردەبرد، لەگەڵ چوارسەد چەکداری سوارەدا هاتە نێو خاکی ئێرانەوە. لە پاش دوو ڕۆژ شەڕکردن لەگەڵ ژمارەیەك لەسەربازانی ئێراندا کە ئەرکی پاراستنی سەربازخانەی بانەیان لەئەستۆدابوو، دەست بەسەر بانەداگیرا. لەم کاتەدا هۆزەکانی مەریوان، کە لە لەلایەن کوردی عێراقەوە لە ناوچەی پێنجوێن دا پشتیوانییان لێدەکرا. لەسنووری (باشماخ)ەوە هێرشیان کردو ئەو ناوچەیەیان داگیر کرد. سەربازخانەی مەریوان وسنەش کە بە هۆی هێرشی روس و ئینگلیزەکانەوە لەبەریەك هەڵوەشابۆوە، بووە هۆی ئەوەی کوردەکان بەبێ بەرەنگار بوونەوە بچنە ناو مەریوانەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی سنە لە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئینگلیزدا بوو، نەیانتوانی بەرەو ئەوێ دزەبکەن، لەم کاتەدا ژەنراڵ (مەحموود ئەمین) کرا بە فەرماندەی نیزامی سنە، کە پیاوێکی چاپوك‌و چالاك بوو. فەرماندەی گشتی هێزەکانی ڕۆژئاوا (ژەنراڵ مقدم)، هێزێکی لە ژێر فەرماندەیی کۆلۆنێل (ئیبراهیم ئەرفەع) ی برامدا بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنەوەی دووبارەی بانەو سەقزدا ڕەوانە کرد، کەئەم هێزە لەسێ گوردانی پیادە و 6 زرێپۆش پێکهاتبوو. لەپاش داگیرکردنی سەقز بەرەوبانە کەوتەڕێ، بەڵام لە نێوانی ڕێگـادا لەلایەن دووهەزار چەکداری هێزی عەشایرەوە بەسەرکردایەتی محەمەد رەشید خان گەمارۆدران. بەهۆی ناهەمواری ڕێگاو ڕوخانی پردی تەختەی نێوان ڕێگاوە 5 زرێپۆش لەدەست دران‌و، هێزەکە ناچار بە پاشەکشێ‌و گەڕانەوە بۆ سەقزکرا. بەشێك لە هێزی پیادە نیزامیش بە دیلی کەوتە دەست کوردەکانەوە. بەڵام براکەی من‌و ژمارەیەك لە هێزەکە لە پاش چەند ڕۆژ پیادەڕەوی توانیان خۆیان بگەیەننە

ناوچەی (ئێرانشا)، پاشان خۆیان گەیاندە دیواندەرە. لە وێشدا لەلایەن هەزار چەكداری هێزی محەمەد رەشیدەوە گەمارۆدران. كە عەشایری ئەردەلان و وەكیلی سەقزو رەسوڵ ئاغا و عەلی ئاغا وجوانمەردی گوریك وسلێمان جاف، چووبوونە رِیزی ئەوانەوە . لە كاتێكدا براكەی من تەنها 170 سەربازی لەگەڵدا بوو، وێرای ئەوەش توانی پاشە كشێ بە كوردەكان بكات، لەم پێكدادانەدا دووكەس لەسەركردەكانی كورد كوژران و رەسوڵ ئاغاش بریندار كرا، عەشایر بە بینینی ئەم بەسەر هاتە هێزوتینی خۆیان لەدەستداو بەرە وسەقز كشانەوە، بەڵام لەرِێی گەرِانەوەدا لەلایەن عەشیرەتی تیلەكۆوە بەسەركردایەتی (عەلیخان حەبیبی) كە بە هانای هێزەكانی دەوڵەتەوە هاتبوو، بەتەواوی پەرتەوازە بوون و تەفروتوناكران.

لەپاش ئەم رِووداوانە براكەم چووە كرماشان و كرابە سەرتیپی 12ی سوپا و بەمەبەستی دامركاندنەوەی یاخیبوونی عەشایری (لورِ) بەرەو ئەو ناوچەیە حەرەكەتی كرد و (سەروان ئەمین) كرا بە فەرماندەی هێزەكانی كوردستان. لەبەرئەوەی كوردەكانی ژێر فەرماندەیی محەمەد رەزا مەریوانیو مەحموود خانی كانیسانانی ، محەمەد رەشیدی ئالمانە، محەمەد عەلی موورادی گەڵباخی. عەلی وەلی جاری فەرەج كرمانی، ئەجلالی گمبساری، مەحموود لهۆنی بەرەو سنە پێشرِەوییان كرد.

ژەنرِاڵ ئەمین كە تازە گەشتبووە سنە بە مەبەستی وتووێژكردن لە گەڵ ئەواندا حەرەكەتی كرد. ناوبراو لەلایەن كوردەكانەوە دەستبەسەر كرا، بەڵام لە پاش چەند كاتژمێرێك ئازاد كرا. ئەم ئازادكردنە لەسەر خواستی ئەفسەرانی ئینگلیزی نیشتەجێی سنەدا ئەنجام درا ، هەر لەم كاتەدا كوردەكان داوای سەربەخۆیی كوردیان كردو لەپاش دە رِۆژ ، لەلایەن بەرپرسانی ئینگلیزی نیشتەجێی سنەوە وەڵامیان پێدرایەوە كە پێویستە لەم بارەوە لەگەڵ سەرفەرماندەیی باڵای نیشتەجێی بەغدادا گفتوگۆ بكرێت.

جێگیر کردنی هێزی ئێران لە سنەدا بووە هۆی ڕێگرتن لە هێرشی کوردەکان بۆ ئەو شارە و لەپاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك، هێزی عەشیرەتەکان کە لە کاری خۆیاندا پشوودرێژ نەبوون وبەڵگەیەکی یاسایشیان بۆ کارەکانی خۆیان پێ نەبوو، دەوروبەری شاریان بەجێهێشت ودیارنەمان. لە مانگی نۆڤەمبەردا ژەنڕاڵ ئەمین هێزەکانی خۆی بەمەبەستی جەنگی دژ بە عەشایر بەرەو دیواندەرە حەرەکەت پێکرد. لە پاش شەڕێك کە لە گوندی (زاغە)دا ڕوویدا، مەحمەد رەشید پاشەکشێی پێکراو ئەویان لە دیواندەرە دا دەرپەڕاندو ڕەوسەقز پێشڕەوییان کرد.ئەم شارەش لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە دەستی بەسەردا گیرا ، بەڵام ژمارەیەك کورد کە پێشتر خۆیان لە نێو خانووەکاندا حەشار دابوو دەستیان کرد بە تەقە و دەسترێژکردن لە هێزی سوپاو لە دەرەوەی شاریشەوە هێزەکەی محەمەد رەشید خان سەربازەکانی دایە بەر هێرش و پەلاماردان. لە ئاکامی ئەم پەلامارەدا خودی ژەنڕاڵ ئەمین و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازانی سوپا کوژران. (عەلی خان حەبیبی)ش کە لەگەڵ ژمارەیەك لە دەست وپێوەندی خۆیدا بەهانای هێزەکانی دەوڵەتەوە هاتبوو، دیسان لەم شەڕەدا کوژرا.

لەپاش کوژرانی ژەنڕاڵ ئەمین، کۆلۆنێل (ئیبراهیم ئەرفەع) لە شوێنی ئەو، ئەرکی فەرماندەیی سوپای لە کوردستاندا لە ئەستۆ گرت. ئەو سەر لە نوێ ڕیزەکانی سوپای ڕێکخستەوەو دووبارە لە سنەوە ڕوەو سەقز حەرەکەتی کرد. لە دیواندەرە دا، محەمەد خان حەبیبی وپیاوانی عەشیرەتی تیلەکۆیی کە دەیانویست تۆڵەی سەرۆکی خۆیان بسێننەوە هاتنە ڕیزی هێزەکەی ئەوەوە . کوردەکانی مەریوانیش کە هەوڵەکانیان بەمەبەستی داگیرکردنی سنە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بێ ئاکام مابۆوە، چیتر باسی سەربەخۆیی کوردیان نەکردو تەنانەت ئامادەش بوون لەگەڵ براکەمدا هاریکاری بکەن وبۆ ئەم مەبەستەش نوێنەرێکیان ناردبوو.

لەم کاتەدا فەرمان بە منیش درا بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە هەلو مەرج و بارودۆخی ئەو ناوچەیە لە تارانەوە بەرەو سنە حەرەکەت بکەم، لەپاش گەشتنم بە سنە، لەتەك ئەو نوێنەرەدا بەرەو سەقز جولاّین. لە نێوان، ڕێگادا ناوبراو باسی ئەمەکداری خۆی دەکرد سەبارەت بەشا و ئێران وایدەردەخست کە یاخیبوون و جموجۆڵەکانیان بە هاندانی بێگانە بووە و ئاماژەی بەوە دەکرد کە ئەوان ئامادەن لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتدا هاریکاری بکەن و لەشەڕی دژ بە محەمەد ڕەشید خان دا بەشدار بن، بۆ ئەم مەبەستەش داوای دەکرد بڕێك چەك وکەرەسەی شەڕیان پێبدرێ. لێرەدا کە دەمزانی بە خۆیان بڕێکی زۆر چەکیان پێیە، پێموابوو کە مومکینە ئەم باس و خواسە بە مەبەستی کات بەسەر بردن بێت، تا ببینن سەرەنجام کام لایان سەردەکەون و بچنە پاڵ ئەو لایەوە، بەلاّم لەم بارەوە هیچم نەگووت و ستایشی هەستی شاویستانە و نیشتمان پەروەرانەی ئەوم کرد و دڵنیاشم کردەوە کە خزمەتەکانی ئەو لەلای دەوڵەت فەرامۆش ناکرێ و بە بایەخەوە گرنگی پێدەدرێ. لەکاتی هێرشی هێزی دەوڵەتدا بۆ سەر گوندی (سونەتە)، گەشتینە ئەو شوێنە و ئەمنیش لەم شەڕەدا بە شداریم کرد و هێندەی نەبرد هێزەکەی محەمەد ڕەشید (حەمە ڕەشید خان) بەسەختی تێکشکا و کوردەکانی تیلەکۆیی ڕژانە نێو ئاواییەوە و دەستیان کرد بە تالاّن و بڕۆی دوژمنەکانی خۆیان. لەم ڕووداوەدا لە جلوبەرگ و سەروکلاّوی ژنانەوە بگرە تا سەماوەرو قۆری هەمووی بە تالاّن برا، من گەلەك هەوڵمدا ڕێ لەم کارانە بگرم، بەلاّم مەخابن نەمتوانی، ئەوان وایان لەمن گەیاند کە ئەم ڕووداوانە بە شێکە لە ڕەفتارو نەریتی باوی عەشایر لە کاتی شەڕکردنیان لەگەڵ یەکدیدا.

لە مایسی 1942 دا، کۆلۆنێل ئەرفەع بەدوو هەزار سەرباز و چواردە تانك و ژمارەیەك لە عەشیرەتی تیلەکۆوە، ڕوەو سەقز حەرکەتی کرد. لەم هێرشەدا هێزەکەی محەمەد ڕەشیدی تێکشکان و بەرەو بانە پێشڕەوی کرد. لەوێدا لە

لایەن فەرماندەی لەشکری نوێوە (ژەنراڵ شابەختی)ەوە، فەرمان بە کۆلۆنێل ئەرفەع درا کە پێشڕەوی ڕابگرێ و بەمەبەستی ڕێکەوتن لەگەڵ محەمەد ڕەشیدا بکەوێتە وتووێژکردن.

(میجەر فلتچەر)ی ئینگلیزیش لە کرماشانەوە گەشتە سەقز تا لەم وتووێژانە دا وەك چاودێر بەشدار بێت، لە پاش کۆتایی هاتنی وتووێژەکان، محەمەد ڕەشید کرا بە فەرمانداری بانە و ڕێگەیان پێدا بە چەکداری بمێنێتەوە و پۆلیس و سوپای ئێرانیش لە بانە و سەردەشت دا بچنە دەر.

لە پاش ماوەیەك کۆلۆنێل ئەرفەع بۆ پلەی ژەنراڵی بەرزکرایەوەو کرا بەفەرماندەی لەشکری دووەمی تاران و ژەنراڵ (هۆشمەندی ئەفشار) لە شوێنی ئەو بووە فەرماندەی لەشکری کوردستان.

لە هاوینی 1942دا، دووبارە بانە کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی دەوڵەت و تا ئێستاکەش لەژێر سایەی هێزەکانی دەوڵەتدایە.

## 4-کۆماری مەهاباد 1945-1946

پاش داگیرکردنی باکوری ئێران لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە، دەستبەجێ کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتە ژمارەیەك سەرۆك هۆزی کوردو کەسایەتی بە نفوزیان بۆ سەردانی ئازەربایجانی سۆڤیەت داوەت کرد. ئەم میوانانە بە شەمەندەفەر برانە باکۆو لەلایەن باقرۆفی[64] سەرۆك وەزیری ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە پێشوازییان لێکرا. پاشان ئەوانیان بۆ دیتنی پالاوگەکانی نەوت و گشت سەنتەرەکانی پیشەسازی ئازەربایجانی سۆڤیەت برد. (هەرچەند دوای ڕوخانی کۆماری مەهاباد زۆر لەم کەسایەتیانە لە ترسی سزادان، نکۆڵییان لەم بەسەرهاتی گەشتەیان دەکرد). پاشان کاربەدەستانی سۆڤیەت

---

[64] -باقرۆف: سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست و دیکتاتۆری ئازەربایجان بوو لەسەردەمی ستالیندا، لە پاش مەرگی ستالین گوللە باران کرا لە 1953دا. (و)

پێکهێنانی هەرێمێکی کوردنشینەوە لەگەڵ ئەواندا کەوتنە گفتوگۆ و بەڵێنی ئەوەیان پێدان کە بەهەموو هێزەوە پشتیوانییان لێبکەن. بەڵام دواتر بەهۆی رێکەوتننامەی روس و ئینگلیزەوە، سۆڤیەتەکان بەکردەوە بەرگرییان لە خەباتی کورد نەکرد، چونکە هەردوولایەن لەسەر ئەوە پێکهاتبوون دەست نەخەنە نێو کاروباری ناوخۆی ئێرانەوە.

ئەم میوانانە زۆربەیان لەسەرۆك هۆز و فیودال و ئاغاکان بوون و لە تێڕوانینی رێبازو ئایدۆلۆژی سۆڤیەتەوە بە کەسانێکی جێی بڕواو بەمتمانە دانە دەنران. بەڵام ئەوان نەیاندەویست لەو ساتەوەختە دا خۆیان لە کاروباری ناوخۆیی ئەو ناوچە پڕلە کێشەیەوە بگلێنن.

ئەم میوانانە بریتی بوون لە (قازی محەمەد) قازیو یاساناسی مەهاباد، حاجی بابە شێخ، عەبدوڵلا ئیلخانی زادەی بۆکان، رەشید وتەها هەرکی، موساخانی زرزا، حاجی قەرەنی ئاغا، کاکە هەمزەی مامەش، سەید محەمەد سادقی کوڕی سەید تەهای نەوەی شێخ عوبەیدوڵلا، پاش بەسەر بردنی دوو حەفتە لە ئازەربایجاندا گەڕانەوە مەهاباد. پێئەچێ سیاسەتی سۆڤیەت لەو کاتەدا سەبارەت بە کورد ڕەوشێکی ڕوون ودیاریکراوی نەبووبێ، چونکە چەند دیدو بۆچوونێکی جیاواز دەربارەی ئەم مەسەلەیە لە کایەدا بوو، لە تێڕوانینی سیاسەتی گشتی دەوڵەتی سۆڤیەتەوە، بەدیهێنانی دەوڵەتێکی کوردی کە لە کوردەکانی (عێراق- ئێران- تورکیا) پێکبهاتایەو پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا هەبوایە، دەیتوانی بە شێوەیەکی کاریگەر دەوڵەتانی هاوسێی سۆڤیەت (ئێران- - تورکیا-عێراق) لاوازو بێهێز بکات کە لایەنگری رۆژئاوا بوون، بەمجۆرە رێگایەك بۆ نفوزی سۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئاوەڵادەبوو، بەڵام لە گۆشە نیگایەکی دیکەوە ئەو ناوچە کوردنشینانەی کە هێشتا بەدەر لە نفوزی روسەکاندا بوون، پێدەچوو خواستی سەربەخۆخوازیی هاوکۆکی سۆڤیەتیان نەبێ و تەنانەت بکەونە ژێر

کاریگەری نفوزی دەسەڵاتی ڕۆژئاواشەوە، چونکە ئەو کات بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئەو مەڵبەندە کوردنشینانە لەدەست ژمارەیەك موڵکدار و سەرۆك هۆز و رابەری ئایینیدا بوو، کە بیرو بۆچوونی پارێزکارانە و تەنانەت کۆنە پەرستانەشیان هەبوو، لە نفوزی سۆڤیەت بەدگومان و لە برەودان بە بیروباوەڕی کۆمەنیستیش لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان نیگەران بوون. هەروەها سۆڤیەتەکان ئاگاداری ڕکە بەری و دوژمنایەتی نێوان کوردەکان و تورکەکانی ئازەربایجان بوون، کە دەکرا ئازەرییەکان بە هۆی کولتوری هاوبەش و هاوزمانی و میللییەوە لەگەڵ تورکانی ئازەربایجانی سۆڤیەتدا یەکبخرێن، ئەم دوژمنایەتییە هەر لەگەڵ هەرەسهێنانی دەسەڵاتی نیزامی ئێراندا، بەهۆی داگیرکردنی وڵاتەوە لەلایەن هێزی بێگانەوە، بە خێرایی لە ئازەربایجاندا سەریهەڵدا.

هۆزەکانی شوکاك و هەرکی، هەر لەگەڵ وەدەستهێنانی ئەم ئازادییەدا هێرشیان کردە سەر گوندە تورك نشینەکان و کەوتنە تاڵان و بڕۆو کوشتاری خەڵکەکەی، دیارترین ئەنجام دەرانی ئەم تاڵان و بڕۆیە بریتی بوون لە(زیرۆ بەهادری، رەشید و کامیل بەگی هەرکی، پیاوانی خێڵی مەرگەوەر، عومەر ئاغای مەمدەوی شوکاك، تاهیرو مەحموودی عەبدەوی شوکاك، نوری بەگی هەرکی، محەمەد حسێنی بەگزادە، ئەزمەحالی مەرگەوەر) کە بیرەوەری ڕۆژگاری ئیسماعیل ئاغایان لە هزردا زیندووکردەوە. کونسوڵی روسیاش لە ورمێدا ڕێی لە ئەنجامدانی ئەم کارەی ئەوان نەگرت.

لە شاری مەهابادیشدا کە لە ژێر دەسەڵاتی روسەکاندا بوو، بە هۆی ئامادەنەبونی سوپای ئێرانەوە، گشت کارمەندانی غەیرە کورد دەرپەڕێندران و کەسانی کورد لە چینەکانی ناڤین شوێنی ئەوانیان گرتەوە. بە ڕەزامەندی هێزی داگیرکەری سۆڤیەتیش (ئەمیر ئەسعەد) سەرۆك هۆزی دێبوکری بە فەرمانداری مەهاباد دانرا، ئەم دانانە تەواو سەرزارەکی بوو. لەبەر ئەوەی

سەرۆك هۆزەکانی مەنگوڕ، مامەش، پیران، گوریك، زرزاو، تەنانەت زۆر لە سەرۆك تیرەکانی دێبوکریش بەرامبەر بەم دانانە نەیارو ناڕازی بوون، لەبەر ئەوەی ئەو پیرو پەککەوتەو توانای بەڕێوەبردنی ئەم مەڵبەندەی نەبوو. بەمجۆرە بە هێوری دەسەلات کەوتە دەست ژمارەیەك لە کوردەکانی نیشتەجێی شاری مەهابادەوە. لە سێپتەمبەری 1942دا، ژمارەیەك لە ڕۆشنبیری خەڵکی مەهاباد ڕێکخراوی (کۆمەڵە) یان دامەزران، ئەم ڕێکخراوە بە شێوەیەکی پوخت تایبەت بەو مەڵبەندە بوو، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لە گەڵ حیزب و ڕێکخراوە کوردییەکانی دیکەی وەك (خۆیبون) و(هیوا) دا نەبوو. بەرنامە و ئامانج لە دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردنشینی ئێران و پاشان دامەزراندنی کوردستانی گەورە بوو. بۆ ئەم مەبەستە ئەوان بڕیاریاندا کە لە سەرەتادا بە کۆمەکی ڕوسەکان ئەم ئامانجەی خۆیان بە ئاکام بگەیەنن و، قۆناغی دواتریش بە هەلومەرجی جیهانی و ڕەوتی ڕووداوەکان بسپێرن.

لە ساڵی 1943دا، دەوڵەتی ئێران سەروانێکی لەگەڵ یاریدە دەرێکی کوردا بەمەبەستی چاودێری کردنی کاروباری ئاسایشی مەهاباد، ڕەوانەی ئەو شارە کرد، (ژەنراڵ هۆشمەندی ئەفشار) فەرماندەی گشتی هێزی ڕۆژئاواش بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە بارودۆخ و هەلو مەرجی ئەو مەڵبەندە، گەشتە ئەوێندەر. لەم کاتەدا هێزی دەوڵەتی ئێران لە مەهاباددا، تەنها بریتی بوو لەیەك بنکەی شارەوانی بە 14 نەفەر پاسەوانەوە. لەبەر ئەوەی ڕوسەکان مۆڵەتی هاتنی سوپای ئێرانیان بۆ مەهاباد نە ئەدا. هەرچۆنێك بێ مۆڵەتیان دا بە ژەنراڵ هۆشمەندی ئەفشار کە چەند کاتژمێرێك لە مەهاباد دا بمێنێتەوە، بەلام کاربەدەستانی ئاسایش هەر لەگەڵ چوونە نێو شارەوە ناچارکران کە ئەو شارە بەجێبێڵن.

لە مایسی 1943دا، ژمارەیەك لە خەڵکی مەهاباد هێرشیان کردە سەر

شارەوانی و لە پاش پێکهەڵپژانێکی کورت، شارەوانییان وێران کرد و ژمارەیەك پۆلیسیشیان کوشت و بەمجۆرە دوا نیشانەی دەسەڵاتی ئێران لە مەهاباددا کۆتایی هات.

بەر لەم ڕووداوانە لە ساڵی 1942دا، کاربەدەستانی سۆڤیەت مۆڵەتیان بە دەوڵەتی ئێران دا کە دووبارە هێزی ئاسایشی خۆی لە ئازەربایجاندا دابمەزرێنێتەوە. ئەم هێزە لە ژاندارمری، پۆلیس و سوپا پێکهاتبوو، هێزی سوپا لە سێ تیپی لەشکری سێهەم پێکدەهات کە لە تەورێزو ورمێو ئەردەبیل دا جێگیر بوو، هەر تیپێك لە یەك گوردانی پیادەو لە سێ گوردانی سوارە پێکدەهات و زۆربەشیان سەرباز وەزیفەی تازەکاربوون، گوردانی ورمێ خاوەنی دوو تۆپی چیایی و شەش زرێپۆش و چەند گروهانی ژاندارم بوو، یەکێ لە گوردانەکانی تەورێزیش لە میاندواو دا ڕووبەڕووی شاری مەهاباد جێگیر بوو.

لەوکاتەدا من وەك سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئێران، ناچار بە بەڕێوە بردنی ئەم یەکە جیاوازانە بووم لە ناوچەیەکدا کە بەشێکی لە ژێر دەسەڵاتی ڕوسەکان و بەشێکیشی لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا بوو. ئەم ئەرکەی من گەلەك حەساس و پێویستی بە پەیوەندی بەردەوام بوو لەگەڵ باڵوێزانی سەربازی ئەو دوو وڵاتەدا، پەیوەندی من لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بە هۆی ئەو دۆستایەتییە کۆنەی کە لەگەڵ ژەنراڵ ئەتاشەی ئەو وڵاتەدا (مێجەر ژەنراڵ فراستەر) وئەو پەیوەندییە ئاساییەی لەگەڵ باڵوێز (سێر ریدەر بولارد) و ئەندامانی ئەرکانی فەرماندەیی ئەواندا هەمبوو، داخوازییەکانی ئێمە بە لێکحاڵی بوونی بەرامبەر چارەسەر دەکرا. ئینگلیزەکان دەیانزانی کە جێگیر بوونیان لە ئێراندا کاتییە، ڕێی هەرجۆرە دەستێوەردانێکیان بە ئێمە ئەدا کە کارەکانمان لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بەڕێوە بەرین. بەڵام لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی ڕوسەکاندا هەلومەرج بە پێچەوانەوە بوو، لەبەر ئەوەی

یەکـەکانی سـوپا، تەنانـەت نـەیاندەتوانی بـێ مۆڵـەت پێدانـی ئـەوان لــە سەربازخانەکانی خۆیان بێنەدەرو، بە وردی چاودێری لـە کاروباری ناوخۆیـی ئەوانیش دەکرا. کاتێك من داوام لێکردن مۆڵەت بدەن ستونێك لە سەربازانی سـوپا بـەرەو مـەهاباد بجولـێ، ئـەوان مۆڵـەتیان نـەداو سـەرپێچییان کـردو ڕایانگـەیاند کـە تـەنیا مۆڵـەت بە حەرەکـەت کردنـی یـەك گوردانـی پیادە نـیزام ئەدەن بەبێ ئەوەی هەر جۆرە چەکێکی قورسی بـەرگری لـە خۆکردنیان پێبـێ، منیش دەمزانی ئەم هەنگاوە بەمانای ناردنی ئەو سەربازانە و بە کوشتدان و چەکداماڵینیان دەبێ. ئـەم کـارە ئـەو بەڵایـە بـوو کـە لەسـاڵی 1921 دا بەسـەر (سـەرگورد مەلـەك زادە)و سەربازەکانیدا هـاتبوو. ئاکامەکـەی ئـەوە دەبـوو کـە روسـەکان بڵێـن سـەربازانی سـوپای ئـێران هێشـتا توانـای جـەنگیان لەگـەڵ کوردەکاندا نی‌یە و کوردەکانیش هان بدرێن کە هـەموو هێزو توانای خۆیـان بۆ داخوازی سەربەخۆیی بخەنـە گـەڕ. سـەرەنجام، هەلومـەرجی ڕێکەوتننامـەی ئاگر بەست، لەوێدا تەنها هێندە ئێمەی پا بەست دەکرد کە لەبارەی جموجۆڵی هێزەکانمانەوە ئاگاداریان بکەینەوە، بەبێ ئەوەی ئەم جموجۆڵە مـەرجدار بـێ بە ڕەزامەندی و مۆڵەتپێدانی ئەوانەوە.

ئەز فەرمانم بە هۆشمەندی ئەفشـار دا، کە هـێزێك لـە یـەك گوردانـی پیادە، یەك بەتالیۆنی سوارە و یەك بەشی تۆپخانەی چیایی و یەك یەکەی ئەندازیاری پێکهاتبێ، لەڕێگای بۆکانەوە ڕەوانە بکەن بۆ میاندواو، لەپاش گەشتنیان بە میاندواو، گوردانـی ئـەوێش بچێتە پاڵ ئـەو هـێزەو بەکۆمـەڵ بـەردو مـەهاباد حەرەکـەت بکـەن. بـەڵام روسـەکان ناڕەزاییـان دەربـڕی و گوتیـان ئـەم جموجۆڵـە دەبێتە هۆی تێکدانی هاوسەنگی هێز لەو ناوچەیەدا. من لە وەڵامدا پێم وتـن: چـۆن دەشـێ هـێزێك، لەشـکرو ڕێکخسـتنی سـوپای ئـێرانی پەکخسـتبێ لەیەکەیەکی لاواز بترسێ کە لە سەقزەوە ڕەوانەی مەهاباد بکرێ؟ بـەڵام ئـەوان هەرواپێیان لەسـەر چـەتوونی‌و بزێوی خۆیـان داگـرت. بـە ماوەیـەکی کـورت

بەدوای ئەم ڕووداوەدا، عەشایری (شاهسون) دەستیان کرد بەشەڕ و ڕێگرتن لە نفوزی کۆمۆنیستەکان لەو ناوچەیەدا، باڵوێزی روس (ماکسیمۆف) داوای لێکردم فەرمان بە هێزی سوپا بدەم لە ئەردەبیل دا، کە ئەوان لە چەك دامالێ. منیش لە وەڵامدا پێم وتن: ماوەیەك لەمەوبەر ئێمە دەمانویست هەمان کار بەرامبەر بە عەشایری دەوروبەری مەهاباد بکەین بەڵام ئێوە ڕێگەتان پێنەدایین. دیارە منیش لەلای خۆمەوە خوازیاری چەك داماڵینی پێکڕای کەسانی ناڕازیم لە ئازەربایجاندا. ئیدی باڵوێز هیچ وەڵامێکی بەم خواستە نەدایەوەو مەسەلەکەی بێدەنگ پێکرد.

هەر لەو هەلو مەرج و ڕۆژانە دا بوو کە قازی محەمەد و سەیفی قازی هاتنە تاران، ڕۆژێکیان (سەدری قازی) کە برای قازی محەمەد و نوێنەری مەجلیسی شورای میلليش بوو، بە تەلەفون داوای لێکردم پێشوازی لە ئەووبراکەی بکەم.

ئەوان هاتنە بارەگای ئەرکانی سوپاو گفتوگۆیەکی ڕاشکاوو دوورودرێژ لە نێوانمادا ئاڵوگۆڕ کرا . سەدر وسەیف تاڕادەیەك پارێزکارانەو بە نەرمی دەدوان، وایان دەردەبڕی کە ئومێدەوارن دەوڵەتی ئێران لە کۆتاییدا لە تایبەتمەندییەکانی ئەوان تێبگا و مافە نەتەوەییەکانی ئەوان بسەلمێنێ تا ئەوانیش لە پێناو پێشخستنی هەموو میللەتی ئێراندا لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا هاوکاری بکەن. قازی محەمەد کە لە ئاخاوتندا ڕاشکاوتر بوو، لەسەرەتادا نارەزایی بەرامبەر بە فشاری ڕابردوو دەربڕی و سەبارەت بە گەندەڵی و ناکارایی دەزگا ئیدارییەکان لە ناوچە کوردنشینەکاندا دواو دەربارەی ئەوەی کە لەم ناوچانەدا لەبەرچی سوود لە بوونی خودی کوردەکان وەرناگیرێ بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان سکاڵاو باس وخواسی کرد.

من لە وەڵامدا پێم ووت کە: خاوەن شکۆ (همایۆن شاهنشا) هەمان ئەو هەستەی لەبەرامبەر کوردا هەیە کە لە بەرامبەر پێکڕای کە مایەتییە نەتەوەییەکانی دیکەدا هەیەتی.

پاشان ئاماژەم بەوەکرد کە (زۆر لە کوردەکان لە ڕابردووشدا لەم وڵاتەدا پۆستی زۆر بەرزیان بەدەستهێناوەو تەنانەت کەسایەتیەکیشیان ئەندامی کابینە بووە). هەڵبەتە دانم بەوەدا نا کە تا ئەندازەیەك گەندەڵی و بێ کارامەیی لە دەزگا ئیدارییەکاندا لە ئارادا بووە و هەیە. بەڵام لەم بارەوە پێم ووت. (پێویستە ئێمە بە نیاز پاکیەوە هەموو پێکەوە هاریکاری بکەین و لە ژێر ڕابەری خاوەن شکۆی همایۆنیدائەم کەموکوڕیانە لەناو بەرین، کەسایەتی خاوەن شکۆ شاهنشاهی ئیمپراتۆرییە و سەربە نەتەوەیەکی تایبەت نییە، بەڵکو سەر بە گشت کەمایەتییەکانی وەك فارس، تورك، بەلوچ[65]،کورد، تورکمان، عەرەب وئەوانی دیکەیە. کە هەرکام لەوانە دابونەریتی دێرینی خۆیان بە زیندوویی پاراستووە و شانازی بەوەوە دەکەن کە بەشێك لە میللەتی ئێران پێکدێنن).

لەگەڵ ئەم هەموو درێژەپێدانەشدا، دیتم کە قازی محەمەد نەمامێك نییە لەبەر دەم ئەم شنە بایە دا بچەمێتەوە، دڵنیاش بووم کە لە ئاییندە دا دەبێتە مایەی فەراهەم کردنی ناڕەحەتی وتەنگپێهەڵچنینی ئێمە.

قازی محەمەد، کە پاشان بووە پێشەوای کۆماری ماوە کورتی کوردستان، سەر بەخێزانێکی ئایین پەروەری سونی شاری مەهاباد و کوڕی قازی عەلی بوو کە لەساڵی 1921دا لەکاتی دوا دەستبەسەراگرتنی شاری مەهاباد دا هاوکاری سمکۆی کردبوو. قازی محەمەد پیاوێکی خوێندەوارو بەفارسییەکی ئەدەبیانەو بە شێوەزاری تایبەتی کوردی ئەدوا. جلوبەرگی ئایینی، عەباو مەندیلی سپی عەرەبی دەپۆشی، بەڵام پاشان تەنها مەندیلەکەی هێشتەوە

---

[65] -بەلوچ: هەندێ سەرچاوە ڕەگوڕیشەی بەلوچ دەبەنەوە سەر عەرەب و هەندێکیش پێیان وایە سەر بە نەژادی ئێرانین، ڕیشەی زمانی بەلوچی سەر بە خێزانی زمانە هندۆ ئەوروپییەکانە، خاکی بلوچستان بەسەر ئێران و پاکستان و ئەفغانستاندا دابەش کراوە ، موسڵمانی سونین. (و)

وعەباكەی وەلانا و چاكەتێكی درێژی ئەوروپایی لەبەر دەكرد كە دەگەشتە سەر ئەژنۆكانی، هەرچەندە سەدری قازی لە ئەندامانی حیزبی تودە نەبوو، بەڵام لە هەموو شوێنێكدا لەگەڵ ئەواندا هەڵسوكەوتی دەكرد. ئەوكات حیزبی تودە، هەشت نوێنەری لە مەجلیسی شورای میللیدا هەبوو. لە پاش ئەوەی ئەمن سیاسەتی پشتیوانی كردنم لە ژەنراڵ هۆشمەندی ئەفشاری‌و هێرشی توندم سەبارەت بەیاخیبووانی كورد گرتە پێش، سەدری قازی ترسا و منی بەكۆنەپەرست لە قەڵەمدا. ژەنراڵ هۆشمەندی ئەفشار تا ڕادەیەك توانیبووی هەستی هاودەردی كەسانێكی خێڵەكی و چینی كرێكار لە كوردستاندا بەلای خۆیدا ڕاكێشێ، بەڵام هەم لەلایەن كۆمۆنیستەكانەوە و هەم لە لایەن موڵكدارانی گەورەی نیشتەجێی تارانەوە، كە دەترسان دەستو پێوەندی ئەوان بوروژێنێ، كەوتە بەرقین و نەفرەت.

لە ساڵی 1944 دا، لە ناوچەی ڕۆژئاوای كوردستاندا، هەلو مەرج ڕووی لە پشێوی ناو دوو سەرۆك هۆز لە بەرەی دوژمن: مەحموود خانی دزڵی و مەحموود خانی كانی سانان پێكەوە یەكیانگرت‌و لە نزیك گوندی (بوریدەر) دا هێرشیان كردە سەر هێزی حكومەت، بەڵام لە ئاكامدا تێكشكان و ڕاونران. مەحموود خانی كانی سانان هێندە تۆقی بوو كە پاش ماوەیەك بە نەخۆشی سیل وەفاتی كرد. لەوە بە دوا كوردەكانی ئوستانی كوردستان بە تەواوی سەریان كز كردو بە بێدەنگی مانەوە. بەڵام لە ناوچەی كوردستانی ئازەربایجاندا لەبەر چەند هۆیەكی جیاواز چوونە ڕیزی (كۆمەڵە)وە:

یەكەم/ بەر لە هەموو شتێك لەلایەن هێزی داگیركەری سۆڤیەتەوە ناچار بەم كارە كرابوون.

دووەم/خەڵكی ئەو مەڵبەندە نەیاندەویست لە ڕووی سیاسییەوە بە ناچالاكی بمێننەوە، یا لە خەڵكانی دی دواكەوتووتربن.

سێهەم/خەڵكی نەیاندەویست ببنە ملكەچ وئامرازی دەست حیزبی

کۆمۆنیستی دیموکراتی ئازەربایجان.

سەرباری ئەوانەش ڕق و کینەی مەزهەبی و نەژادیش دژ بە تورکەکانی ئازەربایجان لە نێو کوردەکاندا لە برەودا بوو، لەوانەش گرنگتر ئەوە بوو کەئەندامانی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان کەسانێکی کۆمۆنیست و چەپڕەوبوون و دەیانویست ئازەربایجان لە ئێران جودابکەنەوە و بیلکێنن بە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە. بەڵام سەرانی هۆزە کۆنە پارێزەکانی کورد، خوازیاری ئەوەنەبوون وڵاتەکەیان بخرێتە سەر قەڵەمڕەوی خاکی سۆڤیەت، بەڵکو دەیانویست هەرێمێکی سەربەخۆی کوردنشین دابمەزرێنن.

لە نۆڤەمبەری 1943دا، چەند سەد کەسێك لە ئەندامانی (کۆمەڵە) کۆبوونەوەیەکیان سازدا وکۆمیتەی ناوەندی حیزبیان هەڵبژارد و کەسێکیان بە ناوی (ڕەحمانی زەبیحی)ەوە (لە خەڵکی مەهاباد) کردە سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی ڕێکخراوەکەیان .

لەوەبەدوا سەرانی هۆزە کوردەکان بەدگومان و هیوا بڕاو بوون لەمەبەستی چالاکییەکانی کۆمەڵەو ژمارەیەکی زۆریشیان بە نهێنی لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا پەیوەندییان بەستو بوونە لایەنگری دەوڵەت.

قازی محەمەد نە کەسێکی عەشایری ونە کەسایەتییەکی سیاسی بوو. ئەندامانی ڕێکخراوی کۆمەڵە سەبارەت بە ناوبراو بیروڕای جیاوازیان هەبوو. لەبەر ئەوەی پیاوێکی ئایینی بوو، کەواتە حەتمەن بە کەسایەتییەکی پارێزکاریش دادەنرا، تەنانەت لە دیدو بۆچوونی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەوە ، بەکۆنەپەرستیش ناودەبرا. بەڵام کاربەدەستانی سۆڤیەت سەرنجیان دابوو کە بە بێ ڕابەرێکی ڕوحانی، ڕێکخراوی کۆمەڵە توانای زامن کردنی پشتگیری سەرۆك هۆزەکانی نابێ، بۆ ئەم مەبەستە ئەندامانی کۆمەڵەیان ڕاسپاردبوو کە قازی محەمەد بۆ نێو ڕێکخراوەکەیان بانگهێشت بکەن. هەرچەند هیچ کاتێك وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە

هەڵنەبژێردرا.

لە کاتی یەکەم قۆناغی داگیرکاریدا، کاربەدەستانی سۆڤیەت پێیان وابوو، کە بەدامەزراندنی حیزبی تودە، دەشێ ئێران بکرێتە وڵاتێکی کۆمۆنیستی، بەڵام ئەم پیلانە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی 1942دا ڕووبەڕووی شکست بۆوە. چونکە لە ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنەدا تەنها 8 ئەندامی حیزبی تودە وەك نوێنەری مەجلیس هەڵبژێران. سێ ئەندامیان لە ئاکامی فشاری ڕاستەوخۆی سۆڤیەتدا و چوار ئەندامی تریشیان بە هۆی دەستێوەردانی دەوڵەتی مەرکەزی ئێرانەوە بوو( لە پاش مەرگی سوهێلی) سەرۆك وەزیر، زانرا کە ئەم دەستێوەردانەی دەوڵەت لە ئاکامی ڕاسپاردەی ئینگلیزەکاندا و بەمەبەستی ڕازی کردنی روسەکان بووە. بەمجۆرە تەنها یەك ئەندامیان ڕاستەوخۆ لەلایەن خەڵکییەوە هەڵبژێرا بوو.

پاشان سۆڤیەتەکان سیاسەتی خۆیان گۆڕیو ڕەوشێکی دیکەیان گرتەبەر. ئەم ڕەوشە بریتی بوو لە دابەشکردنی ئێران بە چەند هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی وەك ئازەربایجانەوە، کە ئەم تاکتیکەش پەیڕەوکردنی ڕێبازی حیزبی تودە بوو.

لە سێپتەمبەری 1945دا، دەوڵەتی سۆڤیەت بۆ جاری دووەم رابەرانی کوردی بۆ باکۆ داوەت کرد تاسەردانی ئەو شارە بکەن و میوانەکان بۆ جاری دووەم لە لایەن (باقرۆف)ەوە پێشوازییان لێکراو، بەڵێنی ئەوەی پێدان کە سۆڤیەت بە هەموو هێزو تواناوە پشتیوانی لە دەوڵەتی کوردان دەکات.

قازی محەمەدیش ئاماژەی بەوەکرد کە کوردەکان ناخوازن بەشێك بن لە کۆماری ئازەربایجان ، بەڵکو خواست و ئارەزووی ئەوان ئەوەیە کە بتوانن لەگەڵ کوردانی دیکەی تورکیاو عێراقدا یەکبگرن و سەرەنجام کۆماری کوردستانی گەورە پێکەوەبنێن.

هەر لەم کاتەدا بوو کە مەلا مستەفای ناودار لەگەڵ شێخ ئەحمەدی برایدا

لە ئاکامی فشار و ڕاونانی لەشکری عێراق و بۆردومانی توندی فڕۆکەدا، هاتنە ناو سنووری ئێرانەوە. لە حاڵێکدا کە نزیك بە دوو هەزار چەکداری عەشایری لەگەڵدا بوو، مەبەستی نابراو، کۆمەك کردن بەکۆماری کوردستان (مەهاباد)بوو، ڕەنگە مەبەستیشی بەدەستەوە گرتنی جڵەوی رابەری ئەو کۆمارە بووبێت. زۆر ئەستەمە هاتنی بارزانی بۆ نێو قەڵەمڕەوی خاکی ئێران بە بێ ئاگاداری پێشتری کاربەدەستانی سۆڤیەت بووبێت. لەبەر ئەوەی ئەو کاربەدەستانە بە شێوەیەکی کاریگەر ئەو ئامڕازانەیان لە دەستدا بوو کە ڕێ لە هاتنی بارزانییەکان بگرن بۆ نێو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان. بەڵام باقرۆف لە باکۆدا قازی محەمەدی ئاگادار کردبۆوە کە مەلا مستەفا سیخوڕی ئینگلیزەکانە و پێویستە بە ئاگاییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات . ئەم ئاگادارییە ئەوە دەردەخات کە روسەکان نەیاندەویست کەسێکی سێهەم لە مەیدانی سیاسی ئەو ناوچەیەدا دەربکەوێ و ڕکەبەرێکیش بۆ قازی محەمەد پەیدا بێت.

هەرچۆنێك بێ، لەگەڵ هاتنی بارزانییەکاندا بۆ مەهاباد، جوڵانەوەی کورد، سیمای بەرەیەکی نێو دەوڵەتی بە خۆوەگرت و بە پێکهێنانی کۆبوونەوەیەکی سمبولیکی لە کوردی (ئێران- تورکیا- عێراق- سوریا) لەو ناوچەیەدا کە سنوورەکانی سێ وڵات پێکدەگەیەنێت، زەمینەی دامەزرانی کۆماری خود موختاری کوردستانی گەورە دەستەبەرکرا، ئەم کۆبوونەوەیە بە ناوی (پەیمانی سێ سنوور)ەوە[66] ناسراوە. دەربارەی مەلا مستەفا بارزانی لە بەشی

[66] -(سێ سنوور): دوو ووشەی کوردییە، سێ هەمان ژمارەی (سە)ی فارسی یە کە لە کوردیدا بە (سێ) دەنوسرێ، ووشەی (سنوور) بەمانای (مەرزو تخوبە) کە لە زمانی کوردیدا (سنوور) مانای (لەسەر لوتکەوە ڕوانین) دەگەیەنێت، چونکە هەمیشە خەڵکی کوردی دوو دەوڵەت هاتو چۆی ڕەسمیان لێقە دەغەکراوە، تەنها دەبێ لە بڵندترین یا دواخاڵی سنوورەوە سەیری وڵاتەکەی دیکە بکرێت (حەسەن ئەرفەع).

داهاتوودا بە درێژی باس دەكرێ. لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین كە هەرچەند ناوبراو پتر سەرۆكایەتی ئایینی لە ئەستۆدایە تا سەرۆكایەتی خێڵەكی و، بارزانییەكانیش پتر لە ڕێگەی تەریقەتی دینییەوە پەیڕەوی لەناوبراو دەكەن، بەڵام بە هۆی تێكۆشان و ماندوو نەناسی و ناوبانگی شەڕی جوامێرانەی لەدژی دوژمنەكانی، بڕواوسەرنجی جەنگاوەرانی كوردی بۆ لای خۆی ڕاكێش كردووە.

لەم ڕێپێوانە جەنگییەدا چەند ئەفسەری كوردی عێراقی لەگەڵ مەلا مستەفاو بارزانییەكاندا بوون كە بریتی بوون لە (میرحاج ئەحمەد، خێروڵلا مستەفا، نوری بەگ،كاپتن عێزەت عەبدولعەزیز، گەیلانی زادەی كوڕی شێخ عوبەیدوڵلا ئەفەندی) كە بە یەكێك لە گرنگترین كەسایەتییە نەتەوەییەكان دادەنرا لە نێو ناسیۆ نالیستەكانی كوردا.

هەرچەند پێئەچێ قازی محەمەد پێی وابووبێ كە ڕەنگە مەلا مستەفا لەم خەباتە درێژخایەنەدا ببێ بەهەڤڕكی ئەو، بەڵام زێدە خۆشحاڵ بوو بەوەی كە پشتیوانی كوردەكانی عێراقی لەتەك پشتیوانی ئازەربایجانییەكان و هێزەكانی سۆڤیەتدا بەدەستهێنابوو بۆ بەهێزكردنی پێگەی خۆی، وێڕای ئەوەش بارزانییەكان بە باشی چەكدار بوون و تا دوا قۆناغی ئەو خەباتەش گڕوتینی سەرەكی هێزی پێشمەرگەی كۆماری مەهاباد بوون.

بەمەبەستی شاردنەوەی جموجۆڵی سۆڤیەتەكان، ناوی حیزبی تودەی ئازەربایجان كرا بە فیرقەی دیموكرات[67] و بە هەمان شێوەش ناوی كۆمەڵە كرا

---

[67] -فیرقەی دیموكراتی ئازەربایجان: لە 3ی سێپتەمبەری 1945دا لە تەورێزدا دامەزراو بۆ ماوەی یەك ساڵ حكومەتی میللی ئازەربایجانی بەڕێوەبرد، پاش شكست و هەرەسهێنانی حكومەتی ئازەربایجان زۆربەی رابەرانی فیرقە پەنایان بردە بەر یەكێتی سۆڤیەت. لە 1960دا فیرقەی دیموكرات هەڵوەشایەوەو چووە نێو حیزبی تودەوە .(و).

بە حیزبی دیموكراتی كوردستان. هەرچەند كوردەكان وایان پێپەسەند بوو بە ناوی (كۆمەڵە) وە ناو ببرێن.

بەرنامەی ئەم حیزبە بە یارمەتی (هاشمۆف) كونسڵی سۆڤیەت لە ورمێدا، بەم شێویەی خوارەوە ئامادەكرابوو:

1-گەلی كورد لە ئێراندا، مافی خود موختاری ئیدارییان لە بەڕێوەبردنی كاروباری ناوخۆی خۆیاندا دەبێت.

2-زمانی كوردی بە زمانی ئیداری دا دەنرێو لە قوتابخانەشدا دەخوێندرێ.

3-ئەنجومەنێكی ئەیالەتی بە پێی پەیرەوی كردن لە دەستوری ئێران پێكدێو لێكۆڵینەوە و چاودێری سەرجەم كاروبارە گشتییەكان دەكات.

4-دەبێ هەموو كارمەندانی دەوڵەت (لە ناوخۆی كوردستاندا) كوردبن.

5-ئەو داراییانەی لە ناوچەی كوردستاندا كۆدەكرێتەوە هەر لەوێدا خەرج دەكرێ.

6-حیزبی دیموكراتی كوردستان هەموو هەوڵی خۆی لە پێناو بەرفراوان كردنەوەی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ خەڵكی ئازەربایجان وپاراستنی ئارامی و ئاسایشی ئەو ئەیالەتەدا،دەخاتە گەڕ.

7-حیزبی دیموكرات، گەشەی ئابوری، بەرزكردنەوەی ئاستی خوێندن و پەروەردە و ئاكار، و پێشخستنی كشتوكاڵ، بازرگانی و تەندروستی خەڵكی، دەكاتە ئامانجی كارەكانی خۆی.

وەك تێبینی دەكرێ، بەندەكانی ئەم بەرنامەیە لەگەڵ یەكدیدا ناكۆك و نەگونجاون. لە بەندی 3 دا هاتووە كە دەبێ پەیڕەوی لە دەستوری ئێران بكرێت، لەهەمان كاتدا، هەموو بەندەكانی تری ئەم بەرنامەیە بە پێچەوانەی دەستوری ئێرانەوەن. وەك هەوڵدان بۆ پێكهێنانی ئایالەتی كوردستان كە هەرێمێكی سەربەخۆو تەواو جودا بێت. یاخود لە بەندی 5 دا هاتووە كە

تەواوی دارایی ئەم ئەیالەتە لە نێو چوار چێوەی خودی ئەم ئەیالەتە دا خەرج بکرێ، ئایا بەمجۆرە پەیڕەوی لە دەستوری ئێران دەکرێ؟ ئەگەر تەواوی ئەیالەتەکان بەمجۆرە خۆگەردان بن، ئیدی دەوڵەتی مەرکەزی چۆن دەتوانێ بودجەی خەرجییە گشتییەکانی وەك کاروباری سوپا، ئیدارەی مەرکەزی و وەزارەتی کاروباری دەرەوە دابین بکات؟ وێڕای ئەوەش ئەگەر دەوڵەت ئەم دەسەلاتانەی لەدەستدا نەمێنێ، ئیدی مەسەلەیەك بە ناوی (مەسەلەی کوردی ئێران)ەوە بوونی نابێ وئەم گەلە بە تەواوی سەربەخۆیی خۆی زامن دەکات. جگە لەوەش سنووری جوگرافیای ئەم ئەیالەتە دیاری نەکرابوو، ئایا ئەم سنوورە تەنها ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کە کوردەکان تیایدا زۆرینە بوون؟ ئایا خەڵکی کورد لەوناوچانەدا، کە بەهۆی فاکتەری سیاسی و ئابورییەوە بەخاکی کوردیان دادەناو، زۆربەی دانیشتوانەکەشی غەیرە کوردبوون، وەك ورمێ،خوی، ماکۆ، شاهپور کە کورد تیایدا کەمینە بوون، مافی جیابوونەوە و سەربەخۆییان دەبوو؟.

وەك دەزانین زۆربەی هۆزە کوردەکانی کورد لە هەڤرکیو ئیرەییدا چاویان بەرایی نەدەهات بەڕێوەبەرانی حیزبی نوێی دیموکرات ببینن، تەنانەت خودی مەلا مستەفاش دەربارەی ئایندەی دەوڵەتی کورد، دیدوبۆچوونی تایبەتی خۆی هەبوو.

لەپاش کۆتایی هاتنی جەنگ لەگەڵ ئەڵمانیادا، یەکێتی سۆڤیەت، سوور بوو لەسەر ئەوەی دەسەلاتی خۆی بەسەر ئەو ناوچانەدا سەقامگیر بکات کەبەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا لەژێر دەسەلاتی ئەو ولاتەدا بوون، وەك ولاتەکانی بالتیك، بسارابیاو بەشێك لە فنلەندا کە لەکاتی جەنگدا داگیر کرابوون. تەنانەت درێژەیان دا بە داگیرکردنی (بیخـودی)، کەپاش چوونە دەری ژاپۆنیەکان داگیریان کرد. لەم سۆنگەیەوە واپێدەچوو کە بیانەوێ درێژە بدەن بە دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئازەربایجانیشدا، کە لە ساڵی 1907وە تا

1917 لەبن دەستی روسیادا بوو.

ویستی ئەو دەوڵەتە لە بەکۆمۆنیست کردنی خەڵکی ئازەربایجاندا وەك پیلانی بەکۆمۆنیست کردنی ناوچەکانی دیکەی ئێران لەگەڵ شکستدا رووبەڕوو بۆوە. لەم ناوچەیەدا کە خەڵکی ئازەربایجان موسڵمان بوون و خۆیان بە هاوولاتی ئێران دەزانیو تەنانەت ئازەربایجانی سۆڤیەتیشیان بە بەشێکی زەوتکراو و لە دەستچوو دادەنا، هەرچەند ئازەربایجانی سۆڤیەت، سیمای ئازەری خۆی وون کردبوو، وەك ئەرمەنی و گشت کەمینەکانی روسیای لێهاتبوو، بەڵام ئازەربایجانی ئێران بە دانیشتوانی نزیك بە چوار ملیۆنو نیوەوە بە تەواوی سیمای ئازەری بوونی خۆی پاراست بوو. لەبەر ئەم هۆیانە، کاربەدەستانی روسی دەستیان کرد بە کۆمۆنیست کردنی ئەو کەسانەی کەبە مەبەستی کارکردن لە ئازەربایجانی ئێران دەرکەوتبوون و چووبوونە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە.

لە ساڵەکانی بەر لە 1917دا، هەر ساڵە و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئازەربایجان بەمەبەستی کارکردن دەچوونە ئازەربایجانی روسیاوە و پاش ماوەیەك کارکردن، بڕێك پارەیان کۆدەکردەوە و دەگەڕانەوە بۆ ولاتو زێدی خۆیان. هەندێك لەم کرێکارانەش ئیدی نەدەگەڕانەوە، هەر لەوێدا دەمانەوە و لەگەڵ کیژانی ئازەری یا ئەرمەنیدا دەبوونە هاوسەر و خێزانێکیان پێکەوە دەنا، تەنانەت هەندێکیان وازیان لە ڕەگەزنامەی خۆیان دەهێناو دەبوونە هاوولاتی سۆڤیەت. لە دەوروبەری ساڵی 1930دا، چەند هەزار کەسێك لەم خەڵکە لە سۆڤیەتدا دەرکران و دووبارە گەڕانەوە ئێران، لە کاتێکدا کە هەندەك لەوان هیچ کات لەسەر زەمینی ڕەسەنی خۆیاندا نەژیابوون و تەنها بە زاری روسی یا ئازەری ئەدوان. ڕەزا شا فەرمانی دا ئەم خەڵکە بگەڕێنەوە بۆ سەرزەمین و زێدی باو و باپیرانی خۆیان. بەڵام ئەم خەڵکە کە لە روسیادا خەڵکێکی کرێکار بوون و بە ژیانی نێو شارە گەورە و خاوەن کارگەکان

ڕاهاتبوون، لەو ناوچانەشدا كۆچیان كرد و زۆربەیان لەشاری ئەردەبیل دا كۆبوونەوە بەشێكی زۆریان لە خەڵكی ئەو شارە پێكهێنا. لەبەر ئەوەی لەروسیادا لەگەڵ ئایدۆلۆژی كۆمۆنیستیدا ئاشناببوون، لە ئێرانیشدا هەم باسیان لە یاخیبوون و شۆڕشی جەماوەری دەكرد.

لەپاش جەنگ لەلایەن روسەكانەوە بە تەواوی چەكداركران و لە ڕاستیدا بۆ چەند ڕۆژێكی وەها لە بەر چاوگیرا بوون.

لە 15ی دیسەمبەردا، ئەم یاخیبووە ساختانە كە بەهۆی كامیۆنەوە هێنرا بوونە (میانە)، هێرشیان كردە سەردامو دەزگاكانی دەوڵەت و كۆنترۆڵی شاریان گرتە دەست. ڕێگای پەیوەندی ئەم ناوچەیەشیان بە تێكڕای ناوچەكانی دیكەی ئێرانەوە بڕی. تەنها سیمی تەلەگرافی تاران–تەورێز یان بە كراوەیی هێشتەوە، بەمەبەستی ئەوەی كە بەڵكو لە تارانەوە فەرمانی دەستهەڵگرتن لەبەرگری چەكدارانە بەپاشماوەی هێزە ئێرانییەكانی ناو تەورێز بدرێت.

لەو ڕۆژە پشێو و پڕ لە قەیرانەدا، من پەیوەندیم كرد بە ژەنراڵ (درەخشانی)ەوە كە فەرماندەی سوپای سێهەمی ئازەربایجان بوو، پێدەچوو ئەوێ ڕۆژێ بەیەكجاری ورەی خۆی لەدەست دابێ یا لەدەسەلاتی فیرقەی دیموكراتی ئازەربایجان وسەرۆكی ئەو فیرقەیە (پیشەوەری)[68]–كە یەكێك بوو

---

[68] – پیشەوەری: (1893–1947) لەسەرەتای شۆڕشی ئۆكتۆبەردا بووە كۆمۆنیست، لە بزوتنەوەی جەنگەڵدا وەك ڕابەرێكی باڵی سۆسیالیستی ئەو بزوتنەوەیە بەشداریكرد، یەكێ بوو لە ڕابەرانی حیزبی كۆمۆنیستی ئێران، پاشان بۆ ماوەی دەساڵ زیندانی كرا، لە 1945دا فیرقەی دیموكراتی ئازەربایجانی دامەزران و لە كۆتایی هەمان ساڵیشدا حكومەتی میللی ئازەربایجانی پێكهێنا، پاش شكستی ئەو حكومەتە لە كۆتایی 1946دا پەنای بردە بەر ئازەربایجانی سۆڤیەت، لە ڕووداوی ئوتومبێلدا گیانی لەدەست دا . (و)

لە کۆچبەرانی قەوقاس و لەئەندامانی چالاکی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بوو لە 1930وە–تۆقیبێ، ئەمن فەرمانم بە ژەنراڵی ناوبراودا، کە تا دوا هەناسە، بەرگری بکات، بەڵام ناوبراو وەڵامی دایەوە کە چیتر بەرگری کردن لە تواناادا نی یە . من پێم ووت کەواتە بەرەو تاران پاشەکشێ بکە. ئەم دوو فەرمانە بەمەبەستی خۆ بواردن بوو لە خۆبەدەستەوە دان، ئەمن گەلێك لەسەر ئەم مەسەلەیە سووربووم.

ڕۆژی دواتر، کۆچبەران لەگەڵ ژمارەیەك لە کەسانی گێرە شێوێنی ناوخۆ لە سەرتاسەری ئازەربایجاندا هێرشیان کردەسەر بنکەکانی ژاندارمری، لە پاش کوشتنی ژاندارمەکان، ئەفسەرەکانیان بەدیل گرت، ئیدی هێرش کردنە سەر سەربازخانەی تەورێز کارێکی مسۆگەرو حەتمی بوو.

من هەواڵی ئەو ڕووداوانەم بە (شا) گەیاند. ئەو فەرمانیدا کە هێزێك بۆ ئازەربایجان ڕەوانە بکەم. چونکە بەخۆم ئازەربایجانی بووم و لە هەستی خەڵکی ئازەربایجان بە ئاگابووم، بڕیارم دا هێزێکی بچووك ڕەوانە بکەم کە لە دوو گوردانی پیادە، دوو تۆپی چیاییو، دوو تانکی زرێپۆش پێکدەهات، دڵنیابووم کە خەڵکی ئازەربایجان لەگەڵ دیتنی ئەو هێزەدا دەکەونە شەڕکردن لە دژی کۆمۆنیستەکان، سەرەڕای پڕوپاگەندەی سۆڤیەتەکان کە دەیانگووت ئازەربایجان دەخوازێت لە ئێران جیابێتەوە، کاربەدەستانی سۆڤیەت بە ئاگابوون و پێشبینی ئەوەیان کردبوو، لەبەر ئەوە بڕیاریان دا کە ڕێگە نەدەن ئەم هێزە بگاتە ئازەربایجان. لەکاتی حەرەکەتی ئەم یەکەیەدا بەرەو قەزوێن، زۆر هەوڵیاندا ڕێ لەم جموجۆڵە بگرن. بەڵام ئەمن بە سەروان (عەزیمی) فەرماندەی هێزەکەم گووت بە هیچ نرخێك پێشڕەوی و حەرەکەت نەوەستێنێت.

حەرەکەتی ئەم هێزە تا نزیکی شاری قەزوێن بەردەوام بوو، بەڵام لەوێدا سوپای سۆڤیەت، لەڕێگای ناردنی هێزێکی گەورەی پیادە نیزام و تانك و

هەڕەشەی تەقەکردنەوە پێشڕەوی ئەم هێزەیان ڕاگرت. پاشان ئەمن فەرمانم دا هێزەکە لەبەرامبەر قشونی سۆڤیەتدا بوەستێ و تەنانەت خۆببوارن لە چوونە ناو ئەو گوندەوە کە مومکین بوو ببێتە بنکەیەك بۆ جێگیر بوونی سەربازەکان و تەنها چەند کیلۆ مەترێك لێیانەوە دوور بوو. ئەم هێزە چەند حەفتە لەژێر چادردا مانەوەو سەرەڕای بەفر و سەرماش ورەی پتەوی خۆیان بەرنەدا بۆ پێشڕەوی کردن بەرەو ئامانجی خۆیان.

لەم کاتەدا، سەربازخانەکانی ئێران لە (تەورێز) و (ئەردەبیل)دا لە لایەن هێزی داگیرکەرەوە، کە بەشێوەیەکی هەمەلایەنە لەگەڵ یاخیبووەکاندا هاوکاریان دەکرد، کەوتنە بەر هەڕەشەی گەمارۆدان و داوای خۆبەدەستەوە دانیان لێکرا، تیپی ورمێ تەنها چەند ڕۆژێك دەیتوانی لە بەرامبەر کۆچبەراندا بەرگری بکات. (سەروان زەنگەنە) فەرماندەی ئەم تیپە بێ ئەوەی بایەخ بە هەڕەشەی روسەکان بدات، هێزی کۆچبەرانی تا نزیك بە بیست کیلۆمەتر پاشەکشێ پێکرد کە بریتی بوون لە ئەرمەنیو ئاسورییەکان و ئەوانی دی، تەنانەت تیرەکانی هەرکی و بەگزادەشی تێکشکان، بەڵام لە پاش گەیشتنی هێزی پشتیوانی لەلایەن سۆڤیەتەکانەوە تیپی ورمێ لە 17ی دیسەمبەردا ناچار بە خۆبەدەستەوەدان کرا، سەربازەکانیان بڵاوە پێکردو ڕێگەشیان بەئەفسەرانی تیپەکەدا کە بگەڕێنەوە بۆ تاران.

فەرماندەی تیپیش گواسترایەوە بۆ تەورێز و لەوێدا بە تاوانی بەرگری کردنو لەبەرامبەر یاخیبوواندا دادگایی و مەحکوم بەمەرگ کرا.بەڵام ئەم حوکمە بەڕێوە نەبرا و ناوبراو لەگەڵ ژمارەیەك لەو کۆمۆنیستانەی کە لە تاراندا دەستگیر کرابوون، ئاڵوگۆڕیان پێکرا.

لە پاش کودەتای فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لە تەورێز دا، نوێنەرانی ناوخۆیی ئەیالەتیش لە نێو ئەندامانی ئەو حیزبە دا هەڵبژێران و پیشەوەریش وەك سەرۆك هەڵبژێردرا. قازی محەمەدیش بە هۆی ڕاسپێری یافشاری

سۆڤیەتەكانەوە شاندێكی بەسەرۆكایەتی (سەیفی قازی) برازای وەك نوێنەری حیزبی دیموكراتی كوردستان ناردە تەورێز تا بەبۆنەی هەڵبژاردنی ئەوانەوە پیرۆزبایی لە نوێنەرانی فیرقەی دیموكراتی ئازەربایجان بكەن.

لە 17ی دیسەمبەردا ، ئاڵای ئێران لە مەهاباددا لەسەر فەرمانگەكانی دەوڵەت داگیرا و ئاڵای كوردستان (كە لەسێ ڕەنگی سەوز و سپی و سوور پێكدەهات، بەڵام بە پێچەوانەی ئاڵای ئێرانەوە لە تەختی ڕەنگی سپی ئەودا وێنەی خۆرێك لە نێوان دوو چڵەگەنمدا كێشرابوو) لەسەر فەرمانگەكانی مەهاباد، شنۆو، نەغەدە هەڵكرا.

گشت ئەو پیاوانەی كە لە سوپای ئێراندا مەشقی سەربازییان دیتبوو، بەرگی سەربازی سۆڤیەتیان پێدرا و هێزی لەشكری 12000 پێشمەرگەیی مەهابادیان دامەزران. ئەفسەرانی ئەم لەشكرە بریتی بوون لە چەند ئەفسەرێكی پێشووی سوپای ئێران و ئەفسەرانی عێراقی، لە هەمان كاتدا كتێبە نیزامییەكانیشیان لە زمانی ڕوسییەوە بۆ زمانی كوردی وەرگێڕابوو.

لە 22ی دیسەمبەری 1946دا، قازی محەمەد پێكڕای سەرۆك عەشیرەتەكان و پیاو ماقوڵانی ئەو مەڵبەندەی بانگهێشت كرد بۆ مەهاباد، ئەم پیاوانە و حەشمەتێكی زۆر لە بارەگای فەرمانداریدا كۆبوونەوەو، قازی محەمەد لەم ڕۆژەدا كۆماری خود موختاری كوردستانی ڕاگەیاند.

پاشان سەیفی قازی لە كاتێكدا كە ئۆنیفۆرمی ژەنراڵی ڕوسی لەبەردا بوو، قازی محەمەدی وەك پێشەوای كۆماری كوردستان ناساند، پاشان ڕێو ڕەسمی ڕێپێوانی پێشمەرگەی نیزامی لەشكری ڕێكخراوی كوردستان، جەنگاوەرانی كوردی عێراقی، بارزانییەكانو، تێكڕای هۆزە كوردەكانی ئێران، بە ئامادە بوونی قازی محەمەد بەڕێوەبرا. لەم ڕێوڕەسمەدا قازی محەمەد ئۆنیفۆرمی ژەنڕاڵی ڕوسی لەبەردا بوو، بەڵام مەندیلە سپییەكەی سەری لانەبردبوو.

ڕاستەوخۆ لەپاش كۆتایی ڕێوڕەسمی ڕێپێوانی سەربازی قازی محەمەد

ئەندامانی کابینەی کۆماری خودموختاری مەهابادی بەم شێوەیەی خوارەوە ناساند:

1-حاجی بابە شێخ سەرۆك وەزیر.
2-محەمەد حسێن سەیفی قازی وەزیری پێشمەرگە وجەنگ.
3-ئەحمەد ئیلاهی وەزیری ئابوری.
4-محەمەد ئەمین موعینی وەزیری ناوخۆ.
5-کەریم ئەحمەدیان وەزیری پۆست وتەلەگراف.
6-حاجی عەبدولڕحمان ئێلخانیزادە وەزیری هەرێم ( بەشێوەی ئیداری، بەڵام بە کردەوە نێوانگری نێوان حیزبی دیموکرات و سۆڤیەت)
7-مەنافی کەریمی وەزیری پەروەردە و فێرکردن.
8-سدیقی حەیدەری وەزیری ڕاگەیاندن .
9-خەلیل خەسرەوی وەزیری کار.
10-حاجی مستەفا داودی وەزیری بازرگانی.
11-محەمەد وەلی زادە وەزیری کشتوکاڵ.
12-ئسماعیل ئەمینی زادە وەزیری ڕێگاو بان.
13-سەید محەمەد ئەیوبیان وەزیری تەندروستی.

هەموو ئەم کەسایەتیانە سەربە خەڵکی شاری مەهاباد یا سەرۆك خێڵەکانی دەوروبەری ئەو شارە بوون. جگە لە دوو ئێلخانی زادە کە لە هۆزی دێبوکری و سەربەبنەماڵەی (ئەمیر ئەسعەد) فەرمانداری پێشوو بوون.

ئەم موڵکدارو سەرۆك عەشیرەتانەی کە وەك ئەندامانی کابینەی حکومەت هەڵبژێرا بوون، بە هەموو هێزیانەوە تێدەکۆشان سیاسەتی ناوخۆ بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و ڕێ لە هەر جۆرە ڕیفۆرمێکی کشتوکاڵی و نوێ کردنەوەیەك بگرن، کە زیان بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان بگەیەنێت. لەلایەکی دیکەشەوە ژمارەیەك لە خەڵکی چینی ناڤین و چەپڕەوی شارنشین تێدەکۆشان

بەهەر نرخێك بێ بە کۆمەکی ڕوسەکان یەکەمجار شەڕی سەرۆك هۆزەکان یەکلایی بکەنەوە و پاشانیش لەدەست ئەم بۆرژوازیانەی ئەندامانی کابینە ڕزگاریان بێت.

قازی محەمەد لەم ململانێیە بە خەبەر بوو، ئەو تێدەکۆشا کە بە پێی بیرۆکە و ئایدۆلۆژی خۆی ڕووداوەکان بەڕێوەببات، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە دەیزانی کە لە حاڵی حازردا ناتوانێت بایەخ بە ڕێنوێنی و فەرمانی کاربەدەستانی داگیرکەری سۆڤیەت نەدات، یا پشتگیری سەربازیی بارزانییەکان و تێکڕای هۆزەکان لە دەست بدات. مەلا مستەفاش بە ئاگابوو لەو کێشە سیاسیانەی کە لەئاکامی هاتنیدا بۆ ئێران سەریهەڵدا بوو، هەرچەند هاتنی ئەو بۆ نێو ئێران و چوونە ڕیزی حیزبی دیموکراتەوە تەنها بە هۆی فشاری کاربەدەستانی عێراق و بەهۆی شۆڕشی ساڵی 1944ی بارزانەوە بوو. بەڵام ئەو بە نیاز بوو سوود لە ووزە و توانای هێزەکەی وەربگرێ بۆ پێکەوەنانی هەرێمێکی سەربەخۆی کوردنشین، کە تیایدا پیاوانی وەك ئەو بەپایەی سەرەکی هێزی چەکدار دابنرێن. هەروەها تێدەکۆشا لەم ڕێگایەوە دەستی بە ئارەزووی دێرینی خۆی ڕابگات کە دامەزرانی دەوڵەتی کوردستان بوو، کە نە تەنها کوردەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بەڵکو تەواوی کوردستانی ئێران و عێراق و تورکیا بگرێتەوە.

لەگشت فەرمانگە حکومییەکانی مەهابادا وێنەی قازی محەمەد (کە بە چوار دەوریدا ئاڵای کوردستان و دروشمی حکومەت نەخشێندرا بوو، کە لە ژێریدا نووسیبوویان–پێشەوای مەزنی کوردستان جەنابی قازی محەمەد–) هەڵواسرابوو.

لە نوسینگەی کاری خۆشیدا نەخشەیەکی گەورەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی چاپی لەندەن هەڵواسرابوو کە تیایدا سنوری ئەو دەوڵەتی کوردستانە گەورەیەی کە دەبوو دابمەزرایە، بەخەتی دەست دیاری کرابوو کە ناوچە

كوردنشینەكانی ئێران، عێراق، توركیا، سوریا، تەنانەت سۆڤیەتیشی دەگرتەوە. كە لە دەریای ناوەڕاستو بەندەری ئەسكەندەرونەوە درێژ دەبۆوە تا كەنداوی فارس و لە نێوان (بوشەهر و هندیجان)ەوە بە دەریای ئازاد دەگەشت. زۆربەی شارەگرنگە ناكوردییەكانی وەك ئەرزرۆم، ئەورنیكان، قارس، ماكۆ، شاهپور، موسڵ، ورمێی دەگرتەوە. بەم شێوەیە قازی محەمەد بە نیاز بوو ببێتە پێشەوای سەرجەم كوردەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ئایدیای روسەكان بە پێچەوانەی ئەو بیرۆكەیەوە بوو، ئەوان گەرەكیان بوو كە ئازەربایجان لە ئێران جیابكەنەوەو بەئازەربایجانی سۆڤیەتەوەی بلكێنن. روسەكان نەیاندەویست كوردستان لە ژێر سەركردایەتی بۆرژواو فیودالەكاندا سەربەخۆیی بەدەستبێنێ و ڕوە و دیموكراسی هاوشێوەی سیستەمە ڕۆژئاواییەكان ڕێنوێنی بكرێ. بۆ ئەم مەبەستە قازی محەمەد و گشت رابەرانی حیزبی دیموكراتیان بانگ كرد بۆ تەورێز. تا لەم بارەوە لەگەڵ رابەرانی دیموكراتی ئازەربایجانی سۆڤیەتدا وتووێژ بكرێت. سەرۆكایەتی ئەم وتووێژانە لە ئەستۆی (ئیبراهیمۆف)ی وەزیری ڕۆشنبیری ئازەربایجانی سۆڤیەتدا بوو. ناوبراو كوردەكانی بۆ ئەوە بانگهێشت كرد كە ئۆتۆنۆمی كوردەكان لە نێو چوارچێوەی كۆماری ئێستای ئازەربایجاندا قبوڵ بكەنو دامەزراندنی كۆماری كوردستانی پێكهاتوو لە كوردەكانی ئێران و عێراق و توركیا دوابخەن و بە دەرفەتێكی گونجاو و هەموارتری دیكەی بسپێرن.

كوردەكان لە وەڵامدا گوتیان ئەگەر بڕیاربێ بە وڵاتێكی دیكەوە بلكێندرێن لە بەرچی بە ئێرانەوە نەلكێندرێن كە پەیوەندیو هاریكاری نەژادی و كولتورییەكی قوڵتریان لەگەڵدا هەیە تا لەگەڵ ئازەربایجانی سۆڤیەتدا. روسەكان نەیاندەتوانی پێ لەسەر هەماهەنگ كردنی ڕژێمەكانی ئازەربایجان وكوردستان دابگرن. لەو مەڵبەندەدا لە كاتێكدا كە ڕۆژ بە ڕۆژ ئازەربایجان پتر بەرەو كۆمۆنیزم دەڕۆی، رابەرانی كورد بەشێوەیەكی ئاشكرا كۆمۆنیست

نەبوون و تەنانەت لە رابەرانی تارانیش پارێزگارتر بوون.

پەیوەندی نێوان کوردو ئازەربایجانیەکان، لەمەبەدوا ڕۆژ بە ڕۆژ پتر ڕووی لە قەیران دەنا، جیاوازییەکان زیاتر بە هۆی کێشەی دەشتە بە پیتەکانی دەوروبەری خوی، ورمێ وشاهپورەوە بوو، کە بەدەر لەم دەشتانە کوردستان دەبووە ناوچەیەکی شاخاوی بێپیت.لەوێدا کە دانیشتوانی ئەم دەشتانە زیاتر تورك بوون، کاربەدەستانی ئازەربایجانی بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون ئەم ناوچانە لە دەست بدەن. روسەکان لە ترسی ئەوەی نەبا دا پێکهەڵپژانی چەکدارنە لە نێوان ئەم دوولایەنەدا ڕووبدات، بڕیاریان دا رابەرانی دوولایەن پێکەوە کۆبکەنەوە و بە هەر شێوەیەك بێ بیانگەیەننە ڕێکەوتننامەیەك و سەرەنجام ئەم ڕێکەوتننامەیەی خوارەوە لە نێوان دوو حیزبی دیموکراتی کوردستان و فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجاندا، لە 23ی نیسانی 1946دا، مۆرکرا:

1-لەو شوێنانەی کە بەپێویستی دەزانن هەردوو حکومەتی میللی نوێنەری ڕەسمی خۆیان لە خاکی یەکتردا دیاری دەکەن.

2-لە ئازەربایجاندا لەو شوێنانەی کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن کاروباری دەوڵەتی بەدەست کوردەکانەوە دەبێ. هەروەها لە کوردستاندا لەو شوێنانەی کە زۆربەی دانیشتوانی ئازەربایجانین کاورباری دەوڵەتی بە دەست مەئمورانی حکومەتی میللی ئازەربایجانەوە دەبێ.

3-ڕێکەوتن لەسەر پێکهێنانی کۆمیتەیەکی هاوبەشی ئابوری.

4-یەکخستنی هێزی سەربازی دوولایەن.

5-هەر جۆرە وتووێژکردنێك لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا، بە ئاگاداری و ڕەزامەندی دوو حیزب دەبێ.

6-هەردوو حیزب دەربارەی پێشخستنی زمان و فەرهەنگی کەمینەکانی دوولایەن پێکەوە هاوکاری دەکەن.

7-لەبەرامبەر هەر جۆرە هەنگاوێك لە دژی یەکێتی وتەبایی دوو حیزب، بە توندی خەبات دەکرێ.

گرنگترین کێشەی دوولایەن، واتە دیاری کردنی سنووری نێوان دوو کۆمارەکە، لەڕێکەوتننامەکەدا لابرابوو، لەم ڕێکەوتننامەیەدا تەنها ئەو مەسەلانە گرنگییان پێدرا بوو کە لە سەری پێکهاتبوون و خاڵی هاوبەشی دوولایەن بوو.

روسەکان دەیانویست (بەهۆی ئەو فشارە دەرەکییەی کە لەسەریان بوو، هەروەها بە هۆی ئەو وتووێژەوەی کە دەربارەی ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی ناوچەکانی باکور لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا لە کایەدابوو) باکور چۆڵ بکەن. بەڵام بەر لەوە دەیانویست بەو پەڕی هێزو تواناییانەوە سوپاو هێزی پۆلیسی ئازەربایجان و کوردستان بە هێز بکەن، کە لەم کاتەدا هێزەکانیان یەکخستبوو تا پێکەوە لە ناوچەکانی باشوردا بەرەنگاری هێزەکانی تاران ببنەوە.

ئەو کات کوردەکان خۆیان بۆ پێشڕەوی کردن ڕوە و ناوچەکانی باشوری کوردستان ئامادە دەکرد تا چەکداری هۆز و عەشیرەت گەلی ئەو ناوچانە بکەنە هاودەست و هاوکاری خۆیان.

ژمارەیەك لە هۆزەکانی بەگزادە، سۆسەنی، سەردەشت، گوریك، چوونەپاڵ هۆزی پشدەرییەوە کە لە عێراقەوە هاتبوون، نزیك بە هەزار چەکدار یان بەشێك لە دەشتی سەردەشتیان داگیرکردو لە سەربازخانەی سەردەشت نزیك کەوتنەوە کە لەو کاتەدا یەك گوردانی پیادە و دوو تانکی تیادا جێگیر بوو. دوو گوردانی پیادەش لە ناوچەی کلتە (قلتە)دا لە کەناری زێی بچوکدا جێگیربوون کە ئەرکی پاسەوانی و چاودێری کردنی سنووریان لە ئەستۆدا بوو. هێزی سەقز لەو هێزانە زیاتر بوو کە لە چوار گوردانی پیادەو یەك بەتالیۆنی سوارەو یەك تۆپی چیایی و دوو تانك پێکدەهات. ئەم هێزەیان، لەلایەن حەمەڕەشید خانەوە، لە ناوچەی (خورخورە)وە هەڕەشەی پەلاماردانی

لێدەکرا.

فەیزوڵلا بەگییەکانیش لە ناوچەی (بۆکان)دا جێگیر بوون وچاوەڕوانی هەلێك بوون بۆ هێرش کردنە سەر (تەکاب) کەسەربازخانەی ئەوێ بریتی بوو لە دوو گوردانی پیادەو بەتالیۆنێکی سوارە. هاتووچۆو گواستنەوەی کەلوپەلی سەربازیش بەهۆی دووری ڕێگاو هەڕەشەی بەردەوامی یاخیبووەکانەوە زۆر دژواربوو.

زستانی ساڵی 1945 زۆر سەخت وسارد بوو، کەژوکێوو ڕێگاوبانەکان تا مانگی نیسان بەفر داپۆشیبوون، سەربازخانەکانی ئێران لەسەردەشت و بانەو سەقزو تەکاب دا لە ڕووی وەرگرتنی ئازووقەوە شپرزەبوون و لەگەڵ دژوارییەکی فراواندا ڕووبەڕووبوونەوە.

لە بەهاری 1946دا، ئەو کوردانەی کەسەردەشتیان گەمارۆدابوو، هێڵی تەلەفونی نێوان سەردەشت و بانەیان بڕیو سەرگەرمی ئابڵوقەدانی شاربوون. ئەم گەمارۆدانە بەهۆی هێرشی سەربازانی دەوڵەتەوە تێکشکا و کوردەکان ناچار بە پاشەکشێ کران، بەڵام ستونێکی چەند نەفەری دەوڵەت کە بە کۆمەکی ئەو سەربازانەوە لەسەقزەوە هاتبوون، کەوتە بەر هێرشی کوردەکان و لەپاش زیان لێکەوتنێکی قورس بە ناچار بەرەو سەقز گەڕانەوە. هەر لەم کاتەدا ژەنراڵ (جهانبەهانی) بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەو بارودۆخە ڕەوانە کرابوو. لەسەر خواستی ئەو هێزی کۆمەك لە تارانەوە ڕەوانەکرا. فەرماندەی تیپی پیادەی سنەش سەرتیپ (همایۆنی) لەگەڵ هێزەکەیدا بەمەبەسنی بە هێز کردنی سەربازخانەی سەقز حەرەکەتی کرد. بارودۆخی سەربازی لە سنوورەکانی ئازەربایجان و کوردستاندا بە شێوەیەکی سەرەکی لە ژێر کاریگەری پەیمانی سێ قۆڵی نێوان ئێران و بەریتانیاو سۆڤیەتدا بوو (کە لەساڵی 1943دا مۆرکرابوو، بە پێی ئەم پەیمانە دەبوو 6 مانگ پاش کۆتایی هاتن بە جەنگی نێوان ئەڵمانیا و هاوپەیمانان، هێزەکانی سۆڤیەت و بەریتانیا

و ئـەمریکا، ئـێران بەجێبێڵن وسـەربەخۆیی ویەکپارچـەیی ئـێران بـەڕەسمی بناسن).

هێزەکانی بەریتانیا لە کانوونی دووەمی 1946دا، خاکی ئێرانیان چۆڵکرد، بەڵام هێزەکانی سۆڤیەت نە تەنها بە مەبەستی داگیرکردنی ئازەربایجان بەڵکو تەنانەت بەمەبەستی هێنانە سەرکاری حکومەتی لایەنگری خۆیان لە ئێراندا مانەوە.

هـەر بەو جـۆرەی کـە دیتمـان، ئـەم پیلانـە لـە ئاکامی ئـەو بڕیارانـەی لـە ئـەرکانی سـوپادا و لـەژێر چـاودێری شەخسـی شـادا بـەڕێوەبران، پوچـەڵ کرایـەوە . هەرچـەند وەك پێشـتر بـاس کـرا ئـەو هـێزەی بـە فـەرمانی مـن بـۆ ئازەربایجـان ڕەوانـە کـرا، لـە قـەزوێندا بـەریان پێگـرت و ناچـار بەوەسـتان کـرا. بەڵام ئەمن شێلگیرانە درێژەم دا بە ناردنی چەك وکەلوپەلی سەربازی و چەند دەزگایـەکی بێتـەل و، هـێزی بـەرگری نیشتمانیشـم لـە ژێـر فـەرماندەیی چـەند کەسێکی باوەڕپێکراو دا ڕێکخسـت، هێڵـی بەرگریشـم لـە ناوچـەکانی قـوم و ئەراك و هەمەداندا لە نێو عەشیرەتە نیشتمان پـەروەرە ئازەرییـەکانی (خەمسـە) دا دامەزران .

پیلانی سۆڤیەتەکان لە پاش ئەوە، هێرش کردن بوو بۆ سەر تاران، لەلایەن دوو سـوپای ڕزگـاری بەخشـی ئازەربایجانـەوە کـە بـەقزلباش نـاودەبران و بـە هاوشێوەی سـوپای سـووری سـەردەمی شـۆڕشـی ئۆکتۆبـەری روسـیا ڕێکخـرا بوون، قەرار بـوو لـە هـەمان کاتیشـدا تـابوری پێنجـەمی تودەییـەکان لـە تاراندا ڕاپەڕن، بەڵام بەهۆی بەهێز کردنی هێزەکانی تارانـەوە لەلایـەن ئـەو هێزەی کـە لەباشـوورەوە هێنرابوون، ئـەم پیلانەشیان پووچـەڵ کرایـەوە. لـەم کاتەشـدا بـە هـۆی نـاردنی چـەك و پـارەوە بـۆ نێـو عەشـایرو خـەڵکی نیشـتمان پـەروەری خەمسەو گەیلان و ئازەربایجان، ڕێ لە پێشڕەوی کۆمۆنیستەکان گیراو لـەبری پێشڕەویکردنیان بەرەو باشوور، ڕووەو چیاکان ڕاونران.

لەم کاتەدا دەوڵەتی ئێران بەمەبەستی کشانەدوای هێزەکانی سۆڤیەت لە خاکی وڵاتەکەیدا، لە ئەنجومەنی ئاسایشدا لە دژی سۆڤیەت شکاتی کرد.

کاربەدەستانی سۆڤیەتیش بەسەرنجدان لەو هێزو توانایەی کە لە ئێراندا هەیانبوو، بەشێوەیەکی هەمەلایەنە داوای پێدانی ئیمتیازی نەوتی باکور و بەڕەسمی ناساندنی حکومەتی خود موختاری ئازەربایجانیان لە دەوڵەتی ئێران دەکرد. حکومەتی ئێرانیش لەفکری کات بووریـن و نەدانی هیچ جۆرە بەهانەیەکدا بوو بە دەستی سۆڤیەتەکان بۆ درێژەدان بە داگیرکردنی ئازەربایجان. هەر لەبەر ئەوە هەرچەند هێزێکی تەواو لە تاراندا کۆکرابۆوە، بەڵام لە هێرش کردن بۆ سەر ئازەربایجان خۆڵادەدراو تەنها عەمەلیاتی پەرت و بڵاو لە لایەن هێزی چریکییەوە بەسەر پەرشتی چەند میرێکی باوەڕپێکراو بەرێوە دەبرا.

هەلومەرجی کوردستان لەگەڵ ئازەربایجاندا، تەواو جیاوازبوو، چونکە دەوڵەتی ئێران لەو ناوچانەدا، چیتر تەنها لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکی تازەکارو بێ ئەزموونێدا، کە بەخێرایی چەکدار بووبن، سەروکاری نەبوو، بەڵکو مامەڵەی لەگەڵ جەنگاوەرانی چەکداری کوردا دەکرد کە بە ژیان لەو ناوچە شاخاوی وکوێستانە ساردانە دا ڕاهاتبوون و لە ئەشقی سەربەخۆیشدا خرۆشابوون.

ئەم هێزانەی کورد، قەرار بوو هێڵی باریکی هێزەکانی ئێران بشکێنن و ڕوەو باشوور پێشرەوی بکەن، تا ئوستانی کوردستان (سنە) داگیربکەن و نزیك بەیەك ملیۆن کوردی ئەو ناوچانە بکەنە هاودەست و هاوکاری خۆیان.

هەر لەبەر ئەوە لە پاش چۆڵکردنی قەزوێن لەلایەن روسەکانەوە، بەشێك لە هێزی ئێران لەو ناوچەیەدا، بەمەبەستی بەهێزکردنی هێزی سنە و سەقز گواسترایەوە بۆ ئەوێندەر .

لە 21ی نیساندا 1946دا، هێزێکی بچووك لە بانەوە بەرەو سەردەشت ڕەوانەکرا وبەبێ کێشەو گرفت گەشتنە ئەو شارە.

لە 29ی نیساندا، هێزێکی نزیك بە 600 نەفەر (لە هێزی سوارەو پیادە لەگەڵ یەك تۆپی چیاییدا) بەرەو (قارئاباد) حەرەکەتی کرد، بەڵام بەهۆی کەمتەرخەمی و مسۆگەر نە کردنی هێزی پشتیوانی سەربازی لە بەرزاییەکانی چیای (ئەلماڵو) دا، لە کاتی جموجۆڵی هێزەکەدا بەرەو سەقز (کە کوردەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو)، لەلایەن هۆزەکانی فەیزوڵلا بەگی و گوریکەوە کە جەنگاوەرانی بارزانی پشتیوانیان لێدەکردن، زیانێکی گەورەیان تێسرەواندن و ناچار بە پاشەکشێ کران. لەم شەڕەدا حەمە ڕەشید خان کە پلەی ژەنراڵی پێدرابوو بەشداری کرد. هاوکات لەگەڵ ئەم بارودۆخە دا هێزێکی چەکدار لە هۆزەکانی هەرکی و گوریك (کلاشی) پەلاماری پشت ڕەبەت (ربطە) یان دا، بەڵام لەلایەن هێزی دەوڵەتەوە پاشەکشێیان پێکراو ڕاونران.

لە مانگی مایسدا، لە پاش چۆڵکردنی ئازەربایجان لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە ، پیشەوەری ڕابەری حکومەتی خودموختاری ئازەربایجان بە مەبەستی وتووێژ دەربارەی ڕێکەوتننامەی سۆڤیەتو قەوام ئەلسەلتەنە[69] هاتە تاران.دەوڵەت بە مەبەستی ئەوەی کە ڕێ لەم وتووێژانە بگرێ سیاسەتێکی بێلایەنانەی لە پێش گرت و لە هەمان کاتیشدا خۆی بۆ جەنگ لەگەڵ کوردو ئازەربایجانییەکاندا ئامادە دەکرد. لەم کاتەدا (ژەنراڵ ڕەزم ئارا) کە دواتر بووە سەرۆکی ئەرکان و سەرۆك وەزیرو لە ساڵی 1951 دا تیرۆرکرا، وەك نوێنەری سوپا چووە ڕۆژئاوای ئێران.

ڕەزم ئارا سەرانی کوردی بۆ بەشدار بوون لە کۆنفرانسێکدا، بانگ کرد بۆ

[69] -قەوام ئەلسەلتەنە: (1870-1954) بەئەزموونترین سیاسەتمەداری سەردەمی قاجارو پەهلەوی بوو. چەندین جار پۆستی سەرۆك وەزیری ئێرانی لە ئەستۆدابووە. گەلێك ژیرانە ئیدارەی کێشەی ئازەربایجان و کوردستانی کرد و کۆتایی بەحکومەتی میللی ئازەربایجانو کوردستان هێنا، کە لەو سەردەمە دا سەرۆك وەزیری ئێران بوو. (و)

سەقز. لەئاکامی ئەم کۆبوونەوەیەدا هەردوولا لەسەر ئەم ڕێکەوتننامەیەی خوارەوە پێکهاتن:

1–بەر پرسانی حیزبی دیموکرات فەرمان بە هێزەکانی خۆیان ئەدەن کە خۆیان لە تەقەکردن لە دژی هێزەکانی دەوڵەت بپارێزن و لەو شوێنانەی کە دەستیان بەسەرداگرتوە زیاتر پێشڕەوی نەکەن و ڕێ لە ئازادی هاتوچۆی ڕێگا و بانەکانیش نەگرن .

2–بەمەبەستی ڕێگرتن لەسەر هەڵدانی هەر جۆرە پێکهەڵپڕژانێکی چەکدارانەدا، تا نزیک بە چوار کیلۆ مەتر لەسەقزەوەو سێ کیلۆمەتر لە باکوری سەردەشتەوە پاشەکشێ دەکەن.

3–هەم کوردەکان و هەم دەوڵەتی ئێران ڕێ لە بەهێز کردنی بنکە سنوورییەکانی خۆیان دەگرن و فڕۆکە جەنگییەکانی ئێرانیش مۆڵەتیان پێنادرێ کە زیاتر لە چوار کیلۆ مەتر ڕوەو باکوری ئاسمانی سەقز بفڕن.

4–بە مەبەستی ڕێگرتن لە هەر جۆرە بەدحاڵیبوونێك، حیزبی دیموکراتی کوردستان سێ نوێنەری لە شارەکانی سەقز و بانە و سەردەشتدا دەبێ، کە نێوانگری پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان دەوڵەتی ئێران و کوردەکان دەبن.

5–کاتی بەڕێوەبردنی خاڵی سێهەم، (حەوتی خورداد)ڕێکەوتی 28ی مایس دەبێ لە کاتژمێر 8 ی بەیانیدا.

لەلایەن کوردەکانەوە سەروان عێزەت عەبدولعەزیز ئەم ڕێکەوتننامەیەی ئیمزاکرد. هەم هێزی دەوڵەتی ئێران و هەم کوردەکان دەیانویست بە سوود وەرگرتن لەم ڕێکەوتننامەیە پاڵ بە کاتەوە بنێن و هێزی خۆیان سەقامگیربکەن، ئێران دەیویست لە پاش جێگیرکردنی هێزی تەواو، هێرشی سەرتاسەری خۆی دەست پێبکات و کوردەکانیش بە نیاز بوون لە پاش دەستگرتن بە سەر شارەکانی بانە، سەقز، سەردەشتدا بەرەو ئوستانی کوردستان (سنە) پێشڕەوی بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش لە گشت ناوچە

شاخاوییەکانی دەوروبەردا لە پێناو ڕێنەدان بە بەهێزکردنی سەربازخانەکانی ئێران دەستدرێژییان دەکردە سەر ئەو هێزانەی ڕەوانەی ئەوێ دەکران. لە پاش چەندین ناڕەزایی و سکالانامە، کە بە هۆی دەستدرێژی کوردەکانەوە بۆ سەر هێزی دەوڵەت درا بە قازی محەمەد و بێ سوود بوو. دەوڵەت بڕیاریدا هێزەکانی لە سەقز و تەکاب و بانەو شوێنەکانی دیکەدا بە هێز بکات، بۆ ئەم مەبەستەش هێزەکانی نیشتەجێی هەمەدانی گواستەوە بۆ ئەو ناوچانە.

هەر لەم کاتەدا ڕێکەوتننامەیەکی دیکەی هاوشێوەی ئەوەی لەگەڵ کوردەکاندا بەسترا بوو، لەگەڵ فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانیشدا مۆرکرا. لەسەرەتای حوزەیراندا، کوردەکان زۆربەی هێزەکانی خۆیان لە ناوچەکانی سەقز و سەردەشت و میاندواو دا جێگیر کرد، بە پێی ئەو پەیمانەی لەگەڵ ئازەربایجانی هاوپەیمانی خۆیاندا هەیانبوو، هەروەها بە هیوای پشتگیری روسەکانیش ، بایەخیان بە پارێزگاری و چاودێری کردنی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی خۆیان نەدا. بەلام هۆزەکانی میلانی، جەلالی، حەیدەرلو و شوکاك لە ناوچەکانی باکوردا وایان بە چاك زانی کە لە شەڕی ناوچەکانی باشوردا بەشدار نەبن.

ژمارەی هێزە چەکدارەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە هۆی چەندین گرفتی جیاوازو دژوارەوە، بە وردی نەدەزانرا. دەکرێ بووترێ کە لە ناوچەکانی باشور و باشوری ڕۆژهەلاتی مەهاباد نزیکەی 12هەزار چەکدار دەبوون. چوار هەزار چەکداریش لە باکوری مەهاباد جێگیر بوون، سێ هەزار کەسی دیکەش بە هۆی نەبوونی چەکی تەواوە وە یا بە هۆی تایبەتییەوە نەچوونە پاڵ ئەم هێزانەوە.

زۆربەی ئەم چەکدارانە سوارە و خاوەن ئەسپی ڕەسەن و چاپوك بوون. کوردەکان هەرگیز بە شمشێر یابە غەدارە نەدەجەنگان بەلکو تەنها خەنجەرەکانیان لە شەڕی دەستەو یەخەو ڕووبەڕوودا بە کاردەهێنا.

گەلێك جار ئەوان بە شێوەی سوارەی پەرت و بڵاو هێرش دەکەنە سەر دوژمنانی خۆیان و کاتێك تەواو نزیك دەبنەوە لە سواری ئەسپەکەیان دێنە خوار و چەکە گەرمەکانی خۆیان بەکاردێنن. هەندێ کات هەر ئەسپەو دوو سواری لەسەر دەبێ و لەپاش نزیك کەوتنەوەیان لە دوژمن یەکێکیان دێتە خوار و ڕووبەڕوو خۆی لە دوژمن نزیك دەخاتەوە، لە حاڵێکدا کە بەرێك و پێکی تەقە دەکات، لەم کاتەدا ئەوی دی لەپشت گردو کێوە نزیکەکانەوە لەحاڵی غاردانی ئەسپەکەیدایەو چاودێری لەو دەکات. گەلێك جار ئەوانم دیتووە کە لە کاتی غارداندا تەقە دەکەن بێ ئەوەی ئامانج گیریان کردبێ‌و زیاتر ئەم کارەیان بە مەبەستی ترساندنی دوژمن ئەنجام ئەدەن. تاکتیکی باوی ئەوان بریتی یە لە گەماڕۆدانی دوژمن لە ڕێگەی دەستبە سەراگرتنی ئەو کەژوکێوە بەرزانەی کە بەسەر دوژمندا زاڵ‌و باڵا دەستن، پاشان بازنەی گەماڕۆدانەکەیان تەنگ دەکەنەوەو ئەوان ناچار بە خۆبەدەستەوەدان دەکەن.

هەرچەندە من لە ساڵی 1921دا، لە دژی شوکاك‌و کورسنی‌یەکان، هەروەها لە ساڵی 1927یشدا لە دژی مەریوانییەکان جەنگابووم، بەڵام تەنها جارێك لە نزیکەوە شەڕی دەستەو یەخەم لەگەڵ ئەواندا دیتووە، ئەویش لە بەرەبەیانی ڕۆژی 24ی حوزەیرانی 1922دا بوو، ئەو کات کوردەکان هێرشیان کردە سەر گوردانی پیادەی پەهلەوی، ئەوان نەریتیان وابوو کە وەك عەرەبەکانی جەزائیر لە جەنگی دژ بە فەرەنسییەکاندا، لە کاتی هێرش و پەلاماردانا ئەیانحیلان، لەم شەڕانەدا تەنانەت ژنانی ئەوانیش بەشدار دەبوون، بە تایبەتی ئەوکاتەی کە مەیدانی شەڕو پێکهەڵپژان لە گوند و ڕەشماڵەکان نزیك دەکەوتەوە.

لە 15ی حوزەیرانی 1946دا، لەبەر ئەوەی بە بەردەوامی هێڵی گواستنەوەو هاتوچۆی نێوان سەقز دەکەوتە بەر هێرش و پەلاماردان، ئەم هێرشانەش زیاتر لە نزیك گردەکانی (خیدەر) و(هیجانان)دا ڕوویان ئەدا، بڕیاردرا کە دەست بەسەر ئەو گردو کێوانەدا بگیرێ. بۆ ئەم مەبەستەش گوردانێکی پیادە

کە لەلایەن دوو بەتالیۆنی سوارەو چەند تانك و تۆپێکی چیاییەوە پشتیوانیان لێدەکرا، بەرەو ئەو ناوچەیە حەرەکەتیان کرد. لە پاش شەڕێکی ئێجگار سەخت کە لە گەڵ هێزی حەمە ڕەشیدخاندا ڕوویداو تیایدا هەردوو لا زیانێکی قورسیان لێکەوت، ئەم گردو کێوانە لە لایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە کۆنترۆڵ کران، ڕۆژی دواتریش دژە هێرشی کوردەکان پاشەکشێی پێکرا. هەر بۆ هەمان مەبەست لە پاش کۆبوونەوەی قازی محەمەد لەگەڵ ژەنراڵ ڕەزم ئارادا لە گوندی (سەرا)ی نزیکی سەقزدا، ڕەزم ئارا توانی قازی محەمەد بەوە ڕازی بکات کە کوردەکان بەردەوام بن لەسەر پەیڕەوی کردن لە بەندەکانی ڕێکەوتننامەی دوولایەنەی نێوانیان. لەپاش ئەمە، گواستنەوەو هاتوچۆی سوپا لەسەقزەوە بۆ بانەو سەردەشت، بە بێ کێشە و گێچەڵ بەڕێوە دەچوو. ئەم شەڕە هەم لەلای کوردەکان و هەم لە لای سوپای ئێران بە ناوی شەڕی مامە شاوە (ناوی یەکێك لە گوندەکانی شوێنی شەڕەکەوە) ناسراوە.

لە مانگی مایسدا، سوپای سۆڤیەت خاکی ئێرانی چۆڵکرد، چەند ڕۆژێك بەر لەو ڕووداوە، وەفدێك بە سەرۆکایەتی پیشەوەری هاتە تاران تا دەربارەی بەرەسمی ناسینی خود موختاری ئازەربایجان لە چوارچێوەی وڵاتی ئێراندا گفتوگۆ بکەن. ئەم وتووێژانە بە تایبەتی بەهۆی خواستی سەرانی فیرقەی دیموکراتەوە لەمەڕ پێکهێنانی سوپای سەربەخۆ و جودا لە سوپای ئێران، ڕووبەڕووی شکست بۆوە.

پیشەوەریش تارانی بەرەو تەورێز بەجێهێشت. قەوام ئەلسەلتەنەی سەرۆك وەزیری ئێران، بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوەو لەم بەیاننامەیەدا نیازپاکی خۆی دەربڕیو ئۆبالی نەگەشتنە ڕێکەوتنیشی خستە ئەستۆی پیشەوەری. سۆڤیەتەکان بەئارەزوو بوون کە ئەو وتووێژانە بە سەرکەوتوویی بەئەنجام بگات، لەبەر ئەوە فشاریان بۆ فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان هێنا تاسەر لە نوێ دەست بە وتووێژ بکاتەوە.

لە 20ی ئابدا، وەفدێک بە سەرۆکایەتی (شبستەری) سەرۆک کۆماری ئازەربایجان و (پەناهیان) سەروانی هەڵاتووی سوپای ئێران کە لەم کاتەدا لە پلەی ژەنراڵیدا بوو، بە مەبەستی گفتوگۆ کردن سەبارەت بە ڕەسمی ناسینی هێزی چەکداری ئازەربایجان لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە هاتە تاران، لەم وتووێژانەدا، (شا) بە خۆی بە هۆی ناڕەوایی ئەم خواستەوە کە ڕاستەوخۆ دەبووە هۆی جیابوونەوەی ئازەربایجان لە ئێران، داواکانی ئەوانی ڕەتکردەوە، هەوڵەکانی باڵوێزی سۆڤیەتیش (سادچکێف) کە دەیویست دوو لایەن لەم بارەوە بە ڕێکەوتن بگەیەنێ، بە ئاکام نەگەشت و وەفدی ناوبراو بە نائومێدییەوە تارانیان بەجێهێشت.

لەم وتووێژانەدا کوردەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشدار نەبوون، بەڵام دواتر زانرا ناوچە کورد نشینەکانی ئازەربایجان کە لەژێر دەسەڵاتی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا بوو، وەک بەشێک لە کۆماری ئازەربایجان لەبەرچاو گیرابوو، بەمجۆرە ئوستانی کوردستان لە نێو خشتەی وتووێژەکاندا سڕابۆوە. لەبەر ئەوە ڕابەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بڕیاریاندا کە کوردستانیش داگیربکەن تا بەم شێوەیە هەر جۆرە ڕێکەوتن و پێکهاتنێک لە ئایندەدا ئەم ناوچانەش بگرێتەوە، بەڵام ئەم پیلانە وەک دەزانین پووچەڵ کرایەوە و تەنانەت هەندێک لە خێڵە کوردەکانی وەک تیلەکۆییەکان ئامادەبوون لەگەڵ دەوڵەتدا هاریکاری بکەن.

بەپێی ڕێکەوتننامەی قەوام-سادچکێف بڕیار بوو ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی باکور بە روسەکان بسپێردرێ، لەسەر بناغەی 51 بەش بە سوودی روسەکان و 49 بەش بەسوودی ئێران بەڕێوەببرێ.

قەرار بوو ئەم ڕێکەوتننامەیە، لە پێشدا لەلایەن مەجلیسی ئێرانەوە پەسەند بکرێ و دواتر بچێتە قۆناغی جیبەجێکردنەوە، بەڵام هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی پانزەهەم بە بەهانەی داگیرکردنی ئێران لە لایەن هێزەکانی بێگانەوە

دواخرا. سۆڤیەتەکانیش بەهیوای ئەوەی کە چۆڵکردنی ئێران لە هێزەکانیان ببێتە هۆی پەسەندکردنی ڕێکەوتننامەکە ، ئێرانیان چۆڵکرد.

قەوام ئەلسەلتەنە ڕایگەیاند بە مەبەستی ئەوەی کە هەڵبژاردنی مەجلیسی پانزەهەم لە کەشێکی بێ ترس و بێ فشاردا بەر گوزار بکرێ . دەبێ سەرتاسەری ئێران ، بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت و سوپای شاهنشاوە.

روسەکانیش بەنیازبوون، بەڵکو لە پاش هەڵبژاردنی مەجلیس و بەڕەسمی ناسینی خود موختاری ئازەربایجان، دووبارە بتوانن ئایدۆلۆژی کۆمۆنیزم و ئابوریو سیاسەتی سۆڤیەت لەسەرتاسەری وڵاتدا پەرەپێبدەن . لە مانگی ئۆکتۆبەردا، فەرمانداری نوێی ئازەربایجان کە لەلایەن دەوڵەتی مەرکەزییەوە و بەڕەزامەندی پیشەوەری و قەوام ئەلسەلتەنە کرابووە ئەندامی دەوڵەتی ناوخۆی ئازەربایجان، دەربارەی گۆڕینەوەی ناوچەی (خەمسە) لەگەڵ سەردەشت و تەکاب دا لەگەڵ خودی قەوام دا کەوتە وتووێژکردن. لەبەر ئەوەی (خەمسە) بەشێك نەبوو لە ئازەربایجان بەڵکو لەلایەن چەکدارانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانەوە داگیر کرابوو،قەوام ئەلسەلتەنە بڕیاریدا بەمەبەستی ڕازیکردنی روسەکان وچەپەکانی نێو کابینەی ئێران، بەم ئاڵوگۆڕە ڕازیبێت، بەڵام کاربەدەستانی سەربازی ئێران-وەزیری بەرگریو سەرۆك ئەرکانی سوپا-بەفەرمانی شا بە توندی لەبەرامبەر ئەم ڕازیبوونەدا بەرهەڵستیان کرد و نەیاربوون.

سەرەنجام سوپا بڕیاری داگیرکردنی ناوچەی (خەمسە)ی داو لە هەمان کاتیشدا بەنیازبوو سەردەشتو تەکابیش لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بێت. لەبەر ئەوەی ئەم ناوچانە بایەخێکی ستراتیژی گرنگیان هەبوو بۆ بەرگری کردن لە ناوچەکانی کوردستان و هەمەدان. هەروەها بۆ ئەگەری هێرشو داگیرکردنی ئازەربایجانیش گەلێك هەموارو گونجاو بوون. قازی محەمەدیش کە بۆ ئەم مەبەستە هاتبووە سەقز تا لە بارەی گۆڕینەوەی (خەمسە) لەپای سەردەشت و

تەکاب دا، لەگەڵ ژەنراڵ (همایۆن)دا وتووێژ بکات، بەدەست بەتاڵی گەڕایەوە مەهاباد.

لەشکری سێهەم چووە پاڵ ئەو سەربازانەی ئێران کە لە قەزوێن دا جێگیربوون، ژەنراڵ میر حسێن هاشمی (کە کەسایەتیەکی دیارو ناسراوی تەوریز بوو) کرایە فەرماندەی ئەم سوپایە.

لە 22ی نۆڤەمبەری 1946دا، لەشکری سێهەم بەرەو زنجان پێشڕەوی کرد. دووباڵی ئەم سوپایە لەلایەن هێزی ڕێکنەخراوی خێڵی ئەفشارەوە، لەژێر سەرپەرشتی سەرانی خۆیان و دووئەفسەری سوپادا (سەروان بایندەر) و(سەرگورد بەختیار)دا، پشتیوانیان لێدەکرا. پێشەنگی سوپا،کە بریتی بوون لە یەکەکانی مۆتۆریزە، لە کاتژمێر یانزەی شەودا گەشتنە زنجان. ڕووبەڕووی هیچ جۆرە بەرگرییەك نەبوونەوە و فیدایانی فیرقەی دیموکرات لە ترسی تۆڵەی خەڵکیدا بە خێرایی پاشەکشێیان کرد.

هێڵی سەرەکی بەرگری دیموکراتەکان لە ( قافلان کوە) دا بوو، لە دەوروبەری ئەم شوێنەدا نزیکەی هەزارو پێنج سەد چەکدار بە چەکی هەمەجۆرەوە، بەڵام بەبێ تۆپخانە، جێگیر ببوون .

لە کۆبونەوەی نێوان شاو قەوام ئەلسەلتەنەی سەرۆك وەزیرو، وەزیری بەرگری‌و ، سەرۆك ئەرکانی گشتی سوپادا بڕیاری لەشکرکێشی بۆ ناوخۆی ئازەربایجان درا. لەم کۆبونەوەیەدا قەوام ئاماژەی بە مەترسی کاردانەوەی سۆڤیەتەکان کرد. بەڵام (شا) بەر پرسیاریەتی هێرشەکەی لە ئەستۆگرت و فەرمانی پێشڕەوی کردنی بەرەو ئازەربایجان دەرکرد. سوپای سێهەم لە زنجان‌و سوپای چوارەم لە سنەدا بەشێوەیەکی ئاشکرا بە هێزکران. هێزێك کە لە 22 گوردان و 4 تیپی سوارە و2تۆپی چیایی و 2 تۆپی بیابانی وسێ تانك پێکدەهات لە ناوچەکانی خەمسەو کوردستاندا دامەزران.کە لەم کاتەدا کۆی هێزی دەوڵەت لەو ناوچەیەدا خۆی ئەدا لە 17000 سەرباز و 3 هەزار چریك.

فیرقەی دیموکراتیش لە بەرەی (خەمسە) دا نزیکەی 18000 فیدایی و قزڵباشی کۆکردبۆوە و لە سنوورەکانی کوردستانیشدا هێزی پێشمەرگەی کورد خۆی ئەدا لە 12 هەزار چەکدار کە زۆربەی هەرە زۆریان، جگە لە دوو هەزار پێشمەرگەی هێزی ڕێکخراوی مەهاباد. هێزی ناڕێکخراوی چریکی بوون. لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت و سەر پەرشتیارانی روسیدا، توانای جەنگی هێزی ئازەربایجان گەلەك هاتە خوارو ورەی ئەوان تەواو لاواز بوو. لێهاتووترین ئەفسەرانی ئەوان یەك دوو ئەفسەری هەڵاتووی سوپای ئێران بوون کە دەیانزانی لە حاڵی بە دیل گرتنیاندا هیچ ڕەحمێکیان پێناکرێ، بەو پەڕی مێرخاسی و سەرسەختییەوە جەنگان. چەکدارانی کورد جەنگاوەری بە توانا بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی رابەرانی ئەوان (سەرۆك عەشیرەتەکان) بڕوایان بەحیزبی دیموکراتی کوردستان نەبوو، لە پاش کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت، بە هێوری خۆیان لە حیزبی دیموکرات دوور خستەوە و خۆیان لە سوپای ئێران نزیکتر دەکردەوە. تەنها بارزانییەکان بە دڵ و گیانەوە دەجەنگان، بەڵام بە هۆی دوورە وڵاتی و هەست کردن بە نامۆیی لە نێو خێڵ وعەشیرەتەکانی دیکەداو، نەبوونی هاوپەیمانێکی بە متمانە و باوەڕ پێکراو هەلو مەرجی ئەوان ڕۆژ بە ڕۆژ دژوار تر دەبوو. ئیدی ئەوانیش نەك لە پێناو سەربەخۆیی کوردا، بەڵکو لە پێناو پاراستنی بوون و ژیانی خۆیاندا تێدەکۆشان.

ڕاستەوخۆ لە پاش داگیرکردنی زنجان، شا بە فڕۆکە گەیشتە ئەوێندەر و فەرمانی پێویستی لە بارەی داگیرکردنی ئازەربایجان و پێشڕەوی کردنی بەرەو تەورێز ڕاگەیاند.

سوپاش لە ژێر فەرماندەیی میرحسێنی هاشمی دا، لە ئەرزنجانەوە بەرەو ڕێگای (میانە) کەوتەڕێ .

سوپای چوارەمی کوردستانیش لە ژێر فەرماندەیی ژەنراڵ همایۆنی دا

حەرەکەتێکی بازنەیی بەرەو شاهێن قەڵا- میاندواو - مەهاباد دەستپێکرد، تا ڕێگا لە پاشە کشێی بارزانییەکانیش بگرن.

هێزێکیش لە ڕەشت و (ئاسترا)وە بەرەو دەریای خەزەر کەوتەڕێ تا پەیوەندی بە شاهسونەکانەوە بکەن کە بەشێوەیەکی نهێنی لە لایەن منەوە چەکدار کرابوون.

لە دووەمی دیسەمبەردا، پێشەنگی سوپای چوارەم (سەرچەم)یان داگیر کرد، کە کەوتبووە سەر ڕێگای (میانە)وە.

ڕۆژی پێنجی دیسەمبەر، بەشە سەرەکییەکانی سوپا بەرەو میانە حەرەکەتیان کرد، دیموکراتەکان پردی (قزل ئوزن)یان تەقاندەوە و ئەو هێڵی بەرگرییەی کە لەدەووربەری میانەدا پێکیانهێنابوو، لەبەری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وە لەلایەن سوپا و هێزی چریکییەوە کەوتە بەر هێرش و پەلاماردان، لە پاش شەڕو پێکدادانێکی کورت، لەبەر ئەوەی دیموکراتەکان ورەی خۆیان لە دەست دابوو، ڕوەو تەورێز پاشەکشێیان کرد، (میانە)ش لە لایەن سوپاوە کۆنترۆڵ کرا.

لە 10ی دیسەمبەردا، کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ، وێڕای تاریکیش، سوارەی غەیرە نیزامی، کەوتنە شوێن سوپای فیداییەکان کە ڕوەو (تورکمان چای) هەڵاتبوون، زیانێکی زۆریان پێگەیاندن. ڕۆژی دواتر کاتێك خەڵکی تەورێز لە شکستی دیموکراتەکان بە خەبەر هاتن، لە دژی ئەوان ڕاپەڕین و هەڵیان کوتایە سەر فەرمانگە دەوڵەتیەکان و هەر ئەندامێکی فیرقەی دیموکراتیان بەردەست کەوت کوشتیان.

پیشەوەری و ژمارەیەکی زۆر لە وەزیرەکانی بەرەو سنوور هەڵاتن و پەنایان بردە بەر یەکێتی سۆڤیەت، تەنها (بێریا) کەوتە دەست خەڵکی کە ئەویان لەتوپەت کرد. لەپاش شەڕی (قافلان کوە)، سوپای ئێران چیتر لەگەڵ بەرەنگاریدا ڕووبەڕوو نەبۆوە. بەڵکو لە هەموو شوێنێکدا لەلایەن خەڵکییەوە

پێشوازی لێکرا. تەنانەت لە ناوچە کوردنشینەکاندا پێشڕەوی کردنی سوپا ئاسانتر بوو. لە باکوری ڕۆژئاوای میانەدا (شوکاك)ەکان لە ناکاو ڕووبەڕووی ئازەربایجانییەکانی هاوپەیمانی خۆیان بوونەوە و ئەوانیان بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئازەربایجان ناچار بە پاشە کشێ کرد.

ڕۆژی حەوتی دیسەمبەر، ئەو هێزە سەربازییەی کە لە (تەکاب)دا دامەزرابوو، بەرەو شاهێن قەلا پێشڕەوی کرد. لە پاش چوار ڕۆژ شەڕ و پێکدادان لە بەرزایی کێوەکانی (سورسات)دا، (مین بار)و(شاهێن قەلا) یان داگیرکرد.

ڕۆژی سیانزەی دیسەمبەر، هێزی مۆتۆریزە، لە شاهێن قەلاوە بەرەو میاندواو دەستیان بە پێشڕەوی کرد، کە لە لایەن هێزی هەواییەوە پشتیوانییان لێدەکرا. لەوێدا گوردانێك لە هێزی فیرقەی دیموکرات خۆی دا بەدەست هێزی دەولەتەوە و سوپاش لەگەل پێشوازی خەلکیدا ڕووبەڕوو بۆوە.

کوردەکانی بارزانیش کە بە هانای دیموکراتەکانی ئازەربایجانەوە هاتبوون، کاتێك لە هەوالی شکستەکانی فیرقەی دیموکرات بەخەبەر هاتن بە بێ جەنگ بەرەو مەهاباد گەڕانەوە. (مراغە)ش لە لایەن هێزەکانی تەوریز و میاندواوە داگیرکرا. لەپاش داگیرکردنی میاندواو، کوردەکانی مەهاباد، بانە، سەردەشت و سەقز بەرەو زێدو ناوچە خۆجێیەکانی ژیانی خۆیان گەڕانەوە. سەرۆکەکانیشیان داوای بەخشین وخۆبەدەستەوەدانی خۆیان لە کاربەدەستانی سەربازی ئێران کرد.

لە حەقدەی دیسەمبەردا، قازی محەمەد و ڕابەرانی دیکەی کورد لە مەهاباد هاتنەدەروشاریان تەسلیم بە هێزەکانی ئێران کرد. ناوبراو و گشت ئەندامانی کابینەکەی بەدوای کۆبوونەوەیان لەگەل ژەنرال همایۆنی دا، دەستگیر کران.

مەلا مستەفا بارزانیش لەگەل ژەنرال همایۆنی دا کۆبۆوە و ڕەزامەندی

خـۆی ڕاگـەیاند کـە ئەگـەر دوو دەوڵـەتی عـێراق و بـەریتانیا لـەخۆیو عەشیرەتەکەی ببوورن ئامادەیە بگەڕێتەوە بۆ عێراق. بۆ ئەم مەبەستە بڕیار لەسەر ئەوە درا کە بارزانی بچێتە تاران تا چاوی بە باڵوێزی بەریتانیا بکەوێ. ناوبراو چەند حەفتە لە تاراندا مایەوە بەڵام وەڵامێکی ئـەوتۆی لـە باڵوێزی بـەریتانیاوە پێنـەدرا. بـەمجۆرە بـێ ئاکـام گەڕایـەوە نەغـەدە. (ئـەوکات بارزانییەکان بە هـەموو کەلوپـەلی ژیـان و خـاو و خێزانیانـەوە، چەکدارانـە لـە دەوروبەری نەغەدە دا نیشتەجێ بوون).

دەوڵـەتی ئێران پێشنیاری ئـەوەی کـرد ئەگـەر بارزانییـەکان ئامـادەبن بـە تـەواوی چەکـەکانیان تەسلیم بە دەوڵـەت بکـەن، ڕێـی نیشـتەجێ بوونیـان لـە کێوەکانی (ئەلوەند)ی دەوروبەری هەمـەداندا پێدەدرێ. مـەلا مستـەفا وەڵامـی ئەم پێشنیارەی بە ڕاوێژ و ڕەزامـەندی شێخ ئەحمـەدی برا گـەورەی سپارد. بەڵام لەبەر ئـەوەی نـاوبراو قـایل نـەبوو بـەم پێشـنیارە. مـەلا مسـتەفاش سـەر پێچی کـرد لەبەئەنجام گەیاندنی ئەم داوایە. بەمجۆرە دەوڵـەت هوشـیاری دا پێیان کە بێ هیچ جۆرە گرێنتییـەك بگەڕێنـەوە بۆ عـێراق یـاخود چەکـەکانیان تەسـلیمی کاربەدەسـتانی دەوڵـەتی ئـێران بکـەن، دەنـا بـەزۆر چـەکیان لێدەسێندرێ. کاتێك هیچ جـۆرە وەڵامێکیـان بـە دەوڵـەت نەدایـەوە. سـوپای ئێران نەغەدەشیان داگیر کرد. بارزانییەکان بەرەو شنۆ پاشە کشێیان کرد. ئەم شـارەش لەلایـەن هێزەکـانی دەوڵەتـەوە دەسـتی بەسـەرداگیرا، بارزانییـەکان ڕوویـان کـردە چیاکـانی ناوچـەی مەرگـەوەڕ و تەرگـەوەڕو هـەرکی. سـەرۆك عەشیرەتی هەرکی لە سەرەتادا بە میهرەبانییەوە ڕەفتاری لەگەڵ بارزانییەکاندا کـرد، بـەڵام دواتـر بـە هـۆی گەشـتنی هێزی دەوڵـەتی لـە (ورمـێ) وە کەشـوێن بارزانییەکان کەوتبوون. ڕەفتاری خۆی بەرامبەر بـەوان گـۆڕی و دەسـتیکرد بـە ئازاردانیـان. لـەم کاتـەدا بارزانییـەکان کـە لەلایـەن هـێزی دەوڵـەت و هۆزەکـانی مامش و زرزاوە لە ژێر فشـار دابوون، لـە پاش زنجیرەیـەك شـەڕو پێکدادان لـە

25ی نیسانی 1947دا، بەرەو نێو خاکی عێراق پاشە کشێیان کرد.

لە 31ی مارتی 1947دا، قازیمحەمەدو سەدری قازی برای (کە نوێنەری پێشووی مەجلیسی ئێران بوو) لەگەڵ سەیفی قازی پسمامیان لە پاش دادگایی کردن لە دادگای سەربازیدا بە تۆمەتی (خیانەت)مەحکوم بە مەرگ کران و لەشاری مەهابادا لە سێدارەدران . بەمجۆرە یاخیبوونی کورد لە مەهابادا کۆتایی هات.

هۆی هەرەسهێنانی خێرای شۆڕش لەگەڵ چوونە دەری هێزەکانی سۆڤیەتدا ئەوە بوو کەهیچ جۆرە ئیرادە و شێلگیرییەك، لە پێناو خەباتی تادوا هەناسە دا لە نێو کوردەکانی ئێراندا، بوونی نەبوو. ئەو سەربەخۆییە نادیارەی کە لە ژێر چاودێری کۆمۆنیستەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجاندا یا سۆڤیەتەکاندا بەوان بەڵێن درابوو. بەهای ئەوەی نەبوو قوربانی لە پێناودا بدرێ. لە نێو سەرانی کوردیشدا هیچ جۆرە تەبایی و یەکبوونێك لە ئارادا نەبوو. ئەگەر کوردەکانی شوکاك بە سەرۆکایەتی سمکۆ لە سالانی 1919-1921دا بەشێوەیەکی گەلێك دلێرانەتر و جوامێرانەتر جەنگان، لەبەر ئەوە بوو کە یەکەم لە ژێر سەرۆکایەتی یەك سەرکردەدا بوون و دووەم ئومێدی تالانکردنی گوندە تورك نشینەکان لە کایەدا بوو.

لەمانگی مایسدا. مەلا مستەفا درکی بەوە کرد کە دەوڵەتی عێراق هێشتا شۆڕشی ئەوی لە ساڵی 1945دا لە بیرنەکردووەو، سەرباری ئەوەش ژمارەیەك لە هاوکارانی ئەو وەك عێزەت عەبدولعەزیزو محەمەد قودسی ومستەفا خۆشناو و خێروڵلا عەبدولکەریم، پاش دادگایی کردن مەحکوم بەمەرگ کران.

کاتێك بارزانی دڵنیابوو ژیانی خۆشی لەمەترسیدایە، بڕیاریدا کە لە پاش پەڕینەوە لە ناوچە سنوورییەکانی تورکیا و ئێران پەنا بەرێتە بەر یەکێتی سۆڤیەت. بۆ ئەم کارە نزیك بە 500 چەکداری سەر بژاردەی بارزانی هەڵبژارد و لە پاش بڕینی 350 کیلۆ مەتر لە ماوەی دوو حەفتەدا خۆیان گەیاندە یەکێتی سۆڤیەت. لەم گەشتەدا تەنها یەکجار لەگەڵ هێزی ئێراندا ڕووبەڕوو بوونەوە.

بارزانی بۆ ماوەی 11 ساڵلە یەکێتی سۆڤیەتدا مایەوە. لەم ماوەیەدا روسەکان بەوریایی چاودێرییان دەکردو ئەویان بۆ ڕۆژێك لەبەر چاو گرتبوو کە بەڵکو هەلی گونجاو لە هەریەك لە وڵاتانی ئێران یا تورکیاو عێراقدا فەراهەم بیٚ. ئەم بارزانیانە بۆ ماوەیەك لە ناوچەی نێوان شابەخت و نەخچەڤاندا نیشتەجیٚ کران، پاشان گواسترانەوە بۆ ناوچەی زنگزور لە ئازەربایجانی سۆڤیەتدا، لەم ناوچەیەدا نزیك بە 60 هەزار خێزان ژیان بەسەر دەبەن. ئەوان لە گوندەکانی دەوروبەری شاری گاروسیدا نیشتەجێکران و 12 ئەفسەری سۆڤیەت کە کوردو موسوڵمان بوون، لێپرسراوی ڕاهێنان و مەشق پێکردنی ئەوان بوون، خوێندن و نوسینی کوردی و روسییان بە ئەلف و بێی روسی فێرکراو هەروەها زانیارییان دەربارەی جەنگە نوێیەکانی پارتیزانی بۆ ڕاڤە دەکردن.

لەماوەی نیشتەجێکردنی ئیجباری ئەوان لە روسیادا، هاتوچۆیەکی نهێنیانەی زۆر لە کوردستانی عێراقەوە بۆ ئازەربایجانی سۆڤیەت، لە ڕێگای سنوورەکانی ئێرانەوە ، ئەنجام ئەدرا، ئەم تەتەرانە هیچ کات ماوەیەکی زۆر لە ئێراندا نەدەمانەوە، چ بە هۆی ترسی دەستگیرکردنیان لەلایەن هێزی نیزامی ئێران یا لە لایەن پیاوانیئەو عەشیرەتانەوە کە لەگەڵ بارزانییەکاندا دوژمنایەتییەکی کۆنینەیان هەبوو، بەهۆی کوشتنی 12 کەسایەتی لە بەگ و ئاغاکانی مامش و هەرکی لەلایەن بارزانییەکانەوە لە کاتی پەنابردنیاندا بۆ یەکێتی سۆڤیەت.

کاربەدەستانی سۆڤیەت پێیان وایە کە مەلا مستەفایان خستۆتە سەر ئەو باوەڕەی کە ڕەوشی کۆمۆنیستی پێقبوڵ بیٚ، بەڵام بەسەرنجدان لەوەی کە ناوبراو لە کاتی پەنابردنیدا بۆ سۆڤیەت لە تەمەنی 43 ساڵیدا بوو، هەروەها زۆربەی کاتی نیشتەجیٚ بوونی لە یەکێتی سۆڤیەتدا لە نێو هاوڕیٚ وئاشنایانی کوردی خۆیدا بەسەر بردووە، پێناچیٚ ئەم دەنگۆیە هێندە دروست بیٚ، ڕووداوەکانی پەیوەست بە پێنگاڤەکانی ئایندەی مەلا مستەفا لە بەشی دواییدا بە دوورودرێژی ڕاڤە دەکرێت.

## 5-هەلومەرجی ئێستای کوردەکانی ئێران.

لەپاش داگیرکردنەوەی دووبارەی ئازەربایجان، کوردەکانی ئەو ناوچەیە کە بۆ ماوەیەك ببوونە بەشێك لە (کۆماری کورد)ی حیزبی دیموکرات، بە بێ کێشە چەکیان دانا و گەڕانەوە بۆ ڕەوتی ئەو ژیانەی کە بەر لەم ڕووداوانەدا پێی ڕاهاتبوون. هۆزە کوردەکانی شوکاك‌و هەرکی‌و بەگزادە گەڕانەوە بۆ نێو خانووە بەردینەکانی خۆیان لەو گوندانەدا کە لە نێو جەنگەڵە دار بەڕووەکاندا هەڵکەوتوون و بە ڕۆخی ڕووبارو قەدپاڵی چیاکانی سۆما و برادۆستەوەن. ئێلە کۆچەرییەکانی تەرگەوەرو مەرگەوەر و جەلالیش گەڕانەوە بۆ نێو چادرەکانیان لە (میانە)دا لە قەد پاڵی چیا سەرکەشەکانی ئارارات و کوچك قەرەسوو، و ئارس دا، کە شوێنی زستانەی خۆیان بوو. هەروەها هۆزەکانی زرزا و پیران، مامش، مەنگوڕ، سەرشیو، گوریك دووبارە ڕێی سەرزەوییەکانی خۆیان گرتەوەبەر. ئەم هۆزانە بە هەستێکی تاڵ ودەردناکەوە نەگەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، بەو هەستەوە نەگەڕانەوە کە گەلێك بن سەربەخۆیی ماوە کورتی ئازیزی خۆیان لێزەوت کرابێت، بەڵکو پەیان بەو ڕاستییە ئاشکرایە بردبوو کە ئەم ڕووداوەش وەك هەموو ڕووداو و بەسەرهاتەکانی پێشتر بە سەرکەوتن نەگەشت، واباشترە ڕووبکەنەوە هەمان ژیانی بێ گێرمەو کێشەی خۆیان‌و، خۆیان بە هاووڵاتی ملکەچی دەوڵەت بزانن، هەرچەند ئەو هەلومەرجە ڕێگای ئەوەی پێنەدان کە گوندە تورك نشینەکان تالان بکەن، هەرچۆنێك بێ بەوە دڵخۆش بوون کە بە دەستی سەربازانی مەشق پێکراوی دەوڵەت تێکشکا بوون، نەك بەدەستی هۆزە هاوسێکانیان، هەروەها ڕووبەڕووی ئەو سزادانە نەبوونەوە کە وەك پێویست لەم جۆرە جەنگانەدا پەیڕەو دەکرێ، هەروەها دەنگۆی بێ گوناهی خۆیان لەبەشداری کردن لەو یاخیبوونەدا دەکرد، دەیانگووت کە لەلایەن هێزی داگیرکەرەوە ناچار بەم کارە کراون،هەندێکیشیان دەیانگووت کە قازی محەمەد فریووی داون،

هەندێكیشیان دەیانگووت كە ئەوان بەسەرزارەكی هاوكارییان لەگەڵ دیموكراتەكاندا كردووە تا لە هەلێكی گونجاودا هێرش بكەنە سەریان و هەروەك ئەم كارەشیان لەگەڵ هاتنی هێزی دەوڵەتدا ئەنجامدا. پێكڕای ئەوانیش، كاتێك شا لە ورمێدا بەمیهرەبانییەوە پێشوازی لە نوێنەرەكانیان كرد، داوای بەخشین و لێبووردنیان كرد.

لە ئوستانەكانی كوردستان (سنە) وكرماشاندا كە بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ لەگەڵ گروپەكانی ئازەربایجاندا بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی هاوكارییان نەكردبوو. هەلومەرجێكی دیكە حوكمڕان بوو. كوردەكانی ئەم ناوچانە هەوڵی ئەوەیان نەدابوو تا بە كۆمەكی هێزەكانی بێگانە سەربەخۆیی بەدەستبێنن. لەبەر ئەوە بە خۆیان هێندە ئارەزوویان نەدەكرد دەست بەسەر چەكی سەربازانی ئێراندا بگرن، كە بەهۆی داگیركردنی وڵاتەوە لەلایەن هێزەكانی سۆڤیەتو بەریتانیاوە ڕێكخستنی نیزامییان لەبەر یەك هەڵوەشابۆوە.

دەوڵەتی مەركەزی ئێران لە پاش كشانەوەی هێزەكانی سۆڤیەت لە ئازەربایجاندا سەر لەنوێ ڕیزەكانی سوپایان ڕێكخستەوە ، چەكەكانیان نوێ كردەوەو، بە كۆمەكی ڕاوێژكارانی ئەمریكایی توانای جەنگی ئەوانیان بەرزكردەوە. ئەو ئارامیو ئاسایشەی كە بەهۆی ڕووداوەكانی ڕابردووەوە بە توندی كەوتبووە مەترسییەوە، دووبارە زامن كرایەوە.

سیاسەتی ڕەزاشا ( لەمەڕ كۆنترۆڵ كردنی سنوورەكان لەلایەن هێزی عەشایرەوە ) كەهەلومەرجی چەكداربوونیان هەمیشە گێرمە و كێشەی بەدواوە بوو، سەر لەنوێ چاكسازی كراو ڕێكخرایەوە.

لە كوردستانیشدا وەك هەموو ناوچەكانی دیكەی ئێران بەرنامەی چەك داماڵینی عەشایر لەلایەن هێزی سوپاو ژاندارمرییەوە بەڕێوەبرا و لەم كارەدا زۆر لە عەشیرەتەكان چەكەكانی خۆیان تەسلیم بەكاربەدەستانی پەیوەندیدار كردەوە و هەندێكیشیان چەكەكانیان بەمەبەستی فرۆشتن گواستەوە بۆ

عێراق و لەوێدا بە نرخێکی باش فرۆشتیان. بەمجۆرە کاتێك کە یاخیبوونی جوانڕۆییەکان لە ئاکامدا تێکشکاو ڕووەو وڵاتی عێراق ئاودیوو بوون، لە پاش ماوەیەك کە گەڕانەوە ئێران چەکەکانیان لەلای هۆزەکانی پالانیو جافو بجلاودی بە جێهێشتبوو.

شۆڕشی 1958ی عێراق، ڕەنگدانەوەی خێرای لە نێو کوردەکانی سەر سنووری ئێراندا هەبوو، لەسەردەمی حکومەتی (نوری سەعید)[70] دا، عێراق هیچ جۆرە پەیوەندییەکی سیاسی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا نەبوو، تەنانەت جەنگی ساردی ڕاگەیاندن و ڕادیۆیی لە نێوان دوو دەوڵەتدا لە ئارادابوو. یەکێك لە یەکەمین کارەکانی (عەبدولکەریم قاسم)[71] بەرقەراکردنی پەیوەندی سیاسی بوو لە گەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتو گشت دەوڵەتانی سۆشیالیستیدا، لە ئاکامی ئەم بارودۆخو کارانە دا مەلا مستەفا کە لەو کاتەدا لە (پراگ)دا نیشتەجێ بوو لە ڕێگای قاهیرەوە گەڕایەوە بەغدا.

هەشت سەد کەس لە هەڤاڵانی ئەویش لە ڕێگای دەریای ڕەشو تەنگەی بسفۆر و دەردەنیل (سویس)ەوە لە لایەن کەشتی (گاروسیا) وە گەشتنەوە عێراقو لە بەندەری بەسرەدا وەك قارەمانانی نیشتمانی پێشوازییان لێکرا. ئەم پرسیارە دێتە پێش کە چۆن 500 یا 600 کەسی بارزانی بوون لە کاتی پەنابردنە بەر یەکێتی سۆڤیەتدا و لەکاتی گەڕانەوەیاندا ببوونە 800 کەس؟

ئەم کارە بە هۆی ئەوەوە بوو کە ژمارەیەك لە پەیڕەوانی شۆڕشی کورد یا

---

[70] –نوری سەعید: (1898–1958)، بەناوبانگترین سیاسەتمەداری سەردەمی پاشایەتی عێراق بوو، لەگەڵ فەیسەڵی کوڕی حسێن دا لەدژی تورکەکان ڕاپەری، چەندین جار بووە سەرۆك وەزیر، لە کودەتای 14ی تەموزدا کوژرا.(و)

[71] –(عەبدولکەریم قاسم): (1914 –1963) سەرکردەی شۆڕشی 14ی تەموزی 1958 بوو کە کۆتایی بەدەسەڵاتی پاشایەتی هاشمی هێنا لەعێراقدا ، لە کودەتای 1963ی عەبدولسەلام عارفو بەعسییەکاندا کوژرا. (و)

غەیرە کورد لەم گەشتەدا چووبوونە ڕیزی ئەوانەوە، هەروەها وەك باسدەکرێ ئەو دوو ئەفسەرە روسییەی کە لە سۆڤیەتدا مەئموری چاودێری کردن لە بارزانییەکان بوون، بە چەند ڕۆژێك بەر لەو گەشتەدا، لە شەقامی (ئەلرەشید)ی بەغدا دا دیترا بوون.

مەلا مستەفا لەگەڵ گەڕانەوەیدا بۆ عێراق سەرکردایەتی بزاڤی کوردی، بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لەئەستۆ گرت، لەوکاتەدا پێنگاڤ و کاری بارزانی تەواو چەپڕەوی و تەنانەت کۆمۆنیستیش بوو.

ئەوکات، لەسەرتاسەری عێراقدا پاسەوانی نیشتمانی نیزامی دامەزرا ، کە دەستیان کرد بە لە ناوبردنی موڵکدارە گەورەکان.گفتوگۆی توندو تیژ لە بارەی زەوتکردنی موڵكو باج سەندن بووە مایەی نیگەرانی سەرۆك هۆزە کوردەکان لە باکوری عێراقدا.

لە ئاکامی ئەو دەستێوەردانەی کە لەلایەن چەپەکان و بە پشتیوانی هێزە چەکدارەکان بەڕێوە دەبرا ، نزیك بەسێ هەزار کەس لە عەشایری کورد پەنایان بردە بەر خاکی تورکیاو نزیك بە دەهەزاریش پەنایان هێنایە بەر ئێران. ئەم کەسانە لەکاتی هاتنیاندا بۆ نێو سنووری ئێران، چەکیان لێسەندرا و بە کۆمەکی ڕێکخراوی (شیرو خورشیدی سوور) لە ناوچە سنوورییەکاندا نیشتەجێکران و خواردن و چادریان پێدرا. هەندێك لەم سەرۆك هۆزانە هاتبوونە تاران. من یەکێك لەوانم دیت کە ئیدعای ئەوەی دەکرد چواردە هەزار چەکداری لە ژێر فەرماندایە و ئەگەر (شا) مۆڵەتی پێبدات ئامادەیە لە دژی عەبدولکەریم قاسم بجەنگێ. دیارە من دەمزانی کە ئەم قسەو و باسە جۆرە خۆناساندنێکی ڕۆژهەڵاتیانەیە، ئەگەر ئەو هێزو توانایەی هەبایە، هیچ پێویستییەکی بە مۆڵەتپێدانی (شا)ی ئێران نەدەبوو.

لە پاش چەند هەفتە عەبدولکەریم قاسم وەئاگاهات کە ڕەنگە ئەم کارانەی ببێتە هۆی جیابوونەوەی بەشێکی گەورەی ناوچە کوردنشینەکان. لەبەر ئەوە

دادگا سەربازییەکانی هەڵوەشاندەوە و پاسەوانە چەکدارەکانی لە چەك داماڵی و دوو بارە سوپا و پۆلیسی خستەوە خزمەت ناوچەکورد نشینەکان. لە ئاکامدا هەلومەرجی باکوری عێراق ئاسایی بۆوە و کوردە پەنابەرەکانیش لە خاکی ئێرانەوە گەڕانەوە بۆ عێراق و لە کاتی گەڕانەوەشیاندا ئەو چەکانەی کە لەدەمی هاتنیاندا بۆ ئێران تەسلیمی دەوڵەتی ئێرانیان کردبوو درایەوە پێیان.

لە پاش تێکچوونی پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و دەوڵەتی عەبدولکەریم قاسم، شۆڕشی کورد لە دژی بالادەستی عەرەبەکان هەڵگیرسا، کوردانی بە ئەزموون و خاوەن هزری سیاسی لە ئێراندا، وەك شۆڕشی کورد و ئازەری 1946ی ئازەربایجان، لەم شۆڕشەی کوردستانی عێراق دەڕوانن.

لە ساڵی 1961وە، بیروڕای گشتی کوردەکان لە ئوستانی کوردستان و ئازەربایجانیشدا، هاودەردی وپشتیوانییان لەگەڵ خەباتی مەلا مستەفا دا بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی پیشانداوە. سەرۆك عەشیرەتەکان و کەسایەتی پارێزکاریش هەڵوێستێکی بێلایەنەیان هەبووە و ویستوویانە لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بە بێ ئەمەکی و خیانەت تاوانبار نەکرێن. بەڵام بە نهێنی پێشتیوانییان لە کوردەکانی عێراق کردووەو لە هەمان کاتیشدا ئاسوودەن کە ئەم کارەسات و ڕووداوانە لە وڵاتێکی دراوسێدا ڕوودەدات و بەرژەوەندیو ئارامی ژیانیان لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە نەکەوتۆتە مەترسییەوە.

زۆر لە چینەکانی ناڤین و کارمەندانی کوردی دەوڵەتیش، خەباتی مەلا مستەفاو کوردەکانی عێراقیان، بەخەباتی وەدەستهێنانی سەربەخۆیی میللەتی کورد زانیوە و پشتیوانییان لێکردووە، بەڵام بە کردەوەش کارێك ناکەن کە ببێتە هۆی فەراهەم کردنی قین و نارەزایی دەوڵەتی ئێران . ئەوان بە تاسەوە گوێ بۆ ڕادیۆی یاخیبووانی کورد ڕادێرن و سەرکەوتنی کوردەکان لە شەڕی دژ بە دەوڵەتی عێراقدا، بەکارێکی ئەفسوناوی وجوامێرانە دەزانن. هەرچەند رادیۆی ڕەسمی دەوڵەتی عێراق ئەم هەواڵانەی بە درۆخستۆتەوە و

ئەوانە بە پڕوپاگەندەی بێبایەخ دەزانێ.

زۆر لە لاوانی سەربزێوی ناوچە سنوورییەکانیش بە تایبەتی لە ناوچەکانی بانەو مەریوان و هەورامان و پشدەرەوە بە مەبەستی کۆمەك کردن بە برایانی کوردی عێراق، بە خۆیان چوونەتە ئەو دەڤەرە.

باس و خواس سەبارەت بە ناردنی چەك و کەرەسەی سەربازی لەلایەن سۆڤیەتەکانەوە بەشێوەیەکی نهێنیانە لە ڕێگای سنوورەکانی باکوری ڕۆژئاوای ئێرانەوە دەبیسترێ، بەڵام بە سەرنجدان لە کۆنترۆڵکردنی توندی سنوورەکان و لەگەڵ بوونی بنکەی چاودێری ژاندارمەریدا، ئەستەمە باوەڕ بەوەبکرێ کە سندوقی گەورەی پڕ لە چەك وکەرەسەی سەربازی بە شێوەیەکی نەدیتراو لەم ناوچانەوە دەرباز بکرێ و بپەڕێنرێتەوە.

دەوڵەتی ئێرانیش بێلایەنی تەواوی خۆی لەم شەڕەی نێوان کوردو حکومەتی عێراقدا سەلماندووە، تەنانەت ئەمێستا (لە کاتی نوسینی ئەم کتێبەدا) ئێران پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتی عەبدولسەلام عارف[72] دا هەیە.

---

[72] -عەبدولسەلام عارف: (1921-1966) لەگەورە ئەفسەرانی بەشداری شۆڕشی 14ی تەموزی 1958ی عێراق بوو، لە لایەنگرانی یەکێتی عەرەب بوو، لە سەردەمی قاسمدا خرایە زیندانەوە، لە 1963دا بووە سەرۆك کۆمار، لە ڕووداوی فڕۆکەدا کوژرا. (و)

# بەشی چوارەم
# کوردەکانی عێراق

ڕووداوەکان و بەسەرهاتی سالانی بەر لە (1919)، لەو سەرزەمینە کوردنشینەی کە لەم سالەوە بەدوا بووە بەشێك لە قەلەمڕەوی خاکی عێراق .لە بەشی پەیوەند بە تورکیادا باس کرا. لەم سالەوە کوردەکانی عێراق کەوتنە هەلومەرجێکی سیاسی و کۆمەلایەتی تەواو جیاوازەوە لەگەل ئەو کوردانەی کە لەژێر دەسەلاتی تورکیادا مانەوە، لەبەر چەند هۆیەك :

1-لە کاتی سالانی دابەشکردنی تورکیادا،هەلومەرجی ژیان و بارو دۆخی سیاسی لە باکوری عێراقدا بە تەواوی یەکلایی نەبو بۆوە.

2-تورکەکان بە پشت بەستن بەو (میساقە میللی)یەی کە لەلایەن ناسیۆنالیستەکانی تورکەوە لە سالی 1920 دا بەسترابوو، ئیدعای خاوەنداریێتی و حوکمڕانی ویلایەتی موسلیان دەکرد.

3-ئەم ویلایەتە لە بنەڕەتدا هێشتا لە ڕووی یاساییەوە، بەهۆی (ئاگر بەستی مۆدرس)ەوە لە (30ئۆکتۆبەری 1918)دا ، نەکەوتبووە ژێر دەسەلاتی بەریتانیاوە.

سەرباری سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی میرەکانیکورد لە سەرەتای چەرخی نۆزدەی زاییندا، هەست بە قین و ڕکەبەری کوردەکان بەرامبەر بە حکومەتی عوسمانی نەدەکرا. لەبەر ئەوەی ئەوکات، ئەو جۆرە ڕاپەڕینانە سیمای بزاڤی نەتەوەییان پێوە دیارنەبوو، بانگەوازی میرەکانیش بۆ یاخیبوون لەگەل پێشوازی سەرجەم عەشیرەتە پەرت و بلاوەکانی کوردا ڕوو بەڕوونە دەبۆوە کە لە چەندین ناوچەی جیاوازدا دەژیان.

وێڕای ئەوەش کوردەکان کە سانێکی دیندار و موسلمانی دەمارگیر بوون و

هەستیان بە ئەمەك و وەفادارییەکی قووڵ دەکرد بەرامبەر بە سوڵتانی خەلیفە. زۆربەی ڕاپەڕینەکانیشیان لە دژی جەوروستەمی پاشاکانی بەغدا بوو.

لەبەر ئەوە لە پاش ئاگر بەست وداگیر کردنی ویلایەتی موسڵ لە لایەن هێزەکانی بەریتانیاوە، زۆربەی کوردەکانی ئەم ویلایەتە، هێشتا ئیمپراتۆریەتی ڕوو لە مەرگی عوسمانییان بە نیشتمانی روحی خۆیان دەزانی، جگە لە ژمارەیەکی کەم لە ڕوناکبیران و سەرۆك عەشیرەتەکان کە پەیان بەوە برد بوو دەوڵەتی عوسمانی بۆ یەکجارەکی ڕوو لە تارومار بوون وتیاچوونە. هێشتا ئەوان بە هیوا بوون کە دووبارە ببنەوە بە بەشێك لە تورکیاو لەگەڵ برایانی کوردی خۆیاندا لە باشورو باکوری ڕۆژهەلاتی تورکیادا بژین.

ئەم ڕەوش و ئارەزووە لەلایەن ناسیۆنالیستەکانی تورکەوە، کە لە بەرامبەر یۆنانییەکاندا دەجەنگان، پشتیوانی لێدەکرا، بەڵام ئەو بانگەوازەی سوڵتان محەمەدی شەشەم کە ئاڕاستەی گشت موسڵمانانی جیهانی کردبوو، هێرشێکی توندی بۆ سەر ناسیۆنالیستە تورکەکانی (ئەنقەرە)ی لە خۆدەگرت، هەستی وەفاداری کوردەکانی بەرەو سەرگەردانی برد.

وێڕای ئەم ڕاگەیاندنە و هەرەسهێنانی یەکجارەکی خەلافەتی عوسمانیش، هێشتا ئەوان لایەنگری حکومەتی عوسمانی بوون و ئامادەگی ئەوەیان تیابوو بەوپەڕی گڕوتینەوە بەرگری لێبکەن. هەرچۆنێك بێ، پەیوەندی نێوان کوردە سونی مەزهەبیەکان و تورکە عوسمانییەکان توندو تۆڵ بوو، کوردەکان هەستێکی هاودەردی بە هێزتریان بەرامبەر بە تورکە عوسمانییەکان هەبوو تا بە عەرەبەکان. لە ڕاستیدا، کۆمیسیۆنی مافی نەتەوەکان، کە مەئموری لێکۆڵینەوە بوو دەربارەی هەستی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ، پەی بەوە برد کە کوردەکان ئامادەگی سازشیان لەگەڵ تورکمانەکاندا، (تورکەکانی عێراق کە بەهۆی مەبەستی سیاسییەوە، ئینگلیزەکان، سووربوون لەسەر ئەوەی کە بە

توركمان ناوبرێن) هەیە، جگە لە ژمارەیەكی كەم لە كوردەكانی دەوروبەری خانەقین كە لەلایەن ئینگلیزەكانەوە لە خشتەبرا بوون‌و خوازیاری هاوكاری كردن لەگەڵ ئینگلیز و جەنگ لە دژی توركەكان بوون، ئەوانیش لە پێناوی دەستكەوت و تەرخان كردنی برێك پارەو گوزەرانی رۆژانەدا ئەو هەڵوێستەیان هەبوو. چەند رۆژێك لە پاش خۆبەدەستەوەدانی توركیا لە سەرەتای نۆڤەمبەری 1918دا، هێزەكانی بەریتانیا بە فەرماندەیی (ژەنراڵ مارشال) ویلایەتی موسڵی داگیركرد و ژەنراڵی تورك (عەلی ئیحسان پاشا) بەو پەڕی پەژارەو نیگەرانییەوە بە ناچار رێكەوتننامەی سپاردنی ویلایەتی موسڵی ئیمزاكرد. بەمجۆرە كوردەكان كەوتنە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی بەریتانیاوە.

یەكەم كاریگەری ئەم ڕووداوە بە تایبەتی لە ناوچەكانی باكوردا گەلێك بەسەرهاتی ناخۆشی لێپەیدا بوو، لەبەشی سێهەمدا بە درێژی ئاماژەمان بەوەكرد كە بە چ شێوەیەك ئاسورییەكانی ورمێ و ئاسورییەكانی جەلۆ كە لە هەكارییەوە هاتبوون‌و لە پاش جەنگ و خوێنڕێژییەكی زۆر بەرەو هەمەدان ڕەویان كردو، لەوێشەوە لەلایەن هێزەكانی بەریتانیاوە بەرەو بەعقوبە ونزیكی خانەقەین حەرەكەتیان پێكرا. ئەم ئاسوریانە بە تایبەتی (جەلۆ)كان، كە دیتیان بە چ شێوەیەك ئینگلیزەكانی هاودینیان، توركەكانیان تێكشكان و كوردەكانیشیان بەرەو بێهێزی‌و سەرگەردانی ڕاپێچ كرد، سوور بوون لەسەر ئەوەی كە ئینگلیزەكان ئەوان لە بەعقوبەوە بباتەوە سەر زەوی‌و زێدی خۆیان، یا بەلانی كەمەوە لە دەوروبەری ناوچەو زێدی خۆیاندا نیشتەجێ بكرێن. بەمجۆرە هەستیان بە جۆرێك لە خۆبایی بوون دەكردو ئاكامی ئەم هەستەش ئەوە بوو كە موسڵمانەكانی بۆ دوژمنایەتی و ڕكەبەری ئینگلیزەكان بزواند.

پێویستە ئاماژەش بەوە بكرێ كە ئەو ڕەفتارە چەوتەی سەربازانی كورد و توركی عوسمانی لەگەڵ دیلە ئینگلیزەكاندا لە (كوت)، (عەمارە) داكردبوویان

هێشتا لە بیرەوەری بەرپرسانی ئینگلیزدا فەرامۆش نەکرابوو، لە کاتێکدا کە ئەو کاتیش ئاسورییەکان لەموسڵدا، لەلایەن دوژمنانی هاوبەشیانەوە (کوردەکان–تورکەکان)ەوە، کەوتبوونە بەر تالآن وکوشتارەوە.

لەسەر خواستی برایانی مارشەمعونی کوژراو ، (ئاغا بترۆس) کۆمەڵێك جەنگاوەری ئاسوری ئامادە کردو بەرەزامەندی ئینگلیزەکان، ناوچەی نێوان ئورامارو بارزان و شەمدینانی خستەبەر تالآن و کوشتار و پەلاماردانەوە، تالەم ڕێگەیەوە بتوانێت ئاسورییەکان لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بکەن.

بەڵام عەشیرەتەکانی بارزانی، زێباری، هەرکی وئورامار خۆکەوتن و ئاسورییەکانیان بەرەو دوا ڕاونا، هەرچەند دواتر هەندێك لەم ئاسوریانە لەدەوروبەری ئامێدی دا نیشتەجێ کران .

لە ساڵی 1919دا، دوو تیپی نیزامی ئاسوری لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دامەزرا و ئەرکی جموجوڵی سەربازییان لە ناوچە شاخاوییەکانی زاخۆ، دهۆك، ئاکرێو، ئامێدییان پێ سپێردرا . لەبەر ئەوەی ئەو کات یەکە سەربازییەکانی ئینگلین، وەك جەلۆکان ئامادەگی و کارایی جەنگی پارتیزانییان نەبوو.

لەساڵی 1923دا، ژمارەی چەکدارە ئاسورییەکان خۆی ئەدا لە 2500 نەفەر، بەڵام تواناو کارایی جەنگی ئەوان بە ئەندازەی توانای کوردەکان نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بە باشی چەکدار بوون و لەژێر چاودێری ئەفسەرانی ئینگلزیدا مەشقیان پێدەکرا، بەو پەڕی سەرسەختی و زەبروزەنگەوە ڕەفتاریان لەگەڵ موسڵمانەکاندا دەکرد.

لە پاش ڕێکەوتننامەی ئاشتی و کۆتایی هاتن بە جەنگی یەکەمی جیهانی دا، کۆتایی بە حکومەتی نیزامی هات لە موسڵدا، هەرچەندە دواتریش زۆربەی بەڕێوەبەرانی ئەم ناوچەیە لە ئەفسەرانی سەربازی پێکدەهاتن . دەپێشدا کوردەکان چاوەڕوانی ئەوە بوون کە ئەگەر ئۆتۆنۆمی یان پێبدرێ بەلانی

کەمەوە لە ژێر چاودێری کاربەدەستانی ئینگلیزی نیشتەجێی کوردستاندا دەبێ. هەرچەند لەوکاتەدا، دەوڵەتی بەریتانیا لە دژی ئەم پرۆژەیە نەبوو، بەڵام کاربەدەستانی سەربازی بەریتانیا، دژایەتی بەرەسمیەت ناسینی ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی کوردیی بەو جۆرەیان دەکرد، کە ئاسوورییە پەرتەوازەکانی تورکیاش بەشێك لەو هەرێمەیان وەك نیشتمانی میللی خۆیان لە ژێر دەستدا بێت.

## 1- شێخ مەحمودی حەفید

لە حەوتی مایسی 1918دا، هێزەکانی ئینگلیز. کەرکوکیان داگیر کردو چەند ڕۆژێك بەدوای ئەوەشدا سلێمانییان داگیرکرد. ئەو کات گرنگترین کەسایەتی کورد، لەو ناوچەیەدا (شێخ مەحمود) بوو کە لە شێخەکانی بەرزنجەیە. بەڵام لە ناوچەکانی تریشدا، سەرۆك عەشیرەت هەبوون کە خۆیان بەسەر بەخۆ دەزانی، تەنانەت لە ناو شاری سلێمانیشدا چەند کەسایەتییەکی گرنگ لە کایەدا بوون لەگەڵ شێخ دا ناتەباو ناکۆك بوون. بەهەر حاڵ، لە میانەی کۆبوونەوەیەکدا کە لە سلێمانیدا سازکرا، سەرانی کورد لەسەر ئەوە پێکهاتن حکومەتێکی کوردی بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود دابمەزرێو بەڕێوەبردنیشی لە ژێر چاودێری ئینگلیزەکاندا بێت، چەند کێشەیەکی سیاسیو سەربازی بۆ ماوەیەك ئینگلیزەکانی ناچار بە کشانەوە کرد لە شاری سلێمانی و کەرکوکدا. دیارە تورکەکان لەودەمەدا سوودیان لەو بۆشاییە وەرگرتو هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخسا شوێنی ئەوان بگرنەوە، ئەو کوردانەی هاوکاری ئینگلیزەکانیان کردبوو، دەستگیرکران و سزادران.

شێخ مەحمود هێزێکی لە عەشایری کورد پێکهێناو کەوتە هاوکاری کردنی تورکەکانو دژایەتی کردنی ئینگلیزەکان. هۆزی هەمەوەندیش کە جەنگاوەرترین ئێلی ئەو ناوچەیەنو بەرەچەڵەك لە ئێرانەوە هاتبوون، وێڕای

ئەو سەرکوتکردنە سەختانەی کە تورکەکان بەرامبەر بەوان نواندبویان، چونکە ئینگلیزەکان دەپێشدا بەڵێنی یارمەتیدانیان پێدابوون و پاشتر پاشگەز ببوونەوە و بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنەوە ڕەفتاریان کردبوو، چوونە پاڵ شێخ مەحمودەوە.

پاش کۆتایی جەنگ، هێزەکانی بەریتانیا دووبارە ئەو ناوچانەیان داگیر کردەوە کە پێشتر چۆڵیان کردبوون، سەرلەنوێ لە بارەی بەڕێوەبردنی ناوچەی کوردستانەوە، لەگەڵ سەرانی کوردا کەوتنەوە دانوستان.

لەتەلەگرافێکدا، کە لە 10ی مایسی 1919دا، لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە بۆ سێرئارنۆڵد ویلسۆن ڕەوانەکرابوو (کە دواتر بووە کۆمیسەری باڵای عێراق)، نووسرا بوو:

(بەمەبەستی دامەزرانی دەوڵەتی عێراق، ئێمە ئەرکی ئیدارەکردنی پێنج شارمان بە تۆ سپاردووە ، بۆ زامن کردنی پشتیوانی و دابین کردنی ئەم مەبەستە ویلایەتی موسڵ بەشێوەی ئۆتۆنۆمی و خۆگەردان بە سەرانی کورد بسپێرە، کە لە ژێر چاودێری دەوڵەتی بەریتانیادا بەڕێوەببرێت).

بەم تەلەگرافەدا دەردەکەوێ کە دامەزران و ئینتیدابی دەوڵەتی عێراق لەو کاتەدا لە تێڕوانینی حکومەتی بەریتانیاوە بەدەر لە ویلایەتی موسڵدا بێ. ئەم بڕیارە ئەوە دەردەخات کە دامەزرانی دەوڵەتی عێراق تەنها بەشی عەرەب نشینی دەگرتەوە، چونکە سیستەمی ئۆتۆنۆمی لەو ناوچانەدا کە کوردەکان زۆرینەیان پێکدەهێنا، بۆ پاراستنی حکومەتی هندستانی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز پاڵپشت و پێگەیەکی گونجاو بوو.

ئەفسەرێکی چاپوك و هەڵکەوتوو بە ناوی (مێجەر نۆئیل)ەوە E. W. Noel کە پێشتر لە ئێراندا بوو، زاری فارسیش بە باشی فێرببوو، لە مایسی 1918 دا، گەیشتە سلێمانی تا هەم چاودێری شێخ مەحمود بکات و هەم ڕاوێژکارو ڕێنوینی ئەویش بێت کە ئەو کات بە حوکمداری ناوچە کوردنشینەکان

هەڵبژێرابوو. ئەوسەرکردە کوردانەی کە لە بەشە بچوکترەکاندا بەرەسمی لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی شێخ مەحمودا بوون، لەلایەن ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیزەوە ڕێنمایی و یارمەتی دەدران.

سنووری دەسەڵاتی شێخ مەحمود تا نزیکی ناوچەی رانیە و کۆیە بەر فراوان دەبۆوە، بەڵام هەموو سەرکردە کوردەکانی ئەم ناوچانە بەو شێوەیەی کە شێخ مەحمود دەیویست پەیڕەوییان لەو نەدەکرد، شێخ مەحمودیش پێی وابوو کە بەنهێنی ئەم ئەفسەرە سیاسیانەی ئینگلیزن ئەوان بۆ سەر بزێوی هان ئەدەن. بەمجۆرە بەمەبەستی کۆتایی هێنان بەم پشێوی‌و نائارامیانە کە بەکردەوە بەڕێوە بردنی ئەم ناوچانەی ئەستەم‌و دژوار دەکرد. شێخ مەحمود داوای کرد لە نێو خۆی ئەو مەڵبەندەدا یەکبوونێك بە دیبهێنرێت، تا بەرەسمی بناسرێن‌و لەم ڕێگایەوە بتوانن باڵا دەستی خۆیان بەسەر هەموو مەڵبەندەکەدا بەرفراوان بکەنەوە. هەرچەند ئەم ئۆتۆنۆمییەش لە ئێستادا لە ژێر چاودێری و ئینتیدابی بەریتانیادا بێ . لە ئاخروئۆخری 1918دا، دیبلۆماتی پێشووی عوسمانی (شەریف پاشا) کە کورد نەژادو لە تایفەی بابانی سلێمانی بوو، ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی، بەهۆی ناتەبایی لەگەڵ حیزبی ئیتحادوتەرەقی تورکیادا، لە فەرەنسادا بەسەر بردبوو، دەستیکرد بەنامە نوسین وپەیوەندی کردن بەسەرانی کوردی وەك شێخ مەحمود و سەید تەهاوسمکۆوە. تا بەڵکو لە تێکۆشانیاندا بۆ دامەزرانی کوردستانی سەربەخۆ، سەرکەوتن بەدەستبێنن. لەهەمان کاتدا، بۆ ئەم مەبەستە چەند پێشنیارێکی دا بەسەرانی وەفدی دەوڵەتە گەورەکانی بەشدار لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس (بەتایبەتی وڵاتە یەککگرتووەکان، فەرەنسا، بەریتانیا)، کە داخوازی ئەوە بوو لە قەڵەمڕەوی پێشووی عوسمانیدا دوو هەرێمی سەربەخۆ لە ژێر چاودێری دەوڵەتە گەورەکاندا دابمەزرێت، هەرێمێکی ئەرمەنی نشین، لە ناوچەکانی وان و موش و بەتلیس‌و بەشێك لە ئەرزرۆم‌و ئەرزنجاندا، لەبەشی باکوردا.

هەرێمێکی کورد نشین، لە ناوچەکانی هەکاریو ماردینو ئورفە و موسڵدا، لەبەشی باشوردا. ئەم پێشنیارانەی بە پشت بەستن بە مادەی دوانزەهەمی ڕاگەیاندننامەی ویڵسۆن خستبووە ڕوو، کە پەیوەندیدار بوو بە چارەنوسی گەلە ژێر دەستەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە، بۆ ماوەیەکیش ئەم پێشنیارانە هاوسۆزیو سەرنجی ژمارەیەك لە نوێنەرانی بۆلای خۆی ڕاکێش کرد ، بەلأم جیاوازی ڕەوشی سیاسی و ناتەبایی هێزە گەورەکان و سەرکەوتنی تورکە ناسیۆنالیستەکان بەسەر یۆنانییەکاندا، ڕێی لە بەدیهێنانی هەرێمێکی بەو جۆرە گرت.

لەم سەر وەختەدا هەرچی زیاتر پەیوەندی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا، بەهۆی دەستێوەردانی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری ئەوان لە کاروباری ناوخۆی کوردستاندا، ڕووی لە گرژی و قەیران دەنا. بەمجۆرە کاربەدەستانی ئینگلیز، بڕیاریان دا ناوبراو بخەنە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی خۆیانەوە، بۆ ئەم مەبەستە ئەرکی (مێجەر نۆئیل)یان بە (مێجەر سۆن)سپارد، کە ئەوکات لە هەولێردا نیشتەجێ بوو، ناوبراو زانیارییەکی قوڵی دەربارەی کوردستان هەبوو، پێدەچوو لە توانایدا بێ شێخ مەحمودی سەرکەش و یاخی کۆنترۆڵ بکات. لەوکاتەدا شێخ مەحمود، لە لایەن تایفەکەی خۆیەوە (ساداتی بەرزنجە)و هۆزی هەمەوەندو، بەشێك لە تایفەی جافەوە پشتگیری لێدەکرا . بەلأم جافەکانی هەڵەبجە بە هۆی دنەدانی ئینگلیزەکانەوە لە دژی دەسەلأتی شێخ بوون، لە مایسی 1919دا، شێخ مەحمود سەربەخۆیی کوردستانی ڕاگەیاندو، داوای هێزی کۆمەکی لە (جەعفەر سوڵتانی هەورامی)کرد. لە پاش زاڵبوون بە سەرهێزی بەریتانیا دا لە دەورو بەری سلێمانیدا، لەپێشدا شاری سلێمانی و پاشان تێکڕای ناوچەکانی دەوروبەری ئەو شارەی لەوانە (هەڵەبجە)ی ڕزگار کرد.

بەشێك لە هێزی بەریتانیا کە لە کەرکوکەوە بۆ سلێمانی ڕەوانە کرابوون

لەلایەن کوردەکانەوە تێکشکێنرا و پاشە کشێی کرد. لە قۆناغی دواتردا ئینگلیزەکان هێزێکی گەورەی (نزیك بە یەك لەشکر) یان ناردە سەر سلێمانی، شێخ مەحمودیش بە هەزارو پێنج سەد چەکدارەوە لە دەربەندی بازیاندا ڕێی لە هێزی ئینگلیز گرت، لە پاش شەڕو پێکهەڵپژانێکی دەستەو یەخەو ڕوو بە ڕوو، شێخ مەحمود بە بریندارێ بەدیل گیراو پاشماوەی هێزەکەشی لە پاش قوربانی دان و زیانێکی قورس، هەڵاتن.

شێخ برایە بەغدا و لەپاش دادگایی کردن لە دادگای سەربازی ئینگلیزەکاندا. مەحکوم بە مەرگ کرا، بەڵام ئەم حوکمە بەڕێوە نەبرا، بەڵکو بۆ ماوەیەك شێخ مەحمود دوور خرایەوە بۆ دورگەی ئەندمان (لە ڕۆژهەڵاتی هندستاندا).

مێجەر سۆن گەڕایەوە بۆ سلێمانیو لەپاش ئەم ڕووداوە بارودۆخی شاری سلێمانی کەم تا زۆر ئارام بۆوە. بەڵام لە ناوچەکانی باکوردا وەك زاخۆ، ئامێدی، بارزانو، ڕەواندز، دەستێوەردانی ئینگلیزەکان لەگەڵ گێرمەو کێشەیەکی زۆر دا ڕووبەڕوو بۆوەو ژمارەیەك لەو ئەفسەرانەی کە بۆ دیدار لەگەڵ هۆزەکانو بانگەشە کردنی ئەوان بۆ ملکەچ کردن بۆ دەوڵەت چووبوونە ئەو ناوچانەوە، کوژران. بەمجۆرە هەوڵی دامەزرانی ویلایەتێکی کوردنشین لە عێراقدا بێ ئاکام مایەوە و بەسەرکەوتن نەگەشتو، ئەو بەشە کورد نشینەی بە ویلایەتی موسڵ ناودەبرا، خرایە سەر عێراق. حکومەت و پاشایەتی عێراقیش بە فەیسەڵ[73] (کوڕی دووەمی شەریف حسێن) سپێردرا. بەڵام بڕیار لەسەر ئەوە درا کە ناوچە کوردنشینەکان لەهەلومەرجێکی تایبەتیدا بێ.

---

[73] -فەیسەڵ : (1883-1933) فەرماندەی گشتی سوپای عەرەب بوو لە شەڕی دژ بە دەوڵەتی عوسمانیدا، لە 1920دا بووە مەلیکی سوریا. لە پاش داگیرکردنی سوریا لەلایەن فەرەنساوە لەسوریا هەڵات، لە 1921دا کرا بە مەلیکی عێراق، لە سویسرادا مرد. (و)

واتە كوردەكان مافی فێربوونی زمانی خۆیان لە قوتابخانەكاندا هەبێ و زمانی كوردی وەك زمانی ئیداری و یاسایی بەرەسمی بناسێنرێت و تەنانەت تا لە تواناشدا بێ، لە ناوچە كوردنشینەكانی (سۆرانی)دا، كارمەندانی دەوڵەت لە كورد دەبن.

سەركەوتنی ناسیۆنالیستەكانی تورك لە كەناری ڕووباری (شكریا) دا بەسەر یۆنانییەكاندا، بۆ یەكجارەكی پێشڕەوی یۆنانییەكانی بەرەو ئەنقەرە ڕاگرت و، لە ئاكامی ئەم سەركەوتنە دا بووكە توركەكان كەوتنە بیركردنەوە لەوەی بەسوود وەرگرتن لە (میساقی میللی)،دیسان هەوڵبدەن ویلایەتی موسڵ بكەنەوە بە بەشێك لە توركیا.

لە ساڵی 1921دا، نفوزی توركەكان لەم ناوچانەدا ڕوو لە زیادبوون بوو. لە بەهاری 1922دا، داگیركردنی بە كردەوەی ئەم ناوچانە لە لایەن هێزی غەیرە نیزامی تورك و كوردە وە بەسەرپەرشتی ئەفسەرانی تورك دەستیپێكرد.

هۆزەكانی زەنگەنەو هەمەوەند لەگەڵ هێزی ئینگلیزەكاندا پێكهەڵپژان و لەئاكامی ئەم شەڕانەدا دوو ئەفسەری ئینگلیز كوژران. عەشیرەتی هەركی و برادۆست كە لەژێر سەرپەرشتی سەید تەهادا بوو ، لەم گێرمەو كێشانەدا بەبێلایەنی مانەوە . لەوكاتەدا سەید تەها لەگەڵ ئیسماعیل ئاغای شوكاك (سمكۆ)دا هاوكار بوون و لەدژی سوپای ئێران خەباتیان ئەكرد، كە گەرەكیان بوو پەیوەندییەكی دۆستانەیان لەگەڵ دەوڵەتی بەریتانیا دا هەبێ، تا لەو ڕێگایەوە سەرنجی ئینگلیزەكان بۆ بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی كورد لە ئازەربایجانی ئێراندا ڕابكێشن. لەوماوەیەدا، لە تاراندا دەنگۆ داكەوت كە ئەفسەرێك بە ناوی (ووربا)وە (ئەفسەری قەزاقی سوپای ئێران) بەرەو كوردستان دەچێت، هەندێك پێیان وابوو ناوبراو جاسوسی ئینگلیزەكانەو هەندێكیش دەیانگووت كە تەنها لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بەمەبەستی وتووێژ بۆ ئەو مەڵبەندە ڕەوانە كراوە. ڕاستی ئەم مەسەلەیە هەرچییەك بێ،ئەم

وتوویژانـە هیـچ ئاکـامێکی ڕەزامەندبەخشـی لێپـەیدا نـەبوو، تـا شکسـتی یـەکجارەکی و دەرپـەڕاندنی سمکۆ لـە سنوووڕەکانی ئێراندا گـرژی وئـاڵۆزی لـەو ناوچانـەدا درێـژەی کێشـا. لەسـەر سـنوورەکانی ئێرانیشـدا پێدەچـوو کـە (بابـەکر ئاغـای پشـدەر) نـەیاری تورکـەکان بـێ، بـەڵام لـە مـانگی مارسـدا، تورکـەکان (ڕەواندزیان) داگیر کـردو، سـەرتاسـەری ئـەو ناوچانـە کەوتنـە بـەر هێرش و پـەلاماردانی گـەریلای ناسـراوی تـورك عـەلی شـەفیق (ئوزدەمـیر)ەوە . (رانیـە)ش لەلایـەن تورکەکانـەوە دەسـتی بەسـەردا گـیرا و کۆماندۆکـانی تـورك بەرەو کۆیەو سلێمانی پێشڕەوییان کرد.

تایفـەی بابان و هـەموو کەسـانی دیکـەی دژ بە شێخ مـەحمود، بە یـاوەری ئینگلیزەکان سلێمانییان چۆڵکرد. ئینگلیزەکـان بە مەبەسـتی بەربەسـت دانـان لـە بەرامبـەر نفـوزی تورکـەکاندا، دەسـتیان کـرد بـە بزوانـدن و هـاندانی ئازادیخوازانی کوردو شێخ مەحمودیشیان لە مەنفاوە گەڕانەوە بۆ سلێمانی تا دووبارە حکومەتی خۆگەردانی کوردەکان پێك بێنێت.

بەڵام شێخ مەحمود،سەر لـەنوێ خۆی لەگـەڵ تورکـەکاندا یەکخستەوەو لە پاش کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەفسـەرانی تورکدا. دەستیکرد بەشـەڕ کردن لەگـەڵ ئینگلیزەکانداوهـەوڵیدا قەڵـەمڕەوی دەسـەڵاتەکەی تـا کـەرکوك بـەرفراوان بکاتەوە.

کێشەی خاوەندارێتی ویلایەتی موسڵ تەنانەت لە پاش کۆنگرەی لۆزانیش بە چارەسـەر نـەکراوی مابۆوە، تا ئـەو کاتـەی لـە سـاڵی 1925دا، کۆمیسـیۆنی (کۆمەڵـەی گـەلان) بڕیـاری دا (ویلایـەتی موسـڵ) بخرێتـە سـەر دەوڵـەتی تـازە دروسـتکراوی عـێراق. لـە بـەر ئـەوە لـە ڕووی بەڕێوەبردنـەوە کاربەدەسـتانی داگیرکەری تورك لە ناوچەکانی باکوری عێراقدا بە ناوی پێشمەرگەی کوردەوە چوونە ڕیزی ئەوانـەوە. هـێزی بـەریتانیاش لـەم ناوچانـەدا بریتـی بـوون لـە ژمارەیـەك کوردی دژ بە تورك،بەڵام بەشـێوەیەکی سـەرەکی لـە ئاسـوورییەکان

پێکهاتبوون، کە ڕەفتاری ڕاستەوخۆی ئەوان لەگەڵ موسڵمانەکاندا بووە هۆی سەرهەڵدانی ڕکەبەری و دژایەتی کردنی ئینگلیزەکان، کە پشتیوانی ئاسورییەکان بوون.

لە نیسانی 1923دا، سوپای تازە دروستکراوی عێراق، دووبارە ڕەواندزی داگیرکردەوەو جڵەوی بەڕێوەبردنی ئەم ناوچەیەی بەسەید تەها سپارد. ئەم هێزە بەرەو سلێمانیش پێشڕەوی کرد و لە مانگی ئازاردا ئەو شارەش داگیرکرایەوە. چونکە هیچ یەك لە سەرۆکە خۆجێیەکان جورئەتی بەڕێوەبردنی ئەو ناوچەیەیان نەبوو، هێزی داگیرکەر بە زوویی شاری چۆڵکردو ئەو ناوچەیەش کەوتەوە ژێر دەسەلاتی شێخ مەحمودەوە، کە لەو کاتەدا لە (سەردەشت)دا لە ئێران ژیانی بەسەر دەبرد. بەڕێوەبردنی سلێمانیو ڕانیە بە شێخ مەحمود سپێردرا. لەبەر ئەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ داخوازی شێخ لەو ناوچانەدا پتر دەبوو، هێزێکی گەورەی سوپای عێراق، لەشکر کێشی بۆ سەر شێخ دەستپێکرد، لە پاش شەڕێکی سەخت وبۆردومانکردنی ئەو ناوچەیە لەلایەن فڕۆکە جەنگییەکانی هێزی هەوایی پاشایەتی بەریتانیاوە (Royal air force) شێخ مەحمودیان لە سلێمانیدا دەرپەڕاند. شێخ پەنای بردە بەر چیاکانی سەرسنووری ئێرانو شەڕی گەریلایی لە دژی هێزەکانی عێراق دەستپێکرد. (حوزەیرانی 1924).

لەساڵی 1926 دا بەهۆی ئەو دەستدرێژیانەی کە تورکەکان ئەنجامیان ئەدا، تەنانەت پێشبینی مەترسی سەرهەڵدانی جەنگ لە نێوان تورکیا-عێراق وبەریتانیا دا دەکرا. کێشەکە بە کۆمیسیۆنی (کۆمەڵەی گەلان) سپێردراو، بەپێی بڕیاری ئەو کۆمیسیۆنە سنورەکانی ئێستای نێوان عێراقو تورکیا دیاری کرا.

لە زستانی 1927دا، بەهۆی چالاکییە نوێکانی شێخ مەحمودەوە لە دژی حکومەتی عێراق لە ناوچەکانی سلێمانیدا، دەوڵەتی عێراق بە پێویستی زانی

لەشکر کێشییەکی نوێ بکاتە سەر شێخ، لە ئاکامی ئەم لەشکر کێشییەدا و بە هۆی فشاری هێزەکانی ئێرانەوە، کە شێخ مەحمود لەوکاتەدا لە مەریواندا نیشتەجێ بوو، بەناچارگەڕایەوە بۆ عێراق و، لەوێدا دەستگیر کراو دووبارە دوور خرایەوە.

وێڕای بڕیاردان لەسەر بەر قەرار کردنی هەلومەرجێکی تایبەتی لە ناوچە کورد نشینەکانی عێراقدا، وەك مۆڵەتدان بە خوێندن بە زمانی کوردی و بەکارهێنانی کارمەندی کورد لە ناوچە کوردنشینەکاندا و پێدانی چەند مافێکی دی، هێشتا هیچ جۆرە هەستی پێکەوە ژیان و هاوکاری کردنێك لە نێوان کوردو عەرەبەکاندا لە کایەدا نەبوو، زۆربەی کوردەکان هێشتا بە هیوا بوون کە لە ئایندە دا سەربەخۆییان پێبدرێ.

لەسکالاً نامەیەکدا کە لەلایەن نوێنەرانی کوردەوە درا بە (ئەنجومەن)ی بەغدا، داوایان کرد سەرتاسەری کوردستانی عێراق وەك یەك هەرێمی ئۆتۆنۆمی لە چوار چێوەی ئەو وڵاتەدا بەرەسمی بناسرێت. کوردەکان بە هیوا بوون، لەگەڵ کۆتایی هاتن بەئینتیدابی بەریتانیا بەسەر عێراقدا، خواستی ئەوان بەدی بهێنرێت، ئەگەر ئەم کارە ئەنجام نەدرێ، خوازیارن هەر لە ژێر ئینتیدابی بەریتانیا دا بن . لەبەر ئەوەی (ڕێکەوتننامەی ئینتیداب) کۆتایی هات و هیچ جۆرە وەڵامێك بەداخوازی کوردەکان نەدرایەوە، کۆمیتەی ناوەندی کوردەکان لە میزۆپۆتامیادا، لەم بارەوە سکاڵا نامەیەکی دا بە (ئەنجوومەنی ئینتیداب).

## 2-شێخ ئەحمەدی بارزانی

لەسالی 1927دا، سەرلەنوێ پشێوی ناوچە کوردنشینەکانی گرتەوە، لەم ساڵەدا رابەری روحی بارزان، لە ناوچەکەی خۆیاندا تەریقەتێکی نوێی دامەزراند بوو، کە لەگەڵ تەریقەتە سونییەکانی دیکەدا جیاواز بوو . شێخ

ئەحمەد کوڕی شێخ محەمەد کوڕی ئیسحاق کوڕی یەعقوب، لە بنەچەدا لە گوندی (بارکا) لە دووری (10) میلی باکوری هەولێرەوە لە ناوچەی زێباردا، لە گەڵ عەشیرەتەکەیاندا هاتبوونە ئەو شوێنەوە.

جێ‌مەسکەنی ئەوان وردە وردە ناوی (بارزان)ی لێنرا. کە دەکەوێتە باکوری زێی گەورەوە. ئەم عەشیرەتە خەڵکێکی چاونەترس وجەنگاوەر بوون‌و، بە هێوری ژمارەیەکی تر لە کوردە سەربزێوەکان پاڵیان دابەوانەوە، شێخ محەمەد بووە رابەری ئایینی و سەربازییان.

شێخ محەمەد چوار کوڕی هەبوو[74] (عەبدولسەلام، ئەحمەد، مەلا مستەفا، سادق -یا سدیق-)، عەبدولسەلام چەندین جار لە دژی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی راپەڕینی بەرپاکرد، بەڵام بەهۆی فشاری هێزەکانی عوسمانییەوە، پەنای بردە بەر ناوچەی مەهابادی ئێران، لە پاش ماوەیەك بە هۆی فشاری ئێلی شوکاکەوە، بە ناچاری گەڕایەوە بۆ عێراق ، سەرەنجام لەلایەن هێزەکانی عوسمانییەوە بەدیل گیرا و لە سێدارە درا. لە پاش ئەو شێخ ئەحمەدی برای بووە سەرۆکی عەشیرەتی بارزانییەکان‌و نازناوی شێخی لە باوکییەوە بە میرات بۆ مایەوە. ئەم تەریقەتە نوێیە کە مەقامی روحانی شێخ ئەحمەدی تا ئاستی خودایی بەرزکردە وە ، بووە مایەی نیگەرانی ژمارەیەك لە کوردەکانی دەوروبەریان، تەنانەت بووە هۆی ناڕەزایی (سادقی) براشی، کە پێشتر مەلایەکی بەهۆی پڕوپاگەندە کردن بۆ ئەو عەقیدەیە کوشتبوو. خودی (سادق)یش لە پێکدادانێکی نێو خۆیدا کوژرا. دواتر شێخ ئەحمەد بنەمای بیروباوەڕەکانی بە شێوەی ئاوێتەیەك لە عەقیدەی ئیسلامی‌و مەسیحیدا پێکهێناو، تەنانەت گۆشت خواردنی بەرازیشی لە پەیڕەوانی خۆی حەڵاڵ کرد. ئەم تەریقەتە نوێیە بووە هۆی دروستکردنی گرژی و ئاڵۆزییەکی نوێ

---

[74] شێخ محەمەد پێنج کوڕی هەبووە (عەبدولسەلام، ئەحمەد، مستەفا، بابۆ، سدیق). (و)

لەو ناوچەیەداو، شەڕی نێوان بارزانییەکان و شێخ ئەحمەدی برادۆستی لێپەیدابوو، هەرچەند شێخ ئەحمەدی بارزانی نەیارانی خۆی تێکشکان بەڵام ئەم گێرمەوکێشانە بووە هۆی ئەوەی لە ئاکامی فشاری مەلا مستەفای برا بچووکیدا، تەریقەتی خۆی زیاتر بەرەو عەقیدەی ئیسلامی بەرێت.

هێزێکی سەربازی عێراقی ، کە بەمەبەستی دامەزراندنی سەربازخانەیەك بەرەو بارزان جوڵا بوو، لە پاش زیان لێکەوتنێکی زۆر ناچار بە پاشە کشێ کرا، ئەو ژمارە کەمەی کە لەو ناوچەیەدا مابوونەوە تەنها لە سایەی بۆردوومانی فڕۆکە جەنگییەکانی بەریتانیادا (R.A.F) توانییان خۆیان دەربازبکەن ، بەڵام لە بەهاری 1932دا، لە کاتێکدا بەرپرسانی ئینگلیزی دەیانویست ئاسورییەکان لە دەوربەری بارزاندا نیشتەجێ بکەن، دوو بە تالیۆنی عێراقی چوونە ناوچەی بارزانەوە و ناوچەی مێرگەسووریان داگیرکرد. بەڵام بارزانییەکان شکستێکی سەختریان بەسەردا هێنان.

لەم کاتەدا دووبارە بۆردومان دەستیپێکردەوەو لە پاش جەنگو پێکهەڵپژانێکی سەخت، شێخ ئەحمەد پەنای بردە بەر تورکیا. لەئاکامی ڕێکەوتنی تورکیا لەگەڵ عێراق و بەریتانیادا، بڕیاردرا ڕێگەیان پێبدرێ بۆ ناوچەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. بەڵام لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ عێراق، شێخ ئەحمەد و خێزانەکەی و هەشتاکەس لە هەڵکەوتووترین جەنگاوەرانی بارزانی دوور خرانەوە بۆ (ناصریە) لە باشوری عێراقدا، کە چەندین ساڵ لەوێدا مانەوە. پاش ئەوە ڕێگەیان پێدرا کە بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی و بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەو شارەدا نیشتەجێبوون. لەوێدا مەلا مستەفا بە ڕوناکبیرانی کورد ئاشنا بوو، هەر لە ژێر کاریگەری ئەوانیشدا بووە ناسیۆنالیستێکی دەمارگیرو توندڕەو.

لەکاتی جەنگی دووەمدا، لە ساڵی 1943دا، مەلا مستەفا لە سلێمانی هەڵات و گەڕایەوە بارزان، سەر لەنوێ دەستیکردەوە بە چالاکی دژ بە دەوڵەتی عێراق.

لێرەدا با بۆ ماوەیەك بارزانییەکان بەجێبێڵین و بگەڕێینەوە لای شێخ محمود. ئەو کات کە هەڵبژاردنی پەرلەمان لە سپتێمبەری 1929دا، لە شاری سلێمانیدا لەلایەن کوردەکانەوە. بەهۆی دەستێوەردانی دەوڵەتەوە، بایکۆت کرا، ئەم کارە تەشەنەی کرد بۆ گشت شارەکانی دیکەی کوردستانی عێراق.

لەسپتێمبەری 1930 دا، شێخ مەحمود،کە بۆ ئێران هەڵاتبوو، گەڕایەوە ناوچەی پێنجوێن ودەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت. پاشان بانگەوازی سەربەخۆیی کرد. شێخ مەحمود هەوڵیدا دەست بەسەر ناوچە کورد نشینەکانی دروا‌سێشدا بگرێت، بەڵام لە پاش چەند مانگ لە شەڕ و لەشکر کێشی سەربازی دووبارە پەنای بردەوە بەر ئێران و لەلایەن هێزەکانی ئێرانیشەوە دەرپەڕێنرا و ناچار کرا دووبارە بگەڕێتەوە بۆ عێراق. پاش ماوەیەك دووبارە ڕێگەی پێدرا بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی.بەڵام بەهۆی ئەنجامدانی چەند جموجۆڵێکی نوێیەوە دووبارە دوورخرایەوە بۆ (ناصریە) و سەرەنجام لە ساڵی 1956دا، لە نەخۆشخانەی (ئەلحەیدەری) بەغدا دا وەفاتی کرد.

## 3-مەلا مستەفای بارزانی.

کاتێك مەلا مستەفا لەگەڵ سێ‌هەڤاڵی خۆیدا، لە سلێمانی هەڵات و گەڕایەوە بارزان، دە پێشدا نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی عێراقی ئەو ناوچەیە نارد و لەگەڕانەوەی خۆی ئاگاداری کردنەوەو بەڵێنی ئەوەشی دا ئاشتی و ئارامی ناوچەکە بپارێزێ. لەهەمان کاتدا دەستی کرد بە ئامادەکردنی چەك وکەرەسەی جەنگی و کۆکردنەوەی جەنگاوەرانی پەرتەوازەی بارزانی. لەم کاتەدا خێزانەکەی کە لە سلێمانیدا نیشتەجێبوون، دوورخرانەوە بۆ شاری(حلە)، هێزێکی سەربازیش بە مەبەستی لەشکرکێشی بۆ سەر بارزانییەکان، ڕەوانەی ئەو ناوچەیە کرا، مەلا مستەفاش دەستیکرد بە

پەیوەندی کردن بە سەرۆك عەشیرەتەکانی هاوسێی‌و ئاشتکردنەوەی دوژمنە کۆنەکانی، پێی ڕاگەیاندن کە ئەم خەباتەی ئێستای لە پێناو داسەپاندنی بیروباوەڕی تایبەتی خۆیدانی‌یە، بەڵکو تێکۆشانێکە لە پێناو سەربەخۆیی پێکڕای کوردی عێراق وئێران و تورکیادا. پاشان بەهۆی ئەو ناکۆکیانەی کە لە نێوخۆی دەوڵەتی عێراقدا، لە ئاکامی دژایەتی کردنی نفوزی ئینگلیزەکان و پەیوەست بوونی بە ئەڵمانیاوە، سەریهەڵدابوو، هەلێکی لە باری بۆ جموجۆڵی دژ بە دەوڵەت بەدەستهێنا.

لە پێناو هەڵگیرسانی شۆڕشێکی چەکدارانە لەسەر تاسەری کوردستاندا ، مەلا مستەفا هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵ (سەید بیروخ)دا ببەستێ کە یەکێك بوو لە کوردەکانی تورکیا و لەدژی دەوڵەتی تورکیادا دەجەنگا، بەڵام ناوبراو لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە تێکشکاو بەدیل گیرا. لەبەر ئەوە مەلا مستەفا لەسەرەتای جموجۆڵەکانیدا دەستی کرد بە چەك داماڵینی بنکەی پۆلیس و جەندرمەی دەوروبەری ناوچە سنوورییەکان.

ئەم چالاکی‌یە بووە مایەی پەرستنی ئەو لە نێو جەنگاوەرانی کوردو هۆزە نزیکەکانداو، زۆربەیان چوونە ڕیزی هەڤالانی ئەوەوە.

شێخ ئەحمەدی برای کە لەو کاتەدا ، لە شاری سلێمانیدا لە ژێر چاودێری دەوڵەتی عێراقدا بوو، بە فەرمانی نوری سەعید پەیامێکی بۆ مەلا مستەفا نارد و داوای لێکرد خۆی بدات بەدەست هێزەکانی دەوڵەتەوە. بەڵام ئەو بایەخی بەو پەیامە نەدا و لەبری ئەوە بەسەختی ئەو هێزە گەورەیەی تێکشکان کە بەمەبەستی سەرکوتکردنی بارزانییەکان ڕەوانە کرابوون. لە ئاکامی ئەم شەڕەدا زۆر لەو سەربازە کوردانەی کە لە ڕیزەکانی سوپای عێراقدا بوون، یەکەکانی خۆیان بەجێهێشت و پاڵیان دا بە یاخیبووانەوە. لەو کاتەدا مەلا مستەفا لەلایەن حیزبی هیواوە پشتیوانی لێدەکرا. ئەم حیزبە سەرەتا لە کەرکوکدا دامەزرا، بەڵام بە خێرایی چەندین لقی لەسەرجەم ناوچە

کوردنشینەکان و تەنانەت لە بەغداشدا پێکهێنا. زۆر لە ڕۆشنبیرانی چینی ناڤینی کورد، بە تایبەتی کارمەندانی دەوڵەت بوونە ئەندامی ئەو حیزبە. کوردەکانی ئێران و تورکیا ئەندامی ئەو حیزبە نەبوون، بەڵام کەسانی ڕۆشنبیرو پێشڕەوی کورد لەهەردوو وڵاتدا لەگەڵ ئەو حیزبەدا هاوسۆزی وهادەردییان پیشان ئەدا. حیزبی هیوا بەشێوەی ئیداری خوازیاری ئۆتۆنۆمی کوردستان بوو لە نێو چوارچێوەی وڵاتی عێراقدا. بۆ ئەم مەبەستەش چەند داوانامەی دابووە دەوڵەتی عێراق و هاوپەیمانان.

باڵوێزی بەریتانیا لە بەغدا، نوری سەعیدی سەرۆك وەزیری ئەوکاتی عێراقی ڕاسپارد کە بایەخ بە داخوازی کوردەکان بدات. لەهەمان کاتیشدا داوای لە مەلا مستەفا کرد دەست لە چالاکی دەست درێژکارانەی خۆی هەڵگرێ، لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا عێراق چووبووە ڕیزی هاوپەیمانان و هەرجۆرە دەستدرێژی کردنێك لە دژی هێزەکانی ئەو دەوڵەتە بە دەستدرێژی کردنە سەر سنووری هاوپەیمانان دادەنرا.

مەلا مستەفا هێرشکردنی بۆ سەر بنکەکانی جەندرمەی دەوڵەت ڕاگرت، نوری سەعیدیش کە تاڕادەیەك هاودەردی بەرامبەر بە کوردەکان پیشان ئەدا، ئامادە بوو هەندێك لە خواستە میانەڕەوەکانی ئەوان قبوڵ بکات، بۆ ئەم مەبەستە وەزیرێکی کوردی بە ناوی (ماجید مستەفا)وە نارده ناوچە کوردنشینەکان. ماجید مستەفا دەیزانی بە هۆی هەڵبژاردنێوە بۆ پۆستی وەزارەت و ئەندام بوونی لە کابینەی دەوڵەتدا، هەنوکە لەلایەن کوردەوە وەك خائینێك سەیر دەکرێ، بۆ ئەوەی هەر چەشنە گومانێك لە خۆی دوورخاتەوە، داوای لە حیزبی هیوا کرد تا سێ نوێنەر بە مەبەستی وتووێژکردن لەگەڵ دەوڵەتدا دیاری بکات. حیزبی هیوا بۆ ئەم مەبەستە سێ کەسی بەناوی سەروان(عێزەت عەبدولعەزیز)، سەروان (عەزیز سەید عەبدوڵلا)، سەروان ( ئەمیر ڕەواندزی)یەوە هەڵبژارد، هەرسێکیان لە ئەفسەرانی پێشووی سوپای

عێراق بوون کە ئەوێ ڕۆژێ لە نێو ئەو یاخی بووانە دا چالاك بوون و، ڕەوانەی بەغدا کران. ئەم کەسانە نامەیەکیان بۆ ماجید مستەفا بردو لە ئاکامی ئەم وتووێژانە دا بەنێوانگر دانران لە نێوان مەلا مستەفا و دەوڵەتی عێراقدا. پاشان بە ئاگاداری و ڕەزامەندی حیزبی هیوا ئەم پێشنیارانەی خوارەوەیان ئامادەکرد و دایان بە دەوڵەتی عێراق:

1-پێکهێنانی هەرێمێکی کوردنشین، کە لە شارەکانی کەرکوك،سلێمانی، هەولێر، دهۆك و خانەقین پێکبێ.

2-دانانی وەزیرێکی تایبەت لە نێو کابینەی دەوڵەتی عێراقدا بە مەبەستی لێکۆڵینەوە و بەڕێوەبردنی ناوچە کوردنشینەکان بە مەرجێك لە بەرامبەر کابینەدا لێپرسراو بێت.

3-بۆ هەر وەزیرێك، جێگرێکی کورد هەڵببژێرێت.

4-هەرێمی کورد نشین لە کاروباری کولتووری، ئابوری وکشتوکاڵیدا ئۆتۆنۆمی بێ و گشت کاروباری ناوخۆیی جگە لە سوپا و ژاندارمری، لە ژێر چاودێری حکومەتی ئۆتۆنۆمی ناوخۆدا بێت.

ئەم پێشنیارانە لەلایەن هەموو ڕابەرانی کوردەوە پەسەندکراو، پێشنوسەکانی درایە دەستە کاربەدەستانی ئینگلیزی وعێراقی. لەم سەروەختەدا ماجید مستەفا ژمارەی نوێنەرانی کوردی لە سێ کەسەوە کرد بە حەوت کەس، هەریەکە و ئەرکی بەڕێوەبردنی یەکێ لە ناوچە کوردنشینەکانی پێسپاردن وبەڵێنی پێدان کە لەپاش کۆتایی جەنگ پرۆژەی چاکسازی دەستپێبکات. بەڵام ئەم کەسانە سەبارەت بە حیزبی هیوا ئەمەکدار بوون وبە سوود وەرگرتن لەو پۆستە ئیدارییەی خۆیان دەستیان کرد بە پڕوپاگەندە کردن لەبەرژەوەندی ئەو ڕێکخراوە دا.

لە مایسی 1944دا، نوری سەعید بە خۆی گەشتێکی کرد بە ناوچە کوردنشینەکاندا و لە شارەکانی موسڵ و کەرکوکدا چەندین کۆبوونەوەی

لەگەڵ سەرانی کوردا سازدا، بەڵام لەگەڵ خودی مەلا مستەفادا کۆنەبۆوە. پاش ئەم سەردانە، نوری سەعید ئامادەیی خۆی بۆ قبوڵکردنی هەندێك لە خواستەکانی کورد ڕاگەیاند، بەڵام وەزیرە عەرەبەکان لە بەغدا دا، ئەم داخوازیانەی کوردیان بەتوندڕەوی ناوبرد و پێیان وا بوو کە قبوڵکردنی هەر خواستێکی کورد دەبێتە هۆی هاندانی ئەوان بۆ خستنەڕووی داواکاری زیاتر و حکومەتی عێراق گیرۆدەی گێرمەو کێشەی نوێ دەکەن. هەندێ لە ئەندامانی حیزبی هیوا ماجید مستەفایان بەلایەنگری داواکارییەکانی خۆیان و هەندێکیشیان ناوبراویان بە خائین بە ئامانجەکانی حیزبی هیوا دەزانی و لەو باوەڕەدا بوون کە ناوبراو نیازی کات بە هەدەردان و لەخشتەبردنی کوردەکانی هەیە.

لەم کاتەدا متەسەریفی سلێمانی کوردێکی ژیرو خوێندەوار بوو بەناوی (بەهائەدین نوری)یەوە، کە لە بەرژەوەندی نوری سەعید دا کاری دەکرد. پاشان ناوبراو بووە باڵوێزی عێراق لە ئێراندا. لە میانەی ئەو دیدارو کۆبوونەوانەی لەنێوانمادا ئەنجام ئەدرا. ئەوم بە کەسایەتییەکی بێلایەن دیت سەبارەت بەمەسەلەی کورد.

لە پاش کەوتنی کابینەی نوری سەعید و هاتنە سەرکاری (پاچەچی)[75]، ئەم سیاسەتی لێکحاڵی بوونەی نێوان دەوڵەتی عێراق و کورد گۆڕانکاری بەسەردا هات، ژەنراڵ بەهائەدین لە متەسەریفی سلێمانی لابراو دەوڵەتی مەرکەزی خۆی بێبایەخ و تەنانەت نەیاریش سەبارەت بە خواستەکانی کورد پیشان دا، لە هەمان کاتدا وەفدی نوێنەرایەتی کورد کە لە بە ئاکام نەگەشتنی ئەرکەکانیان حاڵی بوون، گەڕانەوە کوردستان.

لە نێو ئەندامانی ڕێکخراوی کوردی وابەستە بە مەلا مستەفادا، دوو کەس لە هەموان چالاکتر بوون، کە (میر حاج ئەحمەد) و(مستەفا خۆشناو)بوون،

---

[75] -حەمدی پاچەچی لە 4 ی حوزەیرانی 1944 دا وەزارەتی پێکهێناو تا 31ی کانونی دووەمی 1946 سەرۆك وەزیری عێراق بوو.(و)

هەردوویان لە ئەفسەرانی پێشووی سوپای عێراق بوون و کۆشش و هاتو چۆکردنیان بووە مایەی ئەوەی کاربەدەستانی حکومەت لێیان بە گومان بن. بەڵام مستەفا خۆشناو توانی هەڵبێت و بچێتە بێروت، کە ماوەیەك لەو شارە دا مایەوە. ئەندامێکی چالاکی دیکەی کورد سەروان (عێزەت عەبدولعەزین) بوو، کە پێشتر بە مەبەستی پەیوەندی کردن بە ئەندامانی حیزبی (خۆیبون)ەوە، چوو بووە بێروت و قاهیرە. لەگەڵ گەڕانەوەیدا بۆ بەغدا و بەخەبەر هاتنی لە بارودۆخی هەڤاڵانی خۆی، چووە بارزان و چەند کەس لە ئەفسەرانی کوردی پێشووی سوپاش پەیوەندییان پێوە کرد. چالاکییە سیاسییەکانی ئەم گروپە بووە هۆی بەهێز کردنی روحییەی حیزبی هیوا وئەندامانی ئەو حیزبە بۆ ماوەیەك ناکۆکییەکانی خۆیان لەگەڵ بارزانییەکاندا خستە لاوە و بەهاوپەیمانی وپێکەوە لە دژی دەوڵەتی عێراق تێکۆشان.

لە کانونی دووەمی 1945دا، مەلا مستەفا ڕاستەوخۆ چەند داواکارییەکی لەسەر بنچینەی بە ڕەسمی ناسینی دەستبەجێی کوردستان بۆ دەوڵەتی عێراق و بەریتانیا نارد. لەم کاتەدا چوار ڕێکخراو بە شێوەیەکی جودا لە پێناو سەربەخۆیی کوردا تێدەکۆشان، کە زۆرجار چالاکیەکانی ئەوان گیرۆدەی ململانێی شەخسی بوو:

1/حیزبی هیوا، کە سەرکردایەتیەکەی لە بەغدای لقەکانی لە کەرکوك ، سلێمانی، هەولێرو هەندێ لە شارەکانی دیکەی عێراقدا بوو، ئەم ڕێکخراوە لایەنگری ئایدۆلۆژی کۆمۆنیستی بوو، ئۆرگانی ئەم حیزبە ڕۆژنامەی (ئازادی) بە ئاشکرا داکۆکی لە کۆمۆنیزمی نێو نەتەوەیی و دژایەتی کۆنەپەرستی و فیودالیزم و ئیمپریالیزمی دەکردو، پابەستی بەرنامە و چالاکی گشتی حیزب نەبوو، لە تێگەشتن لە خەباتی سەردەمی هەنوکەدا بێ توانا بوو. مەلا مستەفای وەك ڕابەری چالاکی بزاڤی کورد دەناساند، بەڵام لە ڕەفتاری دیکتاتۆریی و دینداریی ئەو بە گومان بوو، دەیویست تەنها بۆ ئەنجامدانی

مەبەستەکانی خۆی تا بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی سوود لە بوونی ئەو وەربگرێ.

2/لیژنەی ئازادی، کە لە ناوچەی بارزاندا، بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا دامەزراو سەرجەم ئەندامانی، جگە لەیەك کەسایەتی، لە سەرۆك عەشیرەت، کەسایەتی سوپایی وخاوەن ئیشوکاری ئازاد بوون، بەمجۆرەی خوارەوە:

1–عێزەت عەبدولعەزیز لە ئامێدی (ئەفسەری پێشووی سوپا)

2–مستەفا خۆشناو (ئەفسەری پێشووی سوپا)

3–عەبدولحەمید باقر لە خانەقین (خێڵەکی).

4–محەمەد مەحمود لە سلێمانی.

5–ئەحمەد ئیسماعیل لە ئاکرێ.

6–شەوکەت نعمان لە ئامێدی.

7–حفزوڵلا ئیسماعیل لە ئاکرێ.

ئەم ڕێکخراوە لە پاش هاندان و پشتگیری مەلا مستەفاو ناوزەد کردنی ئەو وەك رابەری بزاڤی ڕزگاری خوازانەی کورد، لەلایەن حیزبی هیواوە دامەزرا.

3/ لەدەرەوەی عێراق و لە نێو سنوورەکانی ئێراندا، لەو ناوچانەدا کە لەلایەن سوپای سۆڤیەتەوە داگیرکرابوون، ڕێکخراوی کۆمەڵە دامەزرا (کە لەبەشی پێشوودا باسکرا)

4/ حیزبی (خۆیبون)، ڕێکخراوێکی ناسیۆنالیستی کورد بوو کە لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانییەوە هاتبووە کایەوە، ستراتیژی دووری ئەو، دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی گەورەو، بۆ کاتی ئێستا ئامانجی چالاکییە سیاسی و ئابورییەکانی دەستەبەرکردنی فاکتەرە پەیوەندیدارەکانی پەیوەست بە بەرزکردنەوەی هەستی نەتەوەیی بوو لە ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا و سوریا و ئێران و عێراقدا.

هەرچەند حیزبی خۆیبون بە شێوەیەکی مەعنەوی پشتیوانی لە سێ

ڕێکخراوەکەی تر دەکرد، بەڵام هیچ یەك لە چالاکییەکانیان یا سیستەمی سیاسی ئەوان مایەی قبوڵکردنی حیزبی خۆیبون نەبوو، کە زۆربەیان ڕوناکبیرانی وابەستە بە ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی و لایەنگری سیستەمی دیموکراسی ڕۆژئاوایی بوون.

لیژنەی ئازادی لە 23ی شوباتی 1945دا، چالاکییەکانی خۆی دەستپێکرد. لە نامەیەکدا کە لە وەڵام بەنامەی حیزبی هیوادا نووسیبوویان. ئاماژەیان بەوەکرد کە ئامانجی سەرەکیو بنەڕەتی ئەوان بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمییە بۆ کوردەکانی عێراقو سیاسەتی دەرەکیشیان لەسەر پایەی بێلایەنی دەبێ. ئەم ڕاگەیاندنە گەلێك هوشیارانە داڕێژرابوو، چونکە هەر چۆنێك بێ سیاسەتی دەرەوەی حکومەتێکی ئۆتۆنۆمی ، دەبێ پەیڕەوی لە سیاسەتی دەوڵەتی مەرکەزی بکات.

بەرنامەی لیژنەی ئازادی بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

1/زامن کردنی لێکحاڵیبوون و هاوکاری لە نێوان عەشیرەتی بارزان و دەوروبەریداو پاشان لەگەڵ سەرجەم عەشیرەتەکانی کوردی عێراقدا.

2/پاراستنی بێلایەنی وبەدیهێنانی ئەمن و ئاسایشی کوردستانی عێراق، بە هۆی چالاکی سیاسی و بەرگری لە خۆکردنەوە.

3/پەیوەندی کردن بە گشت ڕێکخراوە ناسیۆنالیستەکانی کوردەوە.

4/پێشکەش کردنی سکاڵاو داوانامە بە نوێنەران.

5/بڵاوکردنەوەی بەیاننامە و پڕوپاگەندە.

6/تێکۆشان لە دژی سیاسەتی کۆنەپەرستانە و ئیستبدادی دەوڵەتی عێراق.

7/ئامادەکردنی کەل و پەل و کەرەسەی جەنگی بۆ هێزە چەکدارەکانی کورد.

پاش ئەوە تەبایی لە نێوان حیزبی هیوا و لیژنەی ئازادی سەر بەمەلا

مستەفادا بەدیهات. هەرچەند هەردوو ڕێکخراو پشتیوانییان لە یەکدی دەکردو ئامانجیان تێکۆشان بوو لە پێناو بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمیدا ، بەڵام هەندێك جیاوازی بیروڕا، تەنانەت لە یەکەمین نامە گۆڕینەوەی نێوانیانەوە، لە ئارادابوو. حیزبی هیوا دەیویست سەرکردایەتی خۆی لە بەغداوە بگوازێتەوە بۆ بارزان، تا لە نزیکەوە پێنگاڤ وکاری رابەری لەدەستدا بێت، بەڵام مەلا مستەفا نەیدەویست ژمارەیەك ڕۆشنبیری چەنەباز یا بە نفوزی لە پاڵ دەستدا بێت، لەبەر ئەوە داوای لێکردن کە لە بەغدا بمێننەوە و لە سەر پەیوەندی کردن بە ڕێکخراوە کوردییەکانی دیکەوە بەردەوام بن. هەر لایەکیان گازندەی ئەوەی دەکرد کە لایەنەکەی دی ژیرانە کارەکانی بەڕێوە نابات، لە لایەکەوە مەلا مستەفا دەیویست بە ئازادی چالاکی و کارەکانی خۆی بەڕێوە بەرێ و لیژنەی ئازادیش لەبن دەست و ملکەچی فەرمانەکانی ئەودابێ، ئەو نەیدەویست ئەم ئازادی کارکردنەی گیرۆدەی تیۆرو دەستێوەردانی کەسانێك بێ کە لە دژواری وسەختی جەنگ وخەباتی چەکداری بە ئاگانین، چ بگا بەوەی کە دەستێوەردانی ئەوانیش زیانی لێبکەوێتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە بە هۆی کەوتنە گەمارۆوە لە نێو چیا و جەنگەڵە دوور دەست و دوور لە هەر جۆرە ئامرازێکی ژیاندا، هێزی شۆڕش پێویستی بە کەرەسەی جەنگی و زانیاری پێویست بوو، کە دەبوو حیزبی هیوا ئەرکی گەیاندنی ئەو پێویستیانە لە ئەستۆبگرێ.

لە مایسی 1945دا، حیزبی هیوا یاداشتێکی نارد بۆ باڵوێزی ئەمریکا (لوئی هندرسۆن) وخوازیاری پشتگیری وکۆمەکی ئەمریکا بوو بەمەبەستی دامەزرانی دەوڵەتی ئۆتۆنۆمی کورد و بەڕێوەبردنی ئەو ڕیفۆرمانەی کە نوری سەعید بەڵێنی بە ئەنجام گەیاندنی دابوو، هەروەها ناڕەزاییان بەرامبەر بە جموجۆڵی سەربازی بەریتانیا، بە مەبەستی یارمەتیدانی دەوڵەتی عێراق بۆ سەرکوتکردنی کورد، دەربڕی، لەم یاداشتەدا داوا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی

ئەمريكا كرا بوو كە ڕێز لە كرۆكی مادەی 12ی ڕاگەیاندننامەی سەرۆك ویڵسۆن بگرێ وئەو مادەیە بەڕێوەببات. نوسخەیەك لەم یاداشتە بۆ هەریەك لە باڵوێزخانەكانی سۆڤیەت وچین و فەرەنساش ڕەوانەكرا. هەر لەم كاتەدا چەندین یاداشت وڕاگەیاندننامەی دیكە لەلایەن لیژنەی ئازادی وحیزبی هیواو ڕێكخراوی لاوانی كوردەوە چاپ كرا، وسەر و نوسخەی بۆ سەرجەم نوێنەرانی دەوڵەتان وباڵوێزخانەكان و كەسایەتی پێشڕەو و ڕوناكبیری كوردی نیشتەجێی عێراق نێردرا.

لەیەكی مارسدا حیزبی هیوا، مەلا مستەفای ئاگادار كردەوە كە حكومەتی عێراق، تیپی چوارەمی بە هاوكاری ژمارەیەكی زۆر لە پۆلیس و هێزی نیزامی دیكە، ئامادەكردووە و بەنیازە لە ڕۆژی پێنجی مارسدا هێرش بكەنە سەر بارزان. لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵەدا، مەلا مستەفا هێزەكانی بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش كرد:

1/فەرماندەیی بەشی ڕۆژهەڵاتی دەڤەری مێرگە سوروبرادۆست بە سەروان مستەفا خۆشناو ومحەمەد مەحمود سپێردرا.

2/فەرماندەیی بەشی ڕۆژئاوا لە ناوچەی ئامێدییەوە بەسەروان عێزەت عەبدولعەزیز و عەبدولحەمید باقر سپێردرا.

3/فەرماندەیی بەشی باشور لە ناوچەی (ئاكرێ) وە بە شێخ سلێمان سپێردرا.

لە پاش ئەم دابەش كردنە، فەرماندەی هەر ناوچەیە و لەگەڵ هێزەكانی خۆیاندا بەرەو شوێنی دیاریكراوی خۆیان كەوتنەڕێ.

لەوكاتەوە تا سەرەتای (ئاب) زنجیرەیەك وتووێژ لە نێوان كوردەكان و ئەفسەرانی ئینگلیزیدا بە سەرۆكایەتی مێجەر مۆر (كاپتن ئەستاك) ئەنجام درا. ئینگلیزەكان پێشنیاری ئەوەیان كرد مەلامستەفا و ڕابەرانی شۆڕش دەست لە كاری چەكداری هەڵگرن و ڕووبكەنە ناوچەكانی باشوری عێراق ولە

هەر شوێنێکدا بەدەر لە ناوچە کورد نشینەکاندا ئارەزوو بکەن نیشتەجێ بن، بەڵام ئەم پێشنیارە لەلایەن مەلامستەفاوە ڕەتکرایەوە. دەوڵەتی عێراق بڕیاریدا ڕەوشێکی توند و تیژتر بەرامبەر بارزانییەکان بگرێتە بەر، بۆ ئەم مەبەستەش فەرمانی بەیەکەکانی پۆلیس دا لە هەر شوێنێکدا بارزانییەکی چەکداریان دیت دەستگیری بکەن.

لە 10 ی (ئاب) دا، لە کاتێکدا مەلا مستەفا سەر قاڵی ئامادە کردن و ڕێکخستنی هێزەکانی خۆی بوو، لە دەرەوەی ناوچەی بارزاندا، هێزی پۆلیس هەوڵیاندا وەلوبەگ (ولد بەگ) ناوێك دەستگیر بکەن کە بۆ وەرگرتنی بەشی ئازوقەی خۆی سەردانی مەخفەری پۆلیسی کردبوو، بەڵام ناوبراو بەرگری لە خۆی دەکاو، مەخفەرەکەش لە پاش زیانلێکەوتنێکی قورس لەچەك داماڵرا، لە پاش ئەم ڕووداوە چەند فەرمانگە و بنکەی عێراقی دیکەش لەلایەن بارزانییەکانەوە دەستیان بەسەرداگیرا وچەك کران. لەم کاتەدا شێخ ئەحمەد زیاتر لە مەلا مستەفا بە ئارەزووبوو بگەڕێتەوە بۆ ناوچەی بارزان و ئەو کارانە لە ئەستۆ بگرێت. لەبەر ئەوەی هێزەکانی عێراقیش لەم کاتەدا دەستیان کردبوو بە لەشکر کێشی، مەلا مستەفا فەرمانی بەرگری کردنی ڕاگەیاند و لە هەمان کاتیشدا نامەیەکی نارد بۆ باڵوێزی ئینگلیز و گشت نوێنەرانی هاوپەیمانانی نیشتەجێی بەغدا وداخوازی ئەوەی لێکردن کە داوا لە حکومەتی عێراق بکەن تا دەست لە درێژەدان بە هێرش و لەشکر کێشی هەڵگرێ و خاکی بارزان بە جێبێڵێ.

لەم کاتەدا تیپی چوارەمی عێراقیش بە پشتیوانی فڕۆکەی جەنگی کەوتە پەلاماردانی ناوچەکانی باشوری بارزان. کوردەکانیش پەنایان بردە بەر ناوچە شاخاوی و کوێستانەکانی خۆیان وکەوتنە جەنگەی شەڕو نەبەردەوە.

بەڵام لە دوو ئاڕاستەی دیکەوە کە لە ژێر چاودێری هێزی هەوایدا نەبوو، بارزانییەکان زیانێکی قورسیان بە هێزەکانی دەوڵەت گەیاند.

لە باشوریشدا شەڕێکی سەخت لە نێوان کوردو هێزەکانی دەوڵەتدا ڕوویدا، کە بووە هۆی زیانگەیاندنێکی قورس بە هێزەکانی دەوڵەت. ئەم شەڕە بەمجۆرە ڕوویدا: تیپی پێنجەم لە (ئاکرێ) وە بەرەو (زێبار) پێشڕەوی کرد و چووە نێو دەربەندی (نحلە)وە، لە پاش تێپەڕین بەو دەرەیە دا، خۆیان گەیاندە قەدپاڵەکانی چیای گەلی پیرۆز، ئەم پێشڕەوی کردنە لە ژێر سایەی بۆردومانی هێزی هەواییدا بەڕێوە دەچوو. لەم کاتەدا مەلا مستەفا لەگەڵ کۆمەڵێك چەکداری بارزانیدا، لەپەناو پەسێوی تاشە بەردی ئەم کوێستانەدا خۆیان حەشاردابوو، چاوەڕوانی هاتنە ناوەوەی هێزەکەی دەوڵەت بوون. لەپاش کۆتایی هاتنی بۆردومان و نزیك کەوتنەوەی هێزی حکومەت، لە پەناگەی خۆیان هاتنە دەر و کەوتنە ئاگر باران و دستڕێژکردن لە هێزەکە ، هەر لەم کاتەدا ژمارەیەکی دیکە لە بارزانییەکان کە لە هەردوولای دەربەندەکەوە سەنگەریان گرتبوو دەستیان کرد بە تەقەکردن لە هێزەکە ولە ئاکامی ئەم هەلومەرجەدا، تیپی پێنجەم تەنگەتاو و شپرزە بوو، هێندەی نەمابوو خۆیان بدەن بەدەستەوە، لە پاش دوو ڕۆژ لەشەڕی سەخت، هێزێکی کۆمەك کە لە سێ سەد جاشی عەشیرەتی سورچی پێکهاتبوون و دوژمنی دێرینی مەلا مستەفا بوون، بە هانای هێزی میرییەوە هاتن، لە ئاکامدا مەلا مستەفا ناچار بوو ڕوە و بەرزاییەکانی گەلی پیرۆز بکشێتەوە.

عێراقییەکان بەرەو برادۆست کشانەوەو لەپاش ئەوەی لەلایەن تیپی دووەمەوە پشتیوانییان لێکرا وبەهێزکران، لەشکر کێشیان ڕوەو باکور دەستپێکردەوە، لەم کاتەدا لەلای باشورەوە لەلایەن عەشیرەتی (محەمەد ئاغای مێرگە سوری)یەوە، هێرشیان کرایە سەرو زیانێکی قورسیان لێکەوت. لە پاش ئەم شەڕو پێکهەڵپژانە، کوردەکان ڕوەو باکور گەڕانەوە، کە دەستکەوتێکی زۆریان لە هێزی دەوڵەت بەدەستهێنا بوو. لەم کاتەدا نزیك بە 500چەکداری عەشیرەتی زێباری‌و بادینی دیکە، کەسەر بە دەوڵەتی عێراق بوون، لەگوندی

(هەرمن)دا سەنگەریان لە بارزانییەکان گرتبوو، ڕێگای گەڕانەوەی ئەوانیان خستە مەترسییەوە، مەلا مستەفا بڕیاریدا بە پشتیوانی چەند تۆپێکی چیایی کە لە سوپای عێراقی گرتبوو، زێبارییەکان بەرەو دوا پاشەکشێ پێبکات، بەڵام بە هۆی خراپی ڕێکخستنەوە نەیتوانی سودێکی ئەوتۆ لەو تۆپانە وەربگرێ. لەم کاتەدا، هێزی عێراقیش کە بۆ پشتیوانی کردن لە زێبارییەکان هاتبوون، نزیك دەبوونەوە، مەلا مستەفا ناچار بوو دوو بارە ڕوەو چیاکانی گەلی پیرۆز بکشێتەوە.

لە تاریکو ڕوونی 25ی سپتێمبەری 1945دا، مەلا مستەفا لە کەژو کێوە بەرزەکانی ئەو کوێستانەدا لەلایەن هێزی دوژمنەوە - لەلایەکەوە سێ سەد جاشی عەشیرەتی سورچی وتیپی پێنجەمی عێراق لە سایەی پشتیوانی فڕۆکەی جەنگیو تۆپخانەوە لەلای قەدپاڵەکانی باشورەوەو لە لایەکی دیکەشەوە لەلایەن 500چەکداری عەشیرەتی بەرواری و شرحانییەوە - گەمارۆدرا . بارزانییەکان تا تاریك کردن درێژەیان بەشەڕدا. پاشان بە سوود وەرگرتن لە تاریکی شەو بە هێوری بەرەو چیای شیرین کشانەوە، ئەم چیایە کە 7 هەزار پێ لە بەرزی دەریاوەیە، پێگەیەکی هەموار بوو بۆ بەرگری لە خۆکردن. پاشان شێخ ئەحمەد و پیاوانی دیکەی عەشیرەتی بارزانی، گوندەکەیان بە جێهێشت وچوونە پاڵ ئەوانەوە. مەلا مستەفا لەم شوێنەدا خۆی لە تەنگەژەو قەیراندا دیتەوە، لەبەر ئەوەی لە باکوریشەوە تورکەکان بە وردی چاودێرییان لە هێڵە سنورییەکانی خۆیان دەکرد. لەم کاتەدا هەواڵیان پێگەشت کە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی بارزان لە دەست لایەنگرانی بارزانییەکاندایە و هێزی دوژمنی تیانییە، ناوچەی (کانی ڕەش)یش لەسەر سنووری ئێراندا لە لایەن بارزانییەکانەوە دەستی بەسەرداگیراوەو بۆ کشانەوە بەرەودوا هەموارە، بەمجۆرە مەلامستەفا فەرمانی بە بارزانییەکان دا، گشت پێداویستی ژیان ومەڕو ماڵات و ژن و زارۆکی خۆیان کۆبکەنەوەو بەرەو سنووری ئێران

پاشەکشێ بکەن.

لە ڕۆژئاوای ئێراندا ڕێکخراوی کۆمەڵە تازە دامەزرابوو، ناوچە سنوورییەکان لە دەست ناسیۆنالیستەکانی کوردا بوو. چالاکی بارزانییەکان ولایەنگرانیان لە ئێراندا (لەبەشی پێشوودا باسکرا).

شۆڕشی ساڵی 1945 ی مەلا مستەفا لەگەڵ شۆڕشی شێخ ئەحمەدی ساڵی 1931دا، لەوەدا جیاواز بوو کە شێخ ئەحمەد ئەو کات بۆ پاراستنی دەسەڵاتی عەشیرەتی بارزانی و بەرگرتن لە نیشتەجێ بوونی ئاسوورییەکان لەو ناوچەیەدا دەجەنگان . بەڵام مەلا مستەفا خەباتی بۆ سەربەخۆیی کورد دەکرد. خەباتی شێلگیرانەی شێخ مەحمودی حەفیدیش لە پێناو بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمیدا تەنها لە ناوچەیەکی دیاری کراودا سنووردار بوو، بەڵام شۆڕشی مەلا مستەفا بۆ یەکەمین جار پشتیوانی حیزبی نەتەوەیی دەستە بەرکرد و خاوەنی سیمایەکی ناسیۆنالیستی دیاری کراو بوو، وێڕای ئەوەش بە هۆی نەیاری وبەرهەڵستی ئاشکرای سەرۆك عەشیرەتەکانی دیکەی کوردەوە کە لە بیری پاراستنی دەسەلات وبەرژەوەندی خۆیاندا بوون، ئەم شۆڕشەش هەر بەو جۆرەی کە دیتمان، لەگەڵ شکستدا ڕووبەڕوو بۆوە و تێکشکا.

## 4-شۆڕشی کورد و خەباتی دژ بە دەوڵەتی عێراق

لەساڵی 1945وە تا 1958 هیچ جۆرە شۆڕشێکی گرنگی خێڵەکی یا ناسیۆنالیستی لە کوردستانی عێراقدا ڕووی نەدا، جگە لە پڕوپاگەندەی ڕادیۆیی کە لە ڕادیۆی نهێنی کوردەکانەوە لە قەفقاس دا پەخش دەبۆوە و لەلایەن کاربەدەستانی سۆڤیەتەوە بە هاوکاری مەلا مستەفا بە ڕێوەدەبرا، هەروەها هاتوچۆی نهێنیش لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بۆ عێراق ئەنجام ئەدرا کە زانیاری پێویست لەلایەن بەرپرسانی تایبەتییەوە لە عێراقەوە بۆ یەکێتی

سۆڤیەت و فەرمانی پێویستیش لەلایەن مەلا مستەفاوە بۆ ناسیۆنالیستەکانی کوردی عێراق لەوپەڕی نهێنیدا ئاڵوگۆڕ دەکرا.

هەر چۆنێك بێ، بەهۆی ڕەوکردنی بارزانییەکانەوە لە عێراق، هەستی سەربەخۆخوازی کوردەکان لە بێ سەرپەرشتی و ڕێکنەخراوەیدا بوو ، چالاکییەکانی حیزبی هیواش ڕوو لە دامرکانەوە بوو ، شێخ مەحمودی ناوداریش لە دوورخراوەیی گەڕایەوە و وەفاتی کرد.

ئیدی هیچ رابەرێکی شیاو لە نێو کوردەکانی عێراقدا بەرچاو نە دەکەوت. مەلا مستەفا و هەڤاڵانی لە قەفقاسدا بوون و، خۆیان بۆ ڕۆژێك ئامادە دەکرد کە ڕەنگە هەرگیز نەیەتە پێش. بەڵام لە ناکاو، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو شۆڕشی چواردەی تەموز ڕوویدا و دەوڵەتێکی نزیك بە یەکێتی سۆڤیەت لە عێراقدا هاتە سەرکار، کە ئامادە بوو سیاسەتێکی دیموکراسیانە لەمەڕ کێشەی کەمینەی کوردا لە پێش بگرێت.

مەلا مستەفاو هاوڕێیانی لەڕوسیا گەڕانەوەو ڕۆژانی شادیو خۆشی هات ، بەڵام هێندە درێژەیان نەکێشا .

مەلا مستەفا بە هاوڕێی شەش کەس لە دۆستانی _ ئەسعەد خۆشەوی، مەدحەت ئەحمەد، شێخ سلێمانی برازای و شێخ بابۆی ئامۆزای و دوو کەسایەتی دیکەدا- بە فڕۆکە گەشتنەوە بەغدا.کۆشکی نوری سەعید و ئۆتۆمبێلی (عەبدوللالە) یان پێدا . دەپێشدا دەستی کرد بە چالاکی و هاوکاریکردنی ڕێکخراوە چەپڕەوەکانی وەك حیزبی شیوعی و پارتی نیشتمانی دیموکراتی کامل چادرچی وژمارەیەك لە ئەندامانی پاشماوەی حیزبی هیوا. پاشان سەر لە نوێ پارتی دیموکراتی کوردستانی لەسەر بەرنامەیەکی گەلەك چەپڕەوانە ڕێکخستەوە.

ڕۆژێك بە دوای گەڕانەوەی ئەودا بۆ بەغدا، سەرجەم هاوڕێیانی دیکەی بەکەشتی گەڕانەوە عێراق، ژمارەیەکیان لە بەغدادا مانەوەو لەگەڵ مەلا

مستەفادا كاريان كرد، بەلاّم زۆربەيان گەڕانەوە بۆ ولاّت و زێدی خۆيان وەك بارزان و ئاكرێ‌و مێرگە سوور.

مەلا مستەفاو ژمارەيەكی ديكە لە شيوعييەكان نێوانگری عەبدولكەريم قاسم و يەكێتی سۆڤيەت بوون، هەر چييەك ئەو دەيويست بۆی ئامادە دەكرا.

چەك درا بە بارزانی و هاوڕێيانی تا بەرگری لە ڕژێمی نوێی عێراق بكەن. دوژمنانی ڕژێمی نوێ بريتی بوون لە (شێخە)كانی عەرەب، دەرەبەگ و ئاغاكانی كورد و موڵكدارانی لايەنگری ڕژێمی پاشايەتی، پاشان (ناصر)ييەكانيش دژايەتييان كرد كە بۆ لكاندنی عێراق بە ميسرەوە تێدەكۆشان.

هەر يەك لە ئەندامانی پارتی ديموكراتی كوردستان شوناسنامەی حيزبييان پێدرا، (شوناسنامەی لايەنگرانی پارتی بە وێنەوە بوو، شوناسنامەی ئەندامەكانيشی بەڕەنگی سەوز بوو، كە هەڵگری ئەم شوناسنامەيە مافی چەك هەڵگرتنيشی هەبوو). هەروەها گاردی بەرگری ميلليش، كە شيوعييەكان تيايدا نەخشی سەرەكييان هەبوو، لەسەر تا سەری عێراقدا پێكهێنرا،زۆر لە كوردەكانی هاوڕێی مەلا مستەفاش چوونە ڕيزی ئەم گاردانەوە وسەرپەرشتی ئەوانيش بە كۆلۆنێل (بامەڕنی) كورد سپێردرا.

ئەوكات لەبەر ئەوەی مەلا مستەفا تازە لە يەكێتی سۆڤيەت گەڕابۆوەو، ماوەيەكی دوور و درێژ بە بيروباوەڕی سەربەخۆيی سەرجەم كورد گۆش كرابوو، بڕياری دا كۆنگرەيەك بە بەشداری نوێنەرانی پێكڕای كوردەكان (ئێران–توركيا–عێراق–سوريا) ببەستێ. پڕۆگرامی كارەكانيشیبەڕەزامەندی ديدو بۆچوونی ئەوان بەرنامە ڕێژی بكات. ئەم ويستە لەگەڵ ئايدۆلۆژی شيوعييەكاندا وێك نەدەهاتەوە كە لە فكری بە كۆمۆنيست كردنی عێراقدا بوون، هەرچەند بزاڤی كورديش ناسيۆناليسمێكی لايەنگر بە سۆشياليزميش بێ. خودی عەبدولكەريم قاسميش لەفكری عێراقێكی تەواو سەربەخۆو بەدەر

لە نفوزی جمال عبدولناسردا[76] بوو، بەرامبەر بە دەسەلاتپێدانی سیاسی بە کوردەکان کە ڕاستەوخۆ جیابوونەوەی بەشێك لە خاکی عێراقی لێبکەوێتەوە نەیار بوو. هەرچۆنێك بێ ئەم کۆنگرەیە بێ بەشداری نوێنەرانی کوردی ئێران و تورکیا بەسترا. کوردەکانی ئەو وڵاتانە لە ترسی ئەوەی کە نەبادا بەشداربوونیان ببێتە مایەی فەراهەم کردنی نیگەرانیو بەدگومانی دەوڵەتەکانیان لەم کۆنگرەیەدا ئامادە نەبوون. ئەم کۆنگرەیە بە هۆی لە کاردا بوونی بەرنامە سۆسیالیستییەکانی وەك چاکسازی کشتوکاڵی و دابەش کردنی زەوی لەگەڵ نارەزایی سەرۆك عەشیرەتەکانیشدا ڕوویە ڕوو بۆوە کە زۆربەیان خاوەنی گوندێك یان چەند گوندێك بوون.

مەلامستەفا سەرنجی دا کە بەشدارانی کۆنگرە تەنها ژمارەیەکی دیاریکراو لە کوردە ڕۆشنبیرەکانی نیشتەجێی بەغداو شارەکانی دیکەی عێراقن، ئایدۆلۆژی چەپڕەوانەی وەك چاکسازی کشتوکاڵی و زەویو زاری وەلانا. پاشان سەردانێکی کورتی یەکێتی سۆڤیەتی کرد تا بڕێك بەڵگەنامە کە لەوێدا بەجێی هێشتبوو لەگەڵ خۆیدا بهێنێتەوە، لەهەمان کاتیشدا سەبارەت بە بارودۆخی عێراق ڕاوێژ لەگەڵ دۆستانی خۆیدا بکات لەوێدا . لەم کاتەدا هێشتا پارتی دیموکرات لەگەڵ هەموو ڕێکخراوە چەپەکانی عێراقدا سەرقاڵی هاوکاری وکارکردن بوو. بەڵام ئەو ناکۆکیانەی کە لە وەختی خۆیدا لە نێوان حیزبی هیواو مەلا مستەفادا هەبوون، لە پارتی نوێی دیموکراتیشدا بەرچاو دەکەوت.

لەوکاتەدا عەبدولکەریم قاسم لە پاش ناکامی پیلانی عەبدولسەلام عارف و

---

[76] –جەمال عبدولناسر: (1918–1970) بەناوبانگترین سەرکردەی عەرەب بوو لە دەیەی پەنجاو شەستدا، بزاوتی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی دامەزران کە لە 1952 دا مەلیك فاروقیان لە کارخست، لە 1956دا کەناڵی سویسی خۆماڵی کرد ولە 1958دا بووە سەرۆك کۆمار.(و)

ڕەشید عالی گەیلانی، بە تەواوی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ناسرییەکاندا ڕووی لە گرژی و ئاڵۆزی کرد ، هەوڵیدا لەم ململانێیەدا هەرچی زیاتر شیوعییەکان لە خۆی نزیك بکاتەوە. تا بەڵکو لەم ڕێگایەوە چالاکی ناسرییەکان، کە خاوەنی لایەنگرانی بێ ئەژمار بوون بە تایبەتی لە نێو ئەفسەرانی گەنجی سوپادا، لە کاربخات. ڕادیۆی (صوت العرب)یش دەستی کرد بە پڕوپاگەندەکردن لە دژی عەبدولکەریم قاسم وئەوی بە خائین بە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی عەرەب لەقەڵەم دا.

لە 8ی مارسی 1959دا، لەشکری دووەمی عێراق، بە فەرماندەیی سەروان (شەواف)[77] لەموسڵدا، شۆڕشی بەرپا کردو یاخی بوو، گەرەکی بوو هێرش بکاتە سەر بەغدا، ئەم کارە پێگەی عەبدولکریم قاسمی خستە مەترسییەوە، ئەگەر لەشکری نیشتەجێی بەغدای بەکار بهێنایە بۆ دامرکاندنەوەی یاخیبوونی شەواف، دوور نەبوو لایەنگرانی ناسری لە پشتەوە پەلاماری لێبدەن و زەمینەی ڕوخانی ئەو فەراهەم بکەن، هەروەها دوور نەبوو ژمارەیەك لەم هێزانە لەکاتی ڕوو بەڕوو بوونەوەیاندا لەگەڵ دۆستانی خۆیاندا لە لەشکری دووەمدا، دەست لە جەنگ هەڵگرن وبچنە پاڵ ئەوانەوە. هەرچۆنێك بوو بێت ، عەبدولکەریم قاسم بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو کێشەیەدا بیری لە ڕێگا چارەیەکی دی کردەوە، داوای لە مەلا مستەفا کرد کە لەگەڵ کوردەکانی لایەنگر بە خۆیدا هێرش بکاتە سەر موسڵ. لەهەمان کاتدا داوای لە شیوعییەکانی موسڵ کرد لە دژی شەواف ڕاپەڕن و، هەرچی خێراتریش بۆ ئەم چالاکییە دەستبەکاربن. چونکە ئەگەری ئەوە لە ئارادا بوو کە عەشیرەتی شەمەری عەرەبی نیشتەجێی سنوورەکانی سوریا بە هانای شەوافەوە بەرەو موسڵ بێن وبەرگری لێبکەن. کوردەکان شاری موسڵیان گەمارۆدا و بە

---

[77] -عەبدولوەهاب شەواف: (1916-1959)ئەندامی بزووتنەوەی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی عێراق بوو، لەنەتەوە پەرستانی عەرەب بوو. (و)

کۆمەکی شیوعییەکان لەشکری دووەمیان تێکشکان وشەوافیان کوشت.

لەپاشاندا دەستیان کرد بە کوشتاری کەسانی غەیرە کوردی وەك تورکمان و عەرەب، عەشیرەتی شەمەریش بە خێرایی بەرەو سنووری سوریاکشانەوە.

هاوکاری و پەیوەندی مەلا مستەفا بە شیوعییەکانەوەو، هەڵسوکەوتی توندڕەوانەی عەبدولکەریم قاسم لە دژی سەرانی بێ ئەژماری عەشیرەتەکان بووە مایەی ئەوەی کە لە کۆتایی بە هاری 1959دا، 12هەزار کەس پەنابۆ ئێران و 4هەزار کەسیش پەنا بۆ تورکیا بەرن.

بەشێك لەو کەسایەتی و عەشیرەتانە بریتی بوون لە:

1/داود جاف، برازای عوسمان پاشای مێردی (عادلە خانم) حوکمداری بە ناوبانگی هەڵەبجە. لەگەڵ چەند هەزار کەسدا هاتە ئێرانەوەو، تا ئێستا لە کرماشاندا نیشتەجێیە.

2/عەلی بەگ و عەشیرەتی شەرەفبەیانی، کە لە قەسری شیرین دا داڵدەیان درا.

3/عەشیرەتی تاڵەبانی کەرکوك، بەسەرپەرشتی شێخ نەجمەدین هاتنە کرماشانەوە.

4/بنەماڵەی شێخ مەحمود، بەسەرپەرشتی شێخ حسێن هاتنە مەریوانەوە.

5/براکانی محەمەد ڕەشید قادر خان، عێزەتو عەلی لە شلێرەوە هاتنە بانەوە، بەڵام محەمەد رەشید بە خۆی لە عێراقدا مایەوە.

6/عەشیرەتی سووایە لە چوارتاوە بە سەرپەرشتی عەبدولڕەحمان ئاغا هاتنە بانەوە.

7/عەشیرەتی پشدەری بەسەرپەرشتی بابەکر ئاغا و حاجی کوڕی عەباس ئاغا هاتنە سەردەشتەوە.

8/خێڵی شێخ (خەلان) بەسەرپەرشتی شێخ عەلائەدین هاتنە بانەوە.

9/عەشیرەتی مەنگوڕی عێراق بەسەرپەرشتی عەلی حەسەن ئاغا.

10/شێخ عوسمانی نەقشبەندی بیارە، کە خاوەن دەسەڵاتێکی روحی گەورەیە لە نێو خەڵکێکدا کە نزیك بە دووسەد هەزار کەس دەبن، شێخ عوسمان لە ناوچەی هەوراماندا نیشتەجێ بوو.

11/شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی و بنەماڵەکەی هاتنە ئێرانەوە، بەڵام شێخ محەمەدی کوڕی لەگەڵ لایەنگرانی خۆیدا پەیوەندی بە مەلا مستەفاوەکرد.

12/شێخ محەمەد بەهائەدین نەقشبەندی لە هەڵەبجەوە هاتە ئێرانەوە و لە سنە دا نیشتەجێ بوو.

13/عەشیرەتی دیازی هاتە مەهابادەوە.

14/عەشیرەتی هەرکی بەسەرپەرشتی فەتاح بەگ.

15/عەشیرەتی برادۆست بە سەرپەرشتی مەحمود خەلیفە.

16/عەشیرەتی شێخ محەمەد ئەمین خان و خێزانەکەی.

17/عەشیرەتی لۆلان بەسەرپەرشتی شێخ ڕەشید.

18/عەشیرەتی زێباری بەسەرپەرشتی شێخ محەمەد لەگەڵ چوار هەزار کەسدا پەنایان بۆ تورکیا برد.

هەروەها ریکانییەکان و بەرواریيەکان لە ناوچەی شەمزیناندا نیشتەجێ بوون و دەوڵەتی تورکیا ئەوانی گواستەوە بۆ ناوچەکانی ناوخۆی تورکیا.

ئەم کەسانە بە کۆمەڵ بۆ عەبدولکەریم قاسم و مەلا مستەفایان سەلماند، کە هێشتا کوردەکان ئامادەگی قبوڵکردنی سۆشیالیزمیان نییە. لەبەر ئەوە ڕەوشێکی میانەڕەوتر لە پێشگیرا. گاردی بەرگری میللی هەڵوەشایەوەو بەرنامەکانی چاکسازی زەوی و زار بەبێ جێبەجێکردن دەستی لێهەڵگیرا. لە پاش چەند مانگ ،زۆربەی ئەو عەشیرەتانەی ئێران داڵدەی دابوون گەڕانەوە بۆ عێراق، ژمارەیەکی کەم نەبێ تا ئێستاش نیشتەجێی ئێرانن، ئەم کارە بە ناوبژیوانی شێخ ئەحمەدی بارزانی ئەنجام درا کە ڕەوشێکی بێلایەنانەی لە پێش گرتبوو، ناوبراو لەم کاتەدا پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ

عەبدولکەریم قاسم دا هەبوو ، بەسەری گەورەی عەشیرەتی بارزانییەکان دادەنرا و گەلەك بەقەدریش بوو لای مەلا مستەفای برا بچوکی. لەم کاتەدا هەرچەند مەلا مستەفا پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا هەبوو، بەڵام بە ئاگابوو لەوەی کە سیاسەتمەدارانی عێراقی ئامادەنین ئۆتۆنۆمی کوردەکانیان پێقبوڵ بێت، ژمارەیەك لە کرێکارانی بەغدادیش ڕەفتارێکی توندڕەوانەو دوژمنکارانە تریان سەبارەت بە ناسیۆنالیستەکانی کورد لە پێش گرتبوو. لەبەر ئەوە مەلا مستەفا سەد چەکداری بارزانی هێنایە بەغدا و لە بارەگای پارتی دیموکراتدا داینان تا بەرگری لە خودی ئەو و لە پارتیش بکەن.

لە دیسەمبەری 1961دا، مەلا مستەفاو سەرکردایەتی پارتی دیموکرات داوانامەیەکیان پێشکەش بە دەوڵەتی عێراق کرد و داخوازی ئۆتۆنۆمییان لە ناوخۆی عێراقدا کرد، بەم شێوەی خوارەوە:

1/زمانی کوردی لە ناوچە کوردنشینەکاندا، بە زمانی ڕەسمی بناسرێ.

2/هێزەکانی پۆلیس و سوپا لە ناوچە کوردنشینەکاندا بە گشتی لە کورد پێکبێن و، خوێندنی نیزامیش بەزمانی کوردی بێ.

3/حکومەتی ناوخۆیی کوردستان مافی بەڕێوەبردنی کاروباری کولتوری ، تەندروستی و، کاروباری نێو خۆی شارەکان و گوندەکانی هەبێت.

4/بەشێکی شیاو لە دەرامەتی نەوتی موسڵ وکەرکوك بۆ ناوچە کوردنشینەکان خەرج بکرێ.

5/کاروباری بەرگری و سیاسەتی دارایی حکومەتی ئۆتۆنۆمی لە ئەستۆی دەوڵەتی مەرکەزیدابێ. بەڵام جێگری سەرۆك وەزیر و یاریدەدەری ئەرکانی سوپا و یاریدەدەرانی وەزارەتخانەکان هەموویان کوردبن.

6/بەکارهێنانی کەسانی کورد لە سوپای عێراقدا لە دەرەوەی سنووری ناوچە کوردنشینەکاندا، بەڕەزامەندی حکومەتی ئۆتۆنۆمی کوردستان بێ،

جگە لە کاتی گرژی و ئاڵۆزی وەك مەترسی و هەڕەشەی دەرەکیدا.

ئەم داخوازیانە لە ئەنجومەنی شۆڕشی عێراقدا تاوتوێکرا و سەرەنجام ڕەتکرایەوە. لە بەر ئەوەی پێدەچوو یەکپارچەیی خاك و سەربەخۆیی سیاسی عێراق بخاتە مەترسییەوە. بە تایبەتی کە دەکرا شیعەکانی باشوری عێراقیش هەمان داخوازی بخەنە ڕوو.

پارتی دیموکراتی کوردستان سەر لەنوێ وەك ئاگادارکردنەوە، داوا نامەیەکی دیکەیان دا بە دەوڵەتی عێراق. بەلاّم لە ئاکامی دنەدانی کاربەدەستانی حکومەتدا، ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارانی عەرەب لە بەردەم بارەگای پارتی لە بەغدا دا کۆبوونەوەو دەستیان کرد بە خۆپیشاندان و دەیانویست بە زۆر بچنە نێو بارەگاکەوە و تالاّنی بکەن. بە ناچار پاسەوانی چەکداری بارزانی تەقەیان لێکردن و ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن.

هەلو مەرج ڕوو لە تەقینەوە و قەیران بوو ، مەلامستەفاو ژمارەیەك لە هاوڕێیانی و ئەندامانی پارتی لە ڕێگای کەرکوك وموسڵەوە گەڕانەوە بارزان. لوقمانی کوڕی بە فەرمانی عەبدولکەریم قاسم دەست بەسەر کرا. شێخ ئەحمەدیش لە بەغدا دا مایەوەو هەوڵیدا لەم نێوەدا نەخشی ناوبژیوانی ببینێ، تەنانەت بۆ ئەم مەبەستەش چەند جارێك چووە بارزان.

مەلا مستەفا بەکۆمەکی عەشیرەتی بارزانی وگشت عەشیرەتە هاوپەیمانەکانی، نزیك بە حەوت هەزار چەکداری کۆکردەوە ودەستیکرد بە داگیرکردنی ناوچە ستراتیژییەکان، پردەکان، شەقامەکان، چیا بەرزەکانو، بنکەکانی سەرسنووروسەر بازخانە بچووکەکانی لە چەك داماڵیو، وەك ساڵی 1945 مۆڵەتیان بەسەربازەکان دا بگەڕێنەوە سەرماڵ و حاڵی خۆیان.

هەر لەبەر ئەو هۆیانەی کە لە بارەی ڕاپەڕینی شەوافەوە باسکرا، لەم بارەشەوە عەبدولکەریم قاسم هەوڵیدا زیاتر سوود لە چەکدارانی جاش وەربگرێ لەشەڕی دژ بە یاخیبووانی کورددا و، هێزەکانی سوپا پتر لە

دەوروبەرو نزیکی خۆیدا بهێڵێتەوە.

عەشیرەتی لـوّلان بـە سـەرۆکایەتی شێخ ڕەشـید، دوژمنـی دێرینـی مـەلا مستەفا، عەشیرەتی هەرکی بە سەرۆکایەتی فەتاح بەگو، عەشیرەتی برادۆست بە سەرۆکایەتی مەحمود خەلیفە و ژمارەیەکی دیکە بە مەبەستی جەنگ لەگەڵ بارزانییـەکاندا چـەکدارو ئامـادەکرانو ، شـەڕی خێڵـەکی وەك سـاڵی 1945 دەستپێکردەوە . بەڵام هەرچۆنێك بێ، لەم کاتەدا هەلومەرج زۆر جیاواز وڕوو لە گـۆڕان بـوو، چیـتر عـێراق لـە ژێـر ئینتیدابـی بـەریتانیادا نـەبوو، هەسـتی نیشتمانی و نەتـەوەیی کوردەکـانیش گەلـەك گەشـەی کردبـوو. زۆر لـە لاوانـی عەشیرەتی سەربە دەوڵەتیش چوونـە پاڵ یاخیبووانـەوە، هـەروەها ژمارەیـەکی زۆر لـە کوردەکـانی نێـو سوپاش . رادیـۆی قاهـیرە، کـە بـۆ ماوەیـەك دژایـەتی عـێراقی دەکـرد، بەشـێوەیەکی فـراوان لایـەنگری لـە کوردەکـان دەکـرد، وایدەردەبڕی کە چیتر ئەم شەڕە، شەڕی خێڵەکی نی‌یە، بەڵکو خەباتی گەلێکە لە پێناو بە دەستهێنانی سەربەخۆیدا.

بەفەرمانی قاسم بۆردومـانی تونـدی گونـدو ڕەشماڵـەکان، تەنانـەت شـارە بچوکـە کـورد نشـینەکانیش دەسـتپێکرد. ژن و منـاڵ، مـەڕو مـاڵات، کێڵگـە وجەنگەڵ و بێشەچڕەکان،کەسانی چەکدارو بێ چەك کەوتنە بەر بۆردومـانی توندو نیشانەی فڕۆکەوە. بەڵام کوردەکان کۆڵیان نەدا، دارایی وخاوو خێزانی خۆیـان لـە پەناگەو ئەشـکەوتە قووڵـەکاندا حەشـارئەدا، هـەر بـەو جـۆرەی کـە چەندین جار سەلمێندراوە،فڕۆکـە لـە جـەنگی نێـو چیاکـاندا بـە هـۆی تاشـە بەردی گـەورە و سـەختی کوێسـتانەوە، ئـامڕازێکی بـە سـوود نی‌یـە، چونکـە ناتوانن بەڕادەیـەکی تـەواو خۆیـان نزیـك بکەنـەوە و ئامانجـەکانیان بپێکـن . وێڕای ئەم دژواریانەش ، بۆردومان زیانێکی قورسی بەخەڵکی کوردی باکوری عێراق گەیاند ، لەئاکامی ئەم ڕووداوانەدا مەڕو ماڵاتێکی زۆر تیا چوو ، کێڵگە وجەنگەڵ و لەوەڕگاکانیش بوونە خۆراکی ئاگری بۆمبابارانی سوپای عێراق.

یاخیبووانی كورد، بێ داوودەرمان وئامرازی تەندروستی بوون و لەسەرتاسەری ئەو بەرانەدا تەنها چەند دكتۆرێكیان هەبوو. شیرازەی ژیانی سروشتی ئەوان لەبەریەك هەڵوەشابۆوە ، زۆزان و كوێستانە دوور دەستەكان بووە پەناگەیان، بەمجۆرە توانییان درێژە بە شەڕ بدەن و بەرگری لە خۆیان بكەن.

پارتی دیموكرات هەوڵیدا بە یەكجارەكی پەیوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا نەپچڕێ، بۆ ئەم مەبەستەش حیزبە چەپەكان درێژەیان بە ناوبژیوانی خۆیان دا، سكرتێری گشتی پارتی دیموكرات (ئیبراهیم ئەحمەد) كە كەسایەتییەكی یاساناس و پارێزەری دادگایە، خۆی بە كەسێكی لیبرال دیموكرات دەناسێنێ وسیمای ڕاستەقینەی خۆی دەرناخات، ئەو كەسانەی كە هەلیان بۆ ڕەخساوە لەگەڵ ناوبراودا كۆببنەوە دەڵین كۆمۆنیستێكە وەك (فیدل كاسترۆ)، چونكە بۆ قبوڵكردنی كۆمۆنیزم لە قاسم و جەمال عەبدولناصر وتەنانەت لە خودی مەلا مستەفاش شێلگیرترە، بەڵام وەك كاسترۆ بیروباوەڕی خۆی دەشارێتەوە، تا نەبێتە مایەی نارەزایی ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی كە لە شۆڕشدا بەشدارن، وێڕای ئەوەش دەرهەق بەجەنگی دژ بەقاسم لەگەڵ هەموو شیوعییەكاندا دیدوبۆچوونی جیاوازە. شیوعییەكان بەرگری و پشتیوانییان لەقاسم دەكرد لە بەرامبەر عەبدولناسردا، هەرچەند ناسر بە خۆی پەیوەندییەكی نزیكی لەگەڵ سۆڤیەتدا هەبوو، بەڵام یەكێتی سۆڤیەت نەیدەویست میسر و سوریا پێكڤە كۆماری یەكگرتوو پێكبێنن. لەبری ئەوە دەیویست سوریا ڕاستەوخۆ ببێتە وڵاتێكی سەربە بەرەی كۆمۆنیستی وحكومەتیش بكەوێتە دەست شیوعییەكانی وەك (خالد بەگداش) و(ژەنراڵ بلندری)یەوە، مەسەلەی چوونە ڕیزی عێراقیش لەگەڵ كۆماری یەكگرتووی عەرەبیدا، بەهەمان شێوە بە دوور لە نیاز و خواستی سۆڤیەت بوو. لە تێڕوانینی سۆڤیەتەوە وڵاتانی پەرت وبڵاوكە لە بەردەم مەترسی و

هەڕەشەی ئیمپریالیزم و فیودالەكانی ناوخۆ دا بن زۆر زووتر و ئاسانتر ڕوولە كۆمۆنیزم دەكەن، تا كۆمارێكی یەكگرتووی بە هێز.

ئیبراهیم ئەحمەد چاك دەیزانی ئەگەر بە پێی داخوازی كۆمۆنیستی جیهانی ڕەفتار بكات لە پشتیوانی زۆربەی ناسیۆنالیستەكان مەحروم دەبێت . لەم نێوەدا مەلا مستەفا وەك تاكە قارەمانی خەباتی نەتەوەیی كورد دەمێنێتەوە، پارتی دیموكراتیش سیمای نەتەوەیی خۆی لە دەست ئەدا و دەبێتە لقێك لە حیزبی شیوعی عێراق، مەلا مستەفاش ئەوكات دەتوانیٚ پارتێكی ناسیۆنالیستی نویٚ دابمەزرێنیٚ و زۆربەی خەڵكی عەشیرەتەكان و گوندنشینان و تەنانەت كوردانی شاریشی بەگەڵ دەكەویٚ ، جگە لە ژمارەیەكی دیاریكراوی كرێكاری كورد كە لە پیشەسازی نەوتی كەركوكدا كاریان دەكرد.

لەدیسەمبەری 1961دا، بە هۆی ئەو كوێرەوەری و زیانە قورسەی كە لە ئاكامی بۆردومانی دڕندانەی ناوچە كورد نشینەكاندا پەیدا ببوو، ئاشكرا بوو كە چیتر پارتی دیموكرات ناتوانێت وتووێژی بیٚ سەمەر لەگەڵ حكومەتی عێراق و پارتە چەپڕەوەكاندا درێژە پێبدات، بەمجۆرە ئیبراهیم ئەحمەد و هەموو سەرانی دیكەی پارتی بە شێوەیەكی نهێنی بەغدایان بەجێهێشت و چوونە پاڵ یاخیبووەكانی كوردستانەوە. ئەم هەڵاتنە توانای ئەوەی بە یاخیبووەكان بەخشی كە ڕەوشێكی ئیداری تۆكمە بە چالاكییەكانی خۆیان بدەن. لە سەرتاسەری ئەو ناوچانە دا فەرماندەیی و لقی پێشمەرگەی پارتی دامەزرا و دەستكرا بە چالاكی ڕاگەیاندن و پەروەردەیی حیزبی لە پێناو پێشخستن و بەرزكردنەوەی ئاستی توانای سیاسیو جەنگیدا. لەهەمان كاتدا بە مەبەستی دوورخستنەوەی بەدگومانی سەرۆك عەشیرەتەكان خۆیان لەهەر شێوە پڕوپاگەندەیەكی سۆسیالیستی وریفۆرمە كشتوكاڵییەكان لائەدا، ئەم جۆرە كێشانەیان سپارد بە قۆناغی كۆتایی شەڕو سەركەوتنی یەكجارەكی، كە

لە ڕیفراندۆمی گشتی گەلی کوردا یەکلایی بکرێتەوە.

پارتی دیموکراتی کوردستان لەلایەن پێنج کەسەوە بەڕێوە دەبرا کە هەرکام لەوان لێپرسراویی ناوەندێکیان لەئەستۆدا بوو، هەر یەکەو وەك وەزارەتێك لەبەرامبەر چالاکییەکانی خۆیدا بەرپرسیاربوو، ئیبراهیم ئەحمەدیش سکرتێری گشتی پارتیو چاودێری ڕێکخستنی ناوخۆی پارتییەو لە پاش مەلا مستەفا بەکەسی دووەمی پارتی دادەنرێ. دەکرێ بڵێین مەلا مستەفا چالاکترین فەرماندەی لەشکری شۆڕشی کوردە، بەڵام لە کاروباری ڕێکخستندا، توانای ئیبراهیم ئەحمەدی نییە . ئەرك‌و دەسەڵاتی ئیبراهیم ئەحمەد وەك ئەرك و دەسەڵاتی فراوانی سەرۆك وەزیری وایە. پارتی دیموکراتی کوردستان خۆی بە پارتێکی (مارکسیست-لینینیست) دەزانێ، بەڵام بە ئاشکرا ئەم دروشمە بەکارناهێنێت، هەرچەندە حیزبی شیوعی عێراق لە ڕۆژگاری قاسمدا وەك پارتێکی بۆرژوازی ڕەخنەی لە پارتی دەگرت، بەڵام لە پاش ڕوخانی قاسم وهاتنە سەرکاری بەعسیەکانەوە لە هەشتی شوبات دا پەیوەندی ئەوان بە پارتییەوە ڕووی لە گەرمی و پتەویی نا . مەلا مستەفا بارزانی بە هۆی کارنامەی ڕابردووی خزمەتی خۆیەوە بە شۆڕشی کوردان بۆتە ڕابەری ئێستای ئەم خەباتە. تێکۆشانی ناوبراو لە دژی حکومەتی پاشایەتی عێراق و بەریتانیا لە ساڵی 1945دا، بەشداری چالاکانەی لە ڕووداوەکانی کۆماری مەهاباد و لە ڕاپەڕینی دژ بە ئێران و یازدە ساڵ ئاوارەبوونی لە یەکێتی سۆڤیەتدا ئەوی کردووە بە قارەمانی نیشتمانیو نەتەوەیی کورد.

ڕوناکبیرانی کورد، بارزانی (وێڕای یانزە ساڵ نیشتەجێبوونی لە یەکێتی سۆڤیەتدا) بە پیاوێکی دیکتاتۆرو تەنانەت کۆنەپەرستیش ناو دەبەن. وەك ئەندامانی حیزبی هیوا لە ساڵەکانی 1944-1945دا، ناوبراو بەوە تاوانبار دەکەن کەلە حاڵەتی وەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمیدا، توانای ڕێکخستنی کاروباری

پارتی و ئامادەکردنی بەرنامە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانی نابێ، لە لایەکی دیکەوە سەرۆك عەشیرەتەکانیش بارزانی بە توندڕەوتر لە وە دەزانن کە وەك فەرماندەی خۆیان پەسەندی بکەن. بەڵام هەرچۆنێك بێ لە بەرئەوەی ئەمێستا هیچ کەسێك بەکردەوە ڕابردوو وئەزمون و چاوقایمی ئەوی نییە، هەمووان دان بەڕابەری ئەودا دەنێن. سەرباری ئەوەی کە ئەندامانی پارتیش دیدو بۆ چوونی باشیان سەبارەت بەناوبراو نییە، بەڵام هەنوکە پێکەوە لە دژی دوژمنی هاوبەشیان، واتە دەوڵەتی عێراق خەبات دەکەن.

لە ماوەی شەڕی دژ بە قاسمدا، مەلا مستەفا دووجۆر هێزی چەکداری دامەزراند، هێزی پشتیوانی ناڕێکخراوی عەشیرەتی کە بەشێوەیەکی لە ناکاو لە شوێنێکدا کۆدەبونەوە و بنکە و هێزی دەوڵەتییان دەخستە بەر شاڵاو و پەلاماردانەوە، لە پاش شەڕ دەگەڕانەوە بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆیان کە بریتی بوو لە شوانکارەیی وکشتوکاڵ. لەم کاتەدا چەکەکانی خۆیان لە حەشارگەیەکی بێترسدا قایم دەکرد. ئەمە هەمان ئەورەوشە بوو کە بارزانییەکان و هەموو عەشیرەتەکانی دیکە لە شەڕەکانی سەرەتای سەدەی بیستدا لە دژی تورکەکان سوودیان لێوەردەگرت. لەبەر ئەوەی لەم ناوچەیەدا هەمیشە ئەو هێزە خێڵەکییە لە دەسترەسدا نەبوو کە لە شوێن و کاتی لەناکاودا سوودی لێوەربگیرێ و، بۆ ئەوەی جارێکی تر چارەنووسی کۆماری مەهاباد دووبارە نەبێتەوە. پارتی داوای لە مەلا مستەفا کرد کە هێزێکی ڕێکخراوی تۆکمە دابمەزرێنێت.

هەرچەند هێڵی پێشەوەی بەرە هیچ کات بە شێوەی نەگۆڕ لەیەك شوێندا نەدەچەسپا ، چونکە پێشمەرگەی کورد، هێزو توانای ئەوەیان نەبوو، هێزێکی گەورە لە یەك شوێنی دیاری کراودا جێگیر بکەن تا وەك قەڵا وبەربەست سوودی لێوەربگیرێ. چیا بەرزەکان و کوێستانە دوور دەستەکانی باکور پەناگەی بێخەم بوون بۆ کشانەوە و خۆ ئامادە کردن بۆ زەبروەشاندنی دواتر.

هێزی هەمیشەیی کورد بە (لەشکری شۆڕشی کورد) وسەربازەکانیشی بە (پێشمەرگە) ناودەبران. پۆشاکی بەریان بریتی‌یە لە رانك و چۆغەی ئاسایی کوردی بە ڕەنگی خاکی وجامانەو بچوکترین یەکەی چەکداریشیان مەفرەزە، پەل‌و، سەرپەلە (واتە یەك گوردانە)، کە 150 تا 200 چەکدار لە خۆ دەگرێ. چەکەکانیشیان لە برنەو، پێنج تیری کۆنی عوسمانی، تفەنگی ئینگلیزی، روسی، ڕەشاشی سوك وقورس، بڕێك هاوەن وقازیفەو چەند تۆپی چیایی و نارنجۆك پێکدێ. زۆربەی ئەم چەکانە لە شەڕدا دەستی بەسەردا گیراوە.

مەلا مستەفا لە ڕێگای ئەم هێزەوە کە ژمارەی لە سنووری دە یا دوانزە هەزار چەکداردایە، توانی چەندین شکستی سەخت لەسەردەمی قاسمدا بەسەر سوپای عێراقدا بێنێت.

ئەو کوردانەی سەربەدەوڵەتی عێراقن ولەدژی مەلا مستەفا دەجەنگن تاڕادەیەك هەمان ئەو کەسانەن کە لە ڕۆژی هەوەڵەوە لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانیدا لە ڕکەبەری و دوژمنایەتیدا بوون.

هەرچەند ژمارەیەك لە وان بەهۆی هەستی نەتەوەییەوە ، یا لە ترسی ئەوەی کە گوندەکانیان لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە دەستدرێژی بکرێتە سەر ، ئامادەی هاوکاری کردن بوون لەگەڵ شۆڕشدا . ئەو عەشیرەتانەی کەلەشەڕەکانی ساڵی 1961دا هاوکاری دەوڵەتی عێراقیان کرد بریتی بوون لە : عەشیرەتی لۆلان بەسەرۆکایەتی شێخ ڕەشید، عەشیرەتی هەرکی بە سەرۆکایەتی فەتاح بەگ، عەشیرەتی برادۆست بە سەرۆکایەتی مەحمود خەلیفە، زێباری، ڕێکانی و، بەرادی بوون.

لە پاش شکستی سوپای عێراق لە ساڵی 1962دا، ئەم عەشیرەتانەش تێکشکان و ڕوەو ئێران وتورکیا هەڵاتن، بەڵام لە پاش ماوەیەك لە ئاکامی ناوبژیوانی (شێخ ئەحمەد)دا ، قاسم و مەلا مستەفا ڕێگەیان پێدان بگەڕێنەوە بۆ عێراق و لە دەووروبەری هەولێر دا نیشتەجێ بکرێن. قاسم بەڵێنی دا لە

شەڕی دژ بە کورد سوودیان لێوەرنەگرێ و مەلا مستەفاش بەڵێنی دا ئەوان بە هاتنە نێو ڕیزی لەشکری کوردەوە ناچارنەکات، لە هەمان کاتیشدا مافی ئەوەیان نەبێت کە دوو بارە بگەڕێنەوە بۆ شوێنە ئەسڵییەکانی خۆیان.

قاسم کە هاوکات، هەم لەلایەن شیوعییەکانەوە و هەم لە لایەن ناسرییەکانەوە کەوتبووە ژێر فشارەوە، وای بە باشزانی کە بۆ پاراستنی نفوز ولایەنگری خۆی سوود لە سیاسەتی دژ بە ئیمپریالیستی وەربگرێ، بۆ ئەم مەبەستەش مەسەلەی (کوێت)ی وروژاند کە لەسەردەمی (مەلیك غازی)یەوە لە عێراق جیاببۆوە. ئەم کێشەیە پێویستی بە جێگیرکردنی هێزێکی زۆر هەبوو لەبەسرە دا. کە ئەم کارەش ڕێی لە جێگیر کردنی هێزێکی گەورەی سوپا لە ناوچە کوردنشینەکاندا دەگرت. کاتێك لەم هەلومەرجەدا، ستونێك لە سوپای عێراق توانی لە کوێستانەکانی کوردستاندا پێشڕەوی بکات، رادیۆو ڕۆژنامەکانی بەغدا هەراو زەنایەکی گەورەیان بەرپاکردو هەواڵی تێکشکانی شۆڕشی کورد و داگیر کردنی ناوچەی بارزانیان بڵاوکردەوە.

بەڵام هێزی پێشمەرگە ڕاستەوخۆ چیاکانی دەوروبەری ئەو ناوچانەیان داگیر کردو گەمارۆی هێزی دەوڵەتیان دا، تەنانەت ڕێگای کشانەوەشیان لێگرتن. بەمجۆرە ئەو لەشکرە کەوتە گەمارۆوە وتەنانەت بۆ ماوەیەك لە ڕێگای فڕۆکەوە ئازوقەو پێویستیەکانی دیکەی خۆیان وەردەگرت. سەرەنجام لە پاش زیان لێکەوتنێکی قورس توانییان بەرەو پێگەی یەکەمجاری خۆیان بکشێنەوە.

ئەم شەڕە پەرت و بڵاوانە تاڕوخانی ڕژێمی قاسم لە شوباتی 1963دا درێژەی کێشا، کە حکومەتی نوێی عەبدولسەلام عارف هاتە سەرکار، هەلومەرج ڕوو لە گۆڕان بوو، پێشبینی ئەوە دەکرا بە هۆی پەیوەندی دۆستانەی حکومەتی نوێوە لەگەڵ ڕژێمی میسردا، دەوڵەتی نوێی عێراق ئامادە بێ بۆ وتووێژکردن لەمەڕ بەخشینی ئۆتۆنۆمییەوە بە کوردەکان.

بە ناوبژیوانی شێخ ئەحمەد، پەیوەندی لە نێوان ژەنراڵ بارزانی و حکومەتی عێراقدا بەدیهات، وەفدێکی نوێنەرایەتی کورد بە سەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی بەمەبەستی وتووێژکردن چووە بەغدا. ئەم وتووێژانە دەپێشدا بە باشی بەرێوە دەچوو، بەڵام هاوکات لەگەڵ ڕوودانی کودەتای بەعس لەسوریاداو، هاتنە کایەی ئەگەری دامەزراندنی کۆماری یەککگرتووی عەرەبدا. دەوڵەت وردە وردە بە بەهانە هێنانەوەی جیاواز، نەچووە ژێر باری بەڵێنەکانی و ئۆتۆنۆمی بەسەرەتایەك بۆ جیابوونەوە ناوبرد.

بەمجۆرە وتووێژ ڕووی لە تەنگەژە و ناکامی کرد وچارەسەرکردنی ئەو کێشەیەیان بەدامەزراندنیکۆماری یەککگرتووی عەرەبی سپارد.

ئەو کات دەوڵەتی عێراق ڕایگەیاند کە دەبێ شیوعییەکان، کە لایەنگری قاسمو نەیاری کۆماری یەککگرتووی عەرەب بوون، لەڕەگوڕیشەوە هەڵبکێشرێن. شۆڕشی کوردی ئاگادار کردەوە داڵدەی شیوعییەکان نەدەن لە نێو خۆیاندا. لەپاش ئەوە دەوڵەتی عێراق ئەوگوندو بارەگایانەی بۆردومان کرد کە بە پەناگەی شیوعییەکان ناودەبران، کوردەکان لەم بارەوە ڕەوشێکی بێلایەنانەیان لە پێش گرت، کەچەند هەفتەیەك لەوەوپێش، لە دژی دوژمنی هاوبەشی خۆیان، هاوکاری یەکدییان دەکرد.

کاتێك وتووێژ بە بن بەست گەشت و وەڵامێك بە خواستەکانی کورد نەدرایەوە، فەرمان بە جەلال تاڵەبانی درا بچێتە قاهیرە و مەسەلەکە لەگەڵ عەبدولناسر دا تاوتوێ بکات، کە هەمیشە بە سەرزارەکی سەبارەت بەم مەسەلەیە هاوسۆزی پیشان دابوو. رادیۆی قاهیرەش هەمیشە عەبدولکەریم قاسمی بە هۆی دژایەتی کردنی خواستەکانی کوردەوە سەرزەنشت دەکرد.

لە قاهیرەدا، عەبدولناسر بە خۆی هاوسۆزی بەرامبەر بە مەسەلەی کوردپیشان دا، بەڵام خۆی پابەست بە چارەسەری ئەم کێشەیە نەزانی، تەنها ئەوەی بە بیری جەلال تاڵەبانی هێنایەوە کە هەر جۆرە بیروباوەڕێکی جودا

خوازی لەسەر دەرکەن و لە هەمان کاتدا بەڵێنی دا کە لەم بارەوە داواکاری پێویست بدات بە عەبدولسەلام عارف. بەمجۆرە بەکردەوە وەڵامێکی شیاو بە داخوازی جەلال تاڵەبانی نەدرایەوە، عەبدولناسر داوای لێکردن تا دامەزراندنی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی، وەرگرتنی ئۆتۆنۆمی دوابخەن و بەحەوسەڵەبن. دەنگ وئاوازی ڕادیۆی (صوت العرب)یش گۆڕاو ئیدی وەك سەردەمی قاسم، کوردەکانی بۆ شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا هان نەئەدا. تاڵەبانی گەڕایەوە بەغدا و باس و خواسی وتووێژەکانی بۆ مەلا مستەفاو پارتی دیموکرات گوزارشت کرد.

بەڵام کوردەکان وەیان بەرنەدا، هەرچەند تاڕادەیەك نائومێد ببوون، بەڵام گڕوتینی خۆیان لەدەست نەدابوو، لەهەمان کاتیشدا وتووێژ لە نێوان پارتیو دەوڵەتی عێراقدا بەردەوام بوو.

دەوڵەتی عێراق ئامادەبوو ئەو مافانە بۆ کورد بسەلمێنێت کە وەختی خۆی نوری سەعید بەڵێنی پێدابوون، وەك بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردیو، خوێندنی لە قوتابخانە و زانکۆ وخوێندنگا باڵاکانداو، بەکارهێنانی کارمەندانی کورد لە فەرمانگەکانی ناوچە کورد نشینەکاندا وچەند مافێکی دی، بەڵام ئەم وتووێژانە بە شێوەیەکی سەرەکی بە هۆی پێداگرتنی کوردەکانەوە لەسەر هەبوونی هێزی چەکداری سەر بە خۆیان وتەرخانکردنی 50٪ی داهاتی نەوتەوە، ڕوو بەڕووی شکست بۆوە، چونکە لێیان سوور بوو لە کاتێکدا کوردەکان مافی هەبوونی سوپای سەربەخۆ و وەرگرتنی تەنانەت 30٪ی داهاتی نەوتیان هەبێت، لە پاش ماوەیەکی کەم ئامادەگی درێژەدان بە وابەستەگییان لەگەڵ عێراقدا نابێ. لەم کاتەدا کوردەکان هێزی خۆیان بە چەکی نوێ، لە ڕێگەی قاچاخەوە یا لە ڕێگەی کوردەکانی نێو سوپاوە کە لەئەنبارەکانی سوپای عێراقدا دەردەهێنران، بەهێز دەکرد.

لەم نێوەدا وڵاتانی سۆشیالیستیش بەهۆی ڕەفتاری دڕندانەی ڕژێمی

بەعسەوە لەگەڵ شیوعییەکاندا، لایەنگرییان لە کورد دەکرد و رادیۆکانیشیان بە تایبەتی رادیۆی مۆسکۆ وئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەستیان کرد بە هێرش کردنە سەر دەوڵەتی عێراق و، ئەویان بە کوشتنی پێشکەوتنخوازان وکوشتاری خەڵکی مەدەنی وپێشێل کردنی مافی ڕەوای کورد تاوانبار کرد.

کاتێ پەیوەندی عێراق و کۆماری یەکگرتووی عەرەبی دووبارە ڕووی لە گرژی و ئاڵۆزی کردەوە، سیاسەتی ناسریش سەبارەت بە کورد گۆڕاو دووبارە کەوتەوە بەلایەنگری کردن لەوان، بەڵام هەرچەند سۆڤیەتەکان بە شێوەیەکی فراوان بەرگرییان لە سەربەخۆیی کورد دەکرد،میسرییەکان تەنها لە ڕووی بەرژەوەندی سیاسییەوە بایەخیان بەو کێشەیە ئەدا، ناسر لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامە نووسیدا ڕایگەیاند کە سوودی لە هەموو ڕێگا چارەیەکی ئاشتیانە بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد و ڕێگرتن لە شەڕ وەرگرتووە، بەڵام وەك جەلال تاڵەبانی پێیوتووە، داخوازییەکانی میللەتی کورد شتێك نییە کە نەتوانرێ لە ڕێگای ئەقڵ وگفتوگۆوە چارەسەر بکرێ.

بەرخودانی گەلی کوردی عێراق لەپێناو ئازادیدا، کاریگەری لە سەر ڕەوشی سیاسی تورکیاش هەبوو، لەململانێی ناوخۆیی تورکیا دا لە نێوان لایەنگرانی پارتی کۆماری خوازەکانی عیسمەت ئینینۆو پارتی (عەدالەت)ی ژەنرال کورش پالا کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە کۆنە ئەندامانی پارتی دیموکراتی مەندرسن بوون، پشێوی و نائارامی سیاسی ناوخۆیی رژێمی تورکیای لێپەیدا بوو، کە بووە هاندانی ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی ناوچەی باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا تا لە پێناو بەرگری کردن لە مافەکانی کوردا ڕاپەڕن، بەڵام تورکەکان سەرباری سەرجەم ناکۆکیەکانی نێو خۆیان، بەخێرایی لە مەسەلەکە وە ئاگاهاتن و رابەرانی ڕابوونەکەیان دەستگیرو دادگایی و زیندانی کرد. سنوورەکانی عێراق وتورکیاش بە خێرایی خرانە ژێر چاودێرییەکی تۆکمەوە.

هێشتا تورکەکان بیرەوەری شۆڕشی سالانی 1925و 1931 و1937ی

کوردەکانیان فەرامۆش نەکردبوو، نەیاندەویست دووبارە بزاڤێك لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی هاوسنووری یەکێتی سۆڤیەت وئێران وتورکیا دا گێرمەو کێشەیان بۆ بنێتەوە، کە دەوڵەتی سۆڤیەت بەو پەڕی تاسەوە چاوەڕوانی سەرهەڵدانی کارێکی بەوجۆرە بوو.

دیارە هەم پارتی دیموکرات و هەم دەوڵەتی عێراق لە وتووێژەکانی نێوانیاندا چاودێری لایەنی دووربینی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکرد. کوردەکان پێیان لەسەر هێنانەدی گشت داخوازییەکانی خۆیان داگرت و عێراقییەکانیش ئامادەبوون ئەو مافانەیان پێ بدەن کە بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەیان نەخاتە مەترسییەوە. سەرەنجام وتووێژ بەشکست کۆتایی هات، تاڵەبانی و هەموو هاوڕێیانی دیکەی بەغدایان بەجێهێشت، بەمجۆرە پەیوەندی لە نێوانیاندا پچڕا، ئۆلتیماتۆمی دەوڵەت بە مەلا مستەفا ڕەتکرایەوەو، پێدەچوو شەڕێکی نوێ بەرپێوەبێ.

لەمانگی حوزەیراندا، دەوڵەتی عێراق بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە و یاخیبووانی کوردی تاوانبارکرد کە جێبەجێکردنی داخوازییەکانیان نامومکینە، هەروەها ماوەیەکی دیاری کرد تا یاخیبووەکان خۆیان بدەن بەدەست هێزەکانی دەوڵەتەوەو بڕیاری بەخشین ولێبوردن بیانگرێتەوە و دووبارە بگەڕێنەوە بۆ سەر ئیشوکاری خۆیان. لە پاش سێ ڕۆژ دووبارە مۆڵەتی ئەم ماوەیە نوێ کرایەوەو تەنانەت چەندین هەفتە درێژەی کێشا، بەڵام کارمەندانی دەوڵەت وسەربازانی هەڵاتووی سوپا نەگەڕانەوە سەرکاری خۆیان، کوردەکانیش چەکیان دانەنا، پاشان دەوڵەت ڕایگەیاند کە لەشکرکێشی دەکاتە سەر یاخیبووەکان وبێ هیچ بەخشین و لێبوردنێك لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا تەفروتونایان دەکات.

دەوڵەتی نوێی عێراق دەستی لە پڕوپاگەندەکانی ڕابردووی سەبارەت بە داگیر کردنی کوێت هەڵگرت و هێزە جێگیرەکانی لە بەسرەوە بەرەو باکور

گواستەوە، بە شێوەیەکی هاوکات لەشکرکێشی لە دژی کوردەکان لەلایەن سێ لەشکری جێگیری ئامێدی و ئاکرێو رانیەوە دەستپێکرد و یەکە سوپاییەکانی دیکەش لە ناوچەکانی رانیە، کۆیە، قەڵادزێ، چوارتا، سلێمانی و ناوچەی خانەقینەوە هێرشێکی فراوانیان لە دژی کوردەکان دەستپێکرد. ئەم هێرشانە لەژێر سایەی بۆردومانی هێزی هەوایی بۆ سەر ئەو ناوچانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوون بەڕێوە دەچوو. نزیك بەدوو لەسێی سوپای عێراق لەم لەشکرکێشییەدا بەشدار بوون، پێشڕەوی لە نێو چیاو کێوەکاندا بە هێوری بەڕێوە دەچوو، لە پێکڕای ئەو ناوچانەدا، بنکەو ڕەبایە دادەنرا تا لە کاتی گەمارۆداندا توانای کشانەوەیان هەبێ، شەڕو پێشڕەوی کردن زۆر لەوە هێورتر بوو کە دەوڵەتی عێراق بە نیازبوو. هێزەکانی حکومەت شارو گوندە گەورەکانیان داگیر دەکرد، لە کاتێکدا کە چیاکانی دەوروبەریان هەروا لە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە دا دەمایەوە. ژمارەیەك چەکی دژە هەوایی کەوتە دەست کوردەکانەوە و بەمجۆرە فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق نەیانتوانی وەك پێویست خۆیان لە زەوی نزیك بکەنەوە، وێڕای ئەوەش هێزەکانی دەوڵەت بە هۆی فرەیی ژمارەی هێزی سوپاو هێزی هەوایی تەواوەوە توانییان تەنانەت تا سنوری زێبار وبارزان بچنە پێش.

تاکتیکی شەڕی کوردەکان ئەوە بوو کە تا لە تواناداا بێ خۆیان لە مەترسی کەوتنە گەمارۆوە بپارێزن بە هۆی شارەزایی بست بەبستی کوێستان و چیاکانی خۆیانەوە هەمیشە هێزی حکومەتیان دەخستە گەمارۆوە وغافڵگیرییان دەکردن. لە کاتی مەترسیدا گوند وسەنگەرەکانی خۆیان بە جێدەهێشت وئەوانەیان بە موڵکی دوژمن دەزانی، چونکە بە باشی وە ئاگابوون لەوەی کە پێشمەرگە گرنگ وبەنرخە نەك زەوی و پێگەی جوگرافیایی‌و، نابێ هیچ ناوچەیەك بەدەر لە توانای زەوتکردن لەلایەن دەوڵەتەوە بزانرێ، تەنانەت زێبار و بارزانیشیان چۆڵ کرد و بەرەو کوێستان‌و

چیاکانی باکورو باکوری ڕۆژهەڵات کشانەوە.

دەوڵەتی عێراق، لە پاڵ هێزی سوپادا هێزێکی جاشی لە عەشیرەتی کوردی لایەنگر بە خۆی وەك (شەرەفانی، زێبار، برادۆست، لۆلان، بەرانی مەندان)، بەناوی (سوارەی سەلاحەدین)ەوە ڕێکخست، ژمارەی ئەم جاشانە خۆی ئەدا لە چواردە هەزار چەکدار. هەروەها لە عەشایری عەرەبیش هێزێکی بە ناوی سوارەی (خالیدی کوڕی وەلید)(فرسان خالد بن ولید)ەوە چەکدار کرد و ڕەوانەی شەڕی دژ بە کوردەکانی کردن.

لەم کاتەدا حکومەتی عێراق بەردەوام بوو لەسەر ڕاونان و دەستگیرکردنی شیوعییەکان، سەدان کەسی لێزیندانی وگوللە باران کردن، بەتایبەتی ئەوانەی کە بە تۆمەتی بەشداربوون لە کوشتاری موسڵی 1959ی ڕاپەڕینی شەوافدا تاوانبار کرابوون. لەم کاتەدا دەوڵەتی سۆڤیەت بەهۆی بۆردومانی ناوچە مەدەنییەکانی کوردەوە یاداشتێکی ناڕەزایی دا بە دەوڵەتی عێراق، هەروەها هوشیاری دا بەهەردوو دەوڵەتی ئێران و تورکیا کە خۆیان لەهەر جۆرە دەستێوەردانێك لە کاروباری ناوخۆی عێراقدا یا کۆمەك کردن بەو دەوڵەتە لە شەڕی دژ بە کوردا بەدووربگرن. دوو دەوڵەتی تورکیا وئێرانیش بە ڕەسمی ئەم پڕوپاگەندەیەیان بە درۆخستەوە وئاماژەیان بەوەکرد کە ئەوان سنورەکانی خۆیان بە ڕووی هەر جۆرە نفوزو دەستێوەردانێکی دەرەکیدا داخستووە.

لەم کاتەدا کوردەکان هەواڵی سەرکەوتنەکانی خۆیان بەسەر سوپای عێراقدا بڵاودەکردەوە، دەنگۆی ئەوەیان دەکرد کە لە تێکشکانی لەشکر کێشیو لەکوشتن و بەدیل گرتنی سەدان سەربازی سوپا و جاشی دەوڵەتدا سەرکەوتوو بوون.

لە ماوەی دوو هەفتەی شەڕدا، (1340)سەربازی سوپایان کوشت و (720) سەربازیشیان لێبەدیل گرتن، لە کاتێکدا کە (20) تانك، (164) ڕەشاش،

(9)چەكی بازوكاو هەزار پارچە چەك كەوتبووە دەست پێشمەرگەوە. كوردەكان دەیانگوت كە لەم هێرش و لەشكركێشییەدا تەنها (134) كوژراو، (273) برینداریان زیان لێكەوتووە، بەڵام سكاڵای ئەوەیان دەكرد كە لەئاكامی بۆردومانی فڕۆكە دا (167)گوند وێران و (634) ئاوارەی شارەكان (1309) ژن و منالْ گیانیان لە دەستداوە.

لە مانگی مایسدا، كۆماری مەنغۆلیا، داوای لە سكرتێری گشتی ڕێكخراوی نەتەوە یەككگرتووەكان كرد كە كێشەی كورد بخاتە خشتەیكارو دانیشتنی ئایندەی ڕێكخراوی نەتەوە یەككگرتووەكانەوە. بەمجۆرە وڵاتانی سۆشیالیستی دەیانویست خۆیان لەم مەسەلەیەوە بگلێنن.

هەڵوێست و ڕەوشی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا لەم بارەوە ئاڵۆزتر بوو، لەلایەكەوە بیروڕای گشتی لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاواو ئەمریكادا پشتیوانییان لە خەباتی گەلی كورد دەكردو ئەوانیان بە گەلێكی مێرخاس و دلێر ناودەبرد، بەرخودانی كوردیان بە ڕەوا دەزانی كە لە ئاكامی كارەسات وڕووداوەكاندا لە نێوان سێ دەوڵەتدا دابەش كرابوون، هەر بەو جۆرەی كە پۆڵەنداش بۆ ماوەی 123ساڵ لە سایەی هەلومەرجێكی بەو جۆرەدا بوو، لە لایەكی دیكەشەوە دەوڵەتانی ئەمریكاو بەریتانیا بە هۆی پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ ئێران و توركیادا و بەشداربونیان لە كاری سەربازی هاوبەش و پەیمانی سەنتۆدا، هەوڵیاندا كارێك نەكەن كە ببێتە مایەی نارەزایی ئەوان، كاتێك سۆڤیەت ناردنی چەكی بۆ عێراق ڕاگرت، بەریتانیا وەك سەردەمی پێش شۆڕشی 1958 ناردنی چەكی بۆ عێراق دەستپێكردەوە، هەروەها ئەمریكاییەكانیش ئەو كارەیان كرد. بەمجۆرە یەكێتی سۆڤیەت، ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوای بە بەشداری كردن لە كوشتاری گەلی كوردو دامركاندنەوەی خەباتی ئەوان لە پێناوی ئازادیدا، تاوانباركرد.

ماوەی ئەو مۆڵەتەی كە دەوڵەت دیاری كردبوو بۆ تەسلیم بوونەوەی

یاخیبووان تێپەڕی و جەنگاوەرانی کورد ئامادەی خۆبەدەستەوەدان نەبوون، دەزگای ڕاگەیاندنی شۆڕشی کورد بەمەبەستی بەهێزکردنی وورەی خەڵکی، ڕایگەیاند کە نە تەنها کۆمۆنیستەکانی یەکێتی سۆڤیەت، بەڵکو چین و ئیسرائیلو ئەمریکا وتەنانەت کۆماری یەکگرتووی عەرەبیش (میسر) لە شەڕدا یارمەتییان داون، ئەم پڕوپاگەندەیە نەتەنها لە عێراقدا بەڵکو لە نێو کوردەکانی ئێران و تورکیاشدا بەشادییەوە پێشوازی لێکرا.

چەند ڕۆژێك بەر لە دانیشتنەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، وەزارەتی دەرەوەی مەنغۆلیا، سکالانامەکەی خۆی لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگرتەوە، ئەم کارە بووە هۆی نائومێدیو ناڕەزایی توندی کوردەکان، چونکە مەنغۆلیا بە شێوەیەکی لێبڕاوانە پەیڕەوی لە سیاسەتی سۆڤیەت دەکرد، بێگومان ئەم کارەشی بەرەزامەندی ئەو دەوڵەتە بوو. وەك ئاشکرایە، یەکێتی سۆڤیەت ئامادەنەبوو لە پێناو کوردەکاندا وڵاتانی عەرەب لە خۆی بکات.

جەمال عەبدولناسریش ڕایگەیاند کە ئەو لەگەڵ پێدانی هەندێك ماف و ئیمتیازە بە کوردەکان، بەڵام لەهەمان کاتدا لەبەرامبەر هەر جۆرە هەوڵێکی جوداخوازیدا بە توندی بەرهەڵستی دەکات.

کاردانەوە و وەڵامی مەلا مستەفا سەبارەت بەم لێدوان وهەڵوێستانە، نیشانەی سەرکەشی میللی ئەم ڕۆڵە چیانشینە بوو کە ڕایگەیاند (ئێمە ناخوازین مافی خۆمان لە ڕێگای وتووێژ کردنی نێو ژوورە دەرگا داخراوەکانەوە بە دەستبێنین،بەڵکو بە جەنگ وسەرکەوتنی یەك لە دوای یەك ، بە هۆی چەکەکانی خۆمانەوە مافی خۆمان بە دەستدێنین).

پاشان مەلا مستەفا بەمەبەستی کۆتایی هێنان بەم بارودۆخە هێرشی کردە سەر کوردە خائین و جاشەکان وئەوانی لە خاکی عێراقەوە بەرەو تورکیا هەڵبڕی، دەوڵەتی تورکیاش لەوێدا چەکی کردن و بۆ ناوچە ناوخۆییەکانی

گواستنەوە، بەمجۆرە بەشێکی گەورە لە هێزی عێراق لە مەیدانی شەڕ دەرپەڕێندرا.

شەڕ درێژەی کێشا، لە پاش یەکێتی نێوان عێراق و سووریاش پێنج هەزار سەرباز لە سوپای سوریا هاتن بە هانای سوپای عێراقەوە لەژێر یەك فەرماندەیی هاوبەشدا کە لە بەغدادا پێکهاتبوو لە لەشکر کێشی دژ بە کوردەکاندا بەشدارییان کرد.

لە 18 ی نۆڤەمبەری 1963دا حکومەتی بەعس ڕوخا[78] و عەبدولسەلام عارف بووە تاکە فەرمانڕەوای عێراق، لە ڕووی سیاسەتی ناوخۆوە دژایەتی کردنی شیوعییەکان لە عێراقدا بەردەوام بوو، بەڵام سیاسەتێکی هاوکۆکی ڕژێمی میسری لە پێش گرت، سوپای سوریاش بە ناچار عێراقیان بەجێ هێشت.

بە ماوەیەکی کورت بەدوای ئەوەدا، لە سەرداوای (جەمال عەبدولناسر) و (ئەحمەدبن بلا) سەرۆك وەزیری جەزائیر دا، دەوڵەتی عێراق ئامادەیی خۆی بۆ وتووێژکردن وبەڕەسمی ناسینی مافی ڕەوای گەلی کورد ڕاگەیاند.

وتووێژ لە نێوان نوێنەرانی دوو لایەندا (ساڵح یوسفی- نوێنەری کورد)و (ژەنراڵ -عەبدولڕەزاق مەحمود- پارێزگاری سلێمانی) دا دەستپێکرد و ئاگر بەستیشیان ڕاگەیاند. ئەم وتووێژە لە بەرواری 10ی شوباتی 1964دا کۆتایی هات.

عێراقییەکان هێڵی گەمارۆدانی کوردستانیان لابرد، هەروەها دیلەکانی

---

[78] لە پاش کودەتای 8ی شوباتی 1963، (ئەحمەد حەسن بەکر) ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی بەعس، کەیەکێ بوو لە بەشدرانی کودەتاکە بووە سەرۆك وەزیری عێراق، لە 18ی نۆڤەمبەری 1963دا عەبدولسەلام عارف بەعسییەکانی لە دەسەڵات دوور خستەوە لە ساڵی 1965دا ئەحمەد حەسەن بەکرو زۆر لە ئەندامانی حیزبی بەعسی خستە زیندانەوە. (و)

هەردوولاش ئازاد کران، ئەو کەسانەش کە بە تاوانی بەشداری کردن لە شۆڕشدا یا کۆمەك کردن بە کوردەکاندا گیرابوون ئازادکران. هەروەها دەوڵەتی عێراق ڕایگەیاند هێزی چەکداریی جاشەکانیش هەڵدەوەشێنێتەوە، لە لایەکی دیکەوە کوردەکانیش مۆڵەتی ئازادی هاتوچۆکردنی سەربازانی سوپای عێراقو گەیاندنی ئازوقەیان پێدان. هەر لەم کاتەدا دەوڵەتی عێراق ئامادەیی خۆی بۆ ئەوە ڕاگەیاند کە مافی (لامەرکەزی ئیداری) بە کوردەکان ئەدات.

هەواڵی ئاگر بەست بە شادییەوە لە ناوچە عەرەب نشینەکانی عێراقدا، بە تایبەتی لە لایەن خەڵکی موسڵ وبەغداوە، پێشوازی لێکرا. هەرچەند کوردەکانیش بەرامبەر بە ڕاگرتنی بۆردومان و وەستانی شەڕو پشێوی ئاسوودە بوون. بەڵام گەلەك بە ورياييەوە چاوەڕوانی ڕووداوەکانی ئایندەیان دەکرد ، چونکە تا ئەو کات هیچ مافێك لە بارەی ئۆتۆنۆمی کوردەکانەوە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە نەسەلمێندرا بوو، هەرچەند دەوڵەت بەڵێنی جێبەجێکردنی چەندین بەرنامەی فراوانی ئابوری لەسەرتاسەری عێراقدا دابوو، کە بەشێکی زۆری ئەو بەرنامانە بۆ ناوچە کوردنشینەکان تەرخان کرابوون ، وەك نوێکردنەوەی دامودەزگاو بینای شارەکان و ئەو گوندانەی کە لە ئاکامی بۆردوماندا وێران کرابوون، نویێ سازی شەقامەکانو قوتابخانەکان و نەخۆشخانەکانو، چەند پرۆژەیەکی دی، هێندەی نەخایاند لابردنی دادگاسەربازیەکانیش ڕاگەیەندرا.

وەك پێشتر لێیدواین ، سەرکردایەتی پارتی دیموکرات هیچ کات پەیوەندییەکی ڕێك وپتەویان لەگەڵ مەلا مستەفادا نەبوو، بەڵام هەرچۆنێك بێ، ناچار بوون کە بۆ حاڵی حازر بارزانی وەك تاکە ڕابەری شەڕی کوردایەتی وتەنها کەسایەتییەك کە جێی متمانەی سەرۆك عەشیرەتەکان بێ بۆ بەشدار بوونیان لەو شەڕەدا پەسەندبکەن . لەم کاتەدا کە بارزانی بە تەنیایی ئاگر بەستی قبوڵکردبوو، سەرکردایەتی دیکەی شۆڕش ڕەزامەندییان لەسەر ئەو

ئاگر بەستە نەبوو، ئەم كارە متمانەی نێوان بارزانیو مەكتەبی سیاسی بەرەو قەیران برد، ئەندامانی مەكتەبی سیاسی ئاگاداركرنەوەیەكیان بۆ مەلا مستەفا نارد و داوای دەست هەڵگرتن لە ئاگر بەست و درێژەدان بە شەڕ تاچۆك دادان بە دەوڵەتی عێراقیان لێكرد، هەروەها وەبیریشیان هێنابۆوە كە دەوڵەتی عێراق بەو نیازە ئاگر بەستی ڕاگەیاندووە كە سەر لەنوێ خۆی بۆ لەشكر كێشییەكی دیكە سازوئامادە بكات.

پەراوێزی ئەم ئاگاداركردنەوەیە ئیمزای هەریەك لەم ناوانەی سەركردایەتی پارتی پێوە بوو: ئیبراهیم ئەحمەد (سكرتێری گشتی پارتی)، جەلال تاڵەبانی (ئەندامی مەكتەبی سیاسی ونوێنەری تایبەتی پارتی)، عومەر دەبابە، حیلمی عەلی شەریف، سەرهەنگ نوری ئەحمەد تەها، جەمیل بەگ، عەلی عەسكەریو، مێجەر ئیسماعیل.

مەلا مستەفا وەك فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی كوردستان خۆی چاكتر لەهەر كەسێك شارەزا بە هەلو مەرج وتەگبیر و ڕادەربڕین لەو مەسەلەیەدا دەزانی. ئەو پێی وابوو كە چیتر لە مە زیاتر شەڕكردن لە تواناداا نییە، سەرجەم ناوچە كوردنشینەكان لە ئاكامی بۆردومانداا وێران بوون، كێڵگە ولەوەڕگاو خەلەو خەرمانی گوندنشینان وگشت ئەو ئامڕازانەی كە بۆ درێژەدان بە شۆڕش پێویستن لە ناو چوو بوون ، خەڵكی بڕستیان لێبڕابوو، لێشاوی ئاوارەكانیش كێشەیەكی گەورە تربوو، گەورەترین مەترسیش لاواز بوونی ورەی خەڵكی بوو كە یەكێك لە هۆكانی پشتگیری نەكردنی كۆماری یەكگرتووی عەرەبی بوو لێیان.

لە مایسی 1964دا، جەلال تاڵەبانی وسەروان عەقراوی بەنوێنەری پارتی ومەلا مستەفا، بەمەبەستی كۆبوونەوە لەگەڵ جەمال عەبدولناسر دا، سەردانی قاهیرەیان كرد، تا بەڵكو لایەنگری ئەو سەبارەت بە قبوڵكردنی داخوازییەكانی خۆیان بەدەست بێنن و پاشان بە سەر دەوڵەتی عێراق دا بیسەپێنن . بەڵام

ناوبراو وەڵامێکی ڕاشکاوی پێنەدانەوە، جگە لەوەی کە تێدەکۆشێ وداوا لە عەبدولسەلام عارف دەکات کە بەلێکحاڵیبوونێکی زیاترەوە لەگەڵ ئەواندا ڕەفتار بکات.

زۆر ئەستەمە بڵێین ئەندامانی (مەکتەبی سیاسی) پارتی بە ئاگانە بوون لە پەککەوتنی توانای درێژەدان بە شەڕ (بەسەرنجدان لەو کێشانەی کە لە سەرەوەدا باسکرا)، بەڵام بەدڵنیایی دەکرێ ببێژین کە ئەوان بە دوای بەهانەو هەلێکدا دەگەڕان تا لە دەست مەلا مستەفا ڕزگاریان بێ و، وەك خائین لەبەر چاوی گەلی کوردی بخەن، بەو تۆمەتەی کە بۆتە ئامرازی دەستی دەوڵەتی عێراق، تا لە پاش ڕزگار بوونیان لە بارزانی بە خۆیان دەست بە وتووێژبکەن لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا .

مەلا مستەفا بە ئاگابوو لەوەی کە زۆربەی هەرەزۆری چەکداری عەشیرەتە یاخیبووەکان - کەنزیك بە نۆ لەدەی هێزی پێشمەرگەو لەشکری شۆرشیان پێکدەهێنا - لایەنگری لێدەکەن، دەقی ئاگادارکردنەوەی مەکتەبی سیاسی پارتی نارد بۆ عەبدولسەلام عارف. لە پاش ئەوە عارف بەڵێنی دا کە لە ماوەی دوو سێ مانگدا داخوازییەکانی میللەتی کورد جێبەجێبکات ، ڕاشیگەیاند لە حاڵێکدا کە سەرانی پارتی دەست بدەنە شەڕو کاری ڕکەبەری لە دژی مەلا مستەفا، سوپای عێراق کۆمەك بە ناوبراو دەکات لەسەرکوتکردنی نەیارەکانیدا.

مەکتەبی سیاسی پارتی کە بارەگاکەی لە (ماوەت)ی نزیکی چوارتا لە باکوری ڕۆژئاوای سلێمانیدا بوو، دەستیکرد بە پڕوپاگەندەیەکی توند لە دژی مەلا مستەفاو ئەوی خائین بە بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد ناوبرد.

لەم کاتەدا جەلال تاڵەبانیش کە لە فەڕەنسادا بوو بە فڕۆکەی پەیامنێرانی

فەرەنسی هاوڕێی ژەنراڵ (دیگۆل)[79] هاتە تاران و، لەگەڵ چەندین کەسایەتیدا دیدارو کۆبوونەوەی سازکردو پاشان گەڕایەوە عێراق.

مەلا مستەفاش سوودی لەم هەلە وەرگرت و ڕایگەیاند ئەندامانی مەکتەبی سیاسی خزاونەتە باوەشی سەنتۆوەو، دەیانەوێ شۆڕشی کورد بخەنە خزمەت ئەربابانی ئەو پەیمانەوە.

جیابوونەوەی مەکتەبی سیاسی پارتی، مەلا مستەفای ناچار کرد تا لەگەڵ ژمارەیەك لەسەرۆك عەشیرەتەکاندا، کە هەڵسوکەوتی بێلایەنانەو تەنانەت دۆستانەشیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا هەبوو، بسازێ وئەوان بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ خۆیدا هان بدات، کە لەنێو ئەوانەدا ناوهێنانی شێخ لەتیفی حەفیدی کوڕی شێخ مەحمودو، محەمەد ڕەشید قادرخانی و سەرۆك عەشیرەتەکانی پشدەری پێویستە.

لە تەموزدا، پاش کۆبوونەوە لەگەڵ ژەنراڵ تایەر یەحیای سەرۆك وەزیری عێراق و ژەنراڵ عەبدولڕەحمان عارفی برای سەرۆك کۆمار کە بۆ دیداری مەلا مستەفا هاتبوونە ڕانیە، مەلا مستەفا داوای لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی کرد کە لە ماوەتدا کۆببنەوە تاچەك دابنێن وملکەچی فەرمانەکانی ئەوبن.

ئەندامانی مەکتەبی سیاسی سەرپێچییان کرد، لە ئاکامدا مەلا مستەفا فەرمانی بە لوقمانی کوڕی دا کە لە گەڵ 2000چەکداری بارزانی و 500چەکداری عەشیرەتی پشدەریدا بە سەرۆکایەتی ئەنوەری کوڕی محەمەد ڕەشیدا، بەرەو ماوەت پێشڕەوی بکەن. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی کە لە وێدا لەگەڵ 630 چەکداری لایەنگر بە خۆیاندا توانای بەرگری کردن لە

---

[79] -ژەنراڵ دیگۆل (1890-1970) گەورە پیاوی دەوڵەتی فەرەنسا، سەرکردەی بەرگری‌و خەباتی دژ بە ئەڵمانیای نازی بوو لە کاتی داگیرکردنی فەرەنسا دا (1940-1944)، سەرۆك کۆماری فەرەنسا بوو لە نێوان سالآنی (1959-1969)دا. (و)

خۆیان نەبوو ، لەزێی بچووك پەڕینەوەو لە نزیكی سەردەشتدا ئاودیووی ئێران بوون، ئەوان ڕێگەیان بە كاربەدەستانی ئێران نەدا كە چەكەكانیان لێبسێنن، پێیان گوتن كە هێندە نامێننەوە و دەگەڕێنەوە بۆ عێراق.

ئیبراهیم ئەحمەد هاتە تاران، بەڵام عومەر دەبابە و جەلال تاڵەبانی لەگەڵ هاوڕێیانی خۆیاندا لە (دۆڵی كانی) نزیك سەردەشت و 12 میلی سنووری عێراقدا مانەوە.

شێخ ئەحمەدی براگەورەی مەلا مستەفا هەوڵیدا لە نێوان پارتی و مەلا مستەفا دا ناوبژیوانی بكات و ئەوان پێكەوە ئاشت بكاتەوە، بەڵام سەركەوتوو نەبوو.

پاش چەند ڕۆژێك ئەم چەكدارانە بە هۆی دووسەد چەكداری لایەنگریانەوە كە لە ناوچەكانی خانەقین دا بوون وپشتیوانیان لێدەكردن، چوونە ناوخۆی سنووری عێراقەوە و ویستیان خۆیان بگەیەننە چوارتا. ژمارەیەك چەكداری بارزانی كە چاودێری ئەو دەورو بەرەیان دەكرد. ڕووبەڕوویان بوونەوە و لە پاش پێكهەڵپژانو زیان پێگەیاندنیان ، دووسەد چەكداریان گەڕانەوە پاڵ هێزەكانی مەلا مستەفاو پاشماوەی ئەو چەكدارانەش سەر لەنوێ كرانەوە بە ئێراندا ، ئەم جارەیان لە ئێراندا چەك كران و خرانە ژێر چاودێرییەوە.

بەدوای چەند ڕۆژێكدا، لە ئاكامی نارەزایی دەوڵەتی عێراقدا بەرامبەر بە داڵدەدانی ئەم یاخیبووانە لە نزیكی سنورەكانیدا، دەوڵەتی ئێران ئەوانی سەرەتا بۆ سەقز و لە پاشانیشدا بۆ هەمەدان گواستەوە. بەڵام لایەنگرانی ئەوان بە تایبەتی ئەوانەی كە لە وڵاتانی سوریا و لوبنان و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا بوون، پشتیوانییان لەم پەنابەرانە كردو نارەزاییان لە دژی مەلا مستەفاو دەوڵەتی عێراق دەربڕی.

لە ناوەڕاستی سێپتێمبەردا، كۆنگرەیەك لە كوردەكانی عێراق بەسەرۆكایەتی مەلا مستەفا لە ڕانیەدا بەسترا، ئەم كۆنگرەیە دەسەڵاتی

تەواوی لە بارەی بەڕێوەبردنی کاروباری شۆڕشەوە بە بارزانی سپارد. لە هەمان کاتیشدا داوای لە ناوبراو کرد کە ئەندامانی پارتی لە ئێران بانگ بکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش (حەمە رەشید) ئەرکی ئەوەی پێسپێردرا کە لەگەڵ ئەو ئەندامانەدا وتووێژبکات، لە ئاکامی ئەم وتووێژەدا عومەر دەبابە گەڕایەوە بۆ عێراق ولەگەڵ سالح یوسفی نوێنەری مەلا مستەفادا کۆبۆوە، پاشان گەڕایەوە ئێران، بە دوای ئەوەدا لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا بە مەبەستی دیدار و کۆبوونەوە لەگەڵ مەلا مستەفادا چوونە ڕانیە.

سەرەنجام لە ئاکامی وتووێژو ناوبژیوانی محەمەد ڕەشید وشێخ ئەحمەددا، مەلا مستەفا قایل بوو بەوەی کە گشت پەنابەرانی نێو ئێران ، جگە لە ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی، بگەڕێتەوە بۆ عێراق. پاشان ئەم کۆنگرەیە بڕیاری لەسەر ئەوەدا کە پارتی بە پێی یاساکانی دەوڵەتی عێراق، لەمەڕ یاسای حیزبەکان، چالاکی خۆی سنوردار بکاتەوەو ڕێکخستنی گشت کاروباری پێشمەرگە و ناوخۆی شۆڕش بە مەلا مستەفا بسپێردرێ. لە چواری ئۆکتۆبەری 1964دا، کۆنگرەیەکی تر بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفاو بە بەشداری چەندین کەسایەتی کورد لە رانیەدا بەسترا، لەم کۆنگرەیەدا بڕیار لە سەر ئەوە درا ئەگەر لە پاش تێپەڕبوونی حەوت مانگ بەسەر ئەو مۆڵەتەی کە دەوڵەتی عێراق بۆ پێدانی مافی گەلی کورد بڕیاری لە سەرداوە، هەنگاوی پێویست لەم بارەوە نەگرێتە بەر، سەرکردایەتی شۆڕشی کورد هەرکارو هەنگاوێك بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بە پێویست بزانێت دەیگرێتە بەر. هەروەها بڕیار لەسەر ئەوە درا کەسێ لیژنە، بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کاروباری کوردستان پێکبهێنرێت:

ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان-بەسەرۆکایەتی شێخ لەتیفی حەفید (کوڕی شێخ مەحمود)

ئەنجومەنی تەگبیرو ڕاوێژ کردن-بەسەرۆکایەتی عەباسی مەمەند ئاغا (دۆستی دێرین وئەمەکداری مەلا مستەفا).

ئەنجومەنی شەڕو بەرگری کردن– بە سەرۆکایەتی خودی مەلا مستەفا بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری خۆپارستن وماف وەرگرتن.

هەر لیژنەیەك لە 16 ئەندام پێکهاتبوو (4ئەندامی لە عەشایر، 4ئەندامی لە ڕێکخستنی پارتی، 4 ئەندامی لە ڕوناکبیرانی شار، 4 ئەندامیشیان لە لەلایەن مەلا مستەفاوە ئیختیار دەکرا). بەمجۆرە لەم کاتەدا (کاتی نوسینی ئەم کتێبەدا) مەلا مستەفا توانیویەتی دوو لیژنە لەم سێ لیژنەیە کۆنترۆڵ بکات، بە هۆی هەڵبژاردنی شێخ لەتیفی حەفیدەوە بە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی پیاوماقوڵان متمانەی پیاوانی ئایینی و پارێزکارانیشی بۆ خۆی زامن کردووە، کەسانی چەپڕەویشی لە ئاستێکی کەم و بێبایەخدا ڕاگرتووە. پێکهێنانی ئەم لیژنانەش بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی وەزیران بە سەرۆکایەتی خودی مەلا مستەفا کۆتایی هاتووە.

سەرەڕای ئومێد و چاوەڕوانی ناسرو عارف کە گرنگترین کەسایەتی عەرەبی خوازیاری یەکێتی نەتەوەی عەرەب و بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئیسرائیلدان. شەڕی ناوخۆی یەمەن[80] هێشتا کۆتایی پێنەهاتووە و کوردەکانیش دەستیان لە داخوازییەکانی خۆیان هەڵنەگرتووە، ئەو داخوازییانەی کە بەهۆی ویستی ئۆتۆنۆمی فراوانەوە بۆ عێراقییەکان قابیلی قبوڵکردن نییە. بەمجۆرە هێز وتوانای سەرەکی سوپاکانی میسر و عێراق و لەڕێگایەکی بێهودە دا بە هەدەر دەدرێ. لێدوانە چاوەڕوان نەکراوەکانی

---

[80] –شەڕی ناوخۆی یەمەن لە 1962دا لە پاش کودەتای (عەبدوڵلا سلال) لە دژی ئیمام بەدردا ڕوویدا، لە نێوان کۆماری خوازەکان و لایەنگرانی ئیمام بەدردا، عەرەبستانی سعودی پشتیوانی لە هێزە خێڵەکییەکانی دژ بە کۆماری خوازەکان دەکرد، لەئاکامی ئەوەدا عەبدوڵلا سلال پەیمانێکی سەربازی لەگەڵ میسردا بەست هێزەکانی میسر لە یەمەندا پشتیوانییان لە کۆماری خوازەکانی دەکرد، دواتر هێزەکانی میسر لە یەمەندا کشانەوەو کۆتایی بە دەسەڵاتی (عەبدوڵلا سلال)هات.

(و)

سه‌رۆك (بورقێبه) ده‌رباره‌ی فه‌له‌ستین و ڕه‌وشی مه‌زنخوازی ژه‌نراڵ (ئه‌مین حافظ) له سوریا دا جارێکی دی بێ توانایی گرتنه پێشی سیاسه‌تێکی ده‌ره‌کی هاوبه‌ش وچوون یه‌کی سیاسه‌تمه دارانی عه‌ره‌بی سه‌لماندووه. که ته‌نها له سایه‌ی یه‌کخستنی سیاسه‌تێکی به‌و جۆره دا ده‌توانن له به‌رامبه‌ر ئیسرائیلدا به‌رگری له خۆیان بکه‌ن. که له‌م کاته‌دا نه ڕێوشوێنی سه‌ربازی ونه ڕه‌وشی سیاسی عه‌ره‌ب بۆ گه‌شتن به‌م مه‌به‌سته هه‌موار نی‌یه. ئه‌م هه‌لو مه‌رجه ده‌وڵه‌تانی عه‌ره‌بی گه‌یانده ئه‌وه‌ی که ده‌ست له سیاسه‌تی به‌ره‌یه‌کی یه‌ککگرتوو هه‌ڵگرن که له‌لایه‌که‌وه گوناهی یه‌کنه‌خستنی سیاسه‌تی ده‌ره‌کییان خسته ئه‌ستۆی هه‌ندێك له فه‌رمانڕه‌وایانی ڕۆژئاواو له لایه‌کی دیکه‌شه‌وه که‌وتنه چالاکی کردن بۆ ئه‌وه‌ی کێشه‌ی یه‌مه‌ن و کوردستان به‌زه‌بری چه‌ك چاره‌سه‌ر بکه‌ن.

عێراق له ناوچه‌کانی ژێر ده‌سه‌ڵاتیدا، ده‌ستیکردووه به به‌هێز کردنی سوپا و داگیر کردنی ناوچه ستراتیژییه‌کان، له لایه‌کی دیکه‌شه‌وه بۆ ته‌فره دانی بیروڕای گشتی جیهانی له زاری حیزبه چه‌په‌کانه‌وه ئیدعا ده‌کات که ئه‌م له‌شکر کێشیانه له دژی چه‌ته وڕێگره‌کان ئه‌نجام ئه‌درێ. که له‌ڕاستیدا ئه‌م هێرشانه به ئامانجی ڕاونانی کورده‌کان به‌ره‌و ناوچه شاخاوییه‌کان و، داگیرکردنی شاروگونده‌کان و کردنیانه به مۆڵگه‌ی سه‌ربازی و ناوچه‌ی شه‌ڕ. هه‌روه‌ها به مه‌به‌ستی کۆنترۆڵ کردنی هاتوچۆی ڕێگاو بانه‌کان، له زۆربه‌ی ناوچه به‌رزه‌کاندا خاڵی پشکنین و چاودێری دانراوه. له‌م ناوچانه‌دا که ئه‌م جۆره له‌شکرکێشیانه پێویستی به‌وه‌گه‌ڕخستنی ژماریه‌کی زۆری سه‌ربازه، نزیك به‌سێ له چواری سه‌ربازانی سوپا بۆ زامنکردنی ئه‌م هێڵی چاودێری‌و کۆنترۆڵ کردنه به‌کارهێنراون.

مه‌لا مسته‌فا بارزانی له لایه‌که‌وه ده‌ستی له داخوازی ئۆتۆنۆمی هه‌ڵگرتووه‌و له لایه‌کی دیکه‌شه‌وه داوای پێکڕای ئه‌و شتانه ده‌کات که ته‌نیا له سایه‌ی ئۆتۆنۆمیدا به‌دیدێن . هه‌نوکه کورده‌کان هه‌وڵئه‌ده‌ن په‌یوه‌ندییه‌کی دۆستانه‌یان له‌گه‌ڵ لایه‌نه‌کانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقدا هه‌بێ وه‌ك شیوعییه‌کان

و حيزبى ديموكراتى چادرچى‌و بەعسى‌يە چەپڕەوەكان. هێشتا ئەوان بە هيوان كە ناسر بە فشار بۆ هێنانى سياسى عارف ناچار بە قبوڵكردنى خواستەكانى كوردبكات. بەڵام لەم كاتەدا بە هۆى ئەوەوە كە سياسەتى پێكەوەنانى بەرەيەكى هاوبەش لە دژى ئيسرائيل بەكردەوە وەلانراوە ، عەبدولناسر پتر خوازيارى يەكپارچەيى خاكى عێراقە تا هێنانەدى داخوازييەكانى بارزانى ، دارو دەستەى ناسرييەكانيش پەيڕەوى لەم ڕەوشە دەكەن.

وەك هەموو دەستدرێژى و پێشڕەوييەكانى پێشتر، سوپاى عێراق توانيويەتى‌لە قۆناغى يەكەمى شەڕدا زۆربەى ناوچە گرنگە كوردنشينەكانى وەك ڕانيە وبارزان داگيربكات، بەڵام هێشتا شەڕ لە ناوچەكانى قەڵادزێ، چوارتا، ماوەت و پێنجوێندا يەكلايى نەبۆتەوە و لەزۆر شوێنيشدا سوپاى عێراق لە پاش زيانلێكەوتنێكى قورس ناچار بەكشانەوە كراوە ، تەنانەت ڕانيەش بە شێوەيەكى بەردەوام لە بن دەستى كوردەكاندا بووە.

عێراقييەكان لە پاش مەرگى شێخ ڕەشيدى لۆلان، دوژمنى دێرينى مەلا مستەفا، پياوێكى بە متمانەيان لە دەستدا، بەڵام عەشيرەتە نەيارەكانى ناوبراو هەروەها درێژە بە هاوكارى خۆيان ئەدەن لەگەڵ دەوڵەتى عێراقدا. لە كاتێكدا سياسەتى عێراق گيرۆدەى چەند دەستەگى وناكۆكى بۆتەوە، كوردەكان لەنێوخۆياندا ئيرادەيەكى زياتر يان بۆ يەكبوونێكى تۆكمەتر پيشانداوە.

لە كاتى نوسينى ئەم كتێبەدا (تموز 1965) پێ ناچێت كێشەى كورد لە عێراقدا زياتر لە هەركاتێكى دى (لە ساڵى 1919وە، كاتى دامەزرانى عێراقەوە تا ئێستا) لە ڕێگا چارەيەك نزيك بووبێتەوە. بێگومان بەردەوام بوونى ئەم بارودۆخەش بە شێوەيەكى حەتمى سەرهەڵدانى چەندين گێرمە و كێشەى ديكەى لە ناوخۆى عێراقدا لێدەكەوێتەوە ، لە دۆخى پەرەگرتنيشيدا كاريگەرى لەسەر سەرتاسەرى ڕۆژهەلاتى ناوەڕاست دەبێت.

1350/1/15

# بەشی پێنجەم
# ئاکام گیری

لێردە ناخوازم پێکهاتەیەك لە چوار بەشی ڕابردوو فەراهەم بکەم بەڵام هەوڵئەدەم بە مەبەستی کۆمەك کردن بە خوێنەران بۆ پەی بردن بە بیروباوەڕو داخوازی و ئاواتەکانی گەلی کورد کە لە بەشێك لە ئێران وعێراق وتورکیادا دەژین ، چەند ڕاستییەك وێڕای ئەو پڕوپاگەندانەی کە لە چەندین سەرچاوەی جیاوازەوە بڵاوکراوەتەوە، بخەمە ڕوو، ئەو سەرچاوانە چ کوردی بن یا غەیرە کورد ، بێ ئەوەی گیرۆدەی دەمارگیریو ڕەچاوکردنی نەژاد یا میللەتی خۆم بم.

هەرچەند کوردەکان بە شێوەیەکی بەردەوام لە ژێر ڕکێفی دوو دەسەڵات یا وەك هەنوکە لە بن دەستی سێ دەوڵەتدا بوون. بەڵام زمانی ئەوان، دابونەریتیان و ئەو هوشیارییە تایبەتییەی کە هەستی کوردبوونیان پێدە بەخشێ، ئەوان لە گشت میللەتانی دیکەی وەك تورك، عەرەب، ئەرمەنی وئاسوریش کە لە زۆر شوێندا لەگەڵیاندا هاوبەش وتێکەڵن جیا دەکاتەوە. هەمیشە کوردەکان بوونێکی سەربەخۆیان پێکهێناوەو تەنانەت لەسەردەمە کۆنەکانیشدا کە هێشتا بیری کوردایەتی پەیدا نەببوو لە نێویاندا، خۆیان بەرامبەر بەو ڕەگەزانەی سەرەوە بە بێگانە زانیوە.

ڕاگەیاندنی کوردەکان، بە وریایی چاودێری ئەوە دەکات کە شۆڕشی کوردی هەر پارچەیەك تەنها لە دژی دەوڵەتی داگیرکەری ئەوپارچەیە پیشان بدات و بەزادەی هەستی میللی کوردیشی ناوببات.

بەڵام ئەوانەی بە باشی لەگەڵ دنیای کوردەکانی بەر لەجەنگی ڕابردوودا ئاشنان، دەزانن کە ئەم ڕاپەڕینو شۆڕشانە لە هەرکات و بارودۆخێکدا

هۆکاری جیاوازیان هەبووە، کە زۆربەیان بریتی بووە لە ویست وئارەزووی میرو سەرۆك ئێلەکانی کورد ، یا خواستی ڕزگار بوون لە کۆت و بەندی حکومەتە دەرەکییەکان، یا مل ڕانەکێشان بۆ باج و زۆرە ملیێ، یا ئارەزووی تالان وبڕۆ بووە ، هەندێك جار لە پێناو بەرگری کردن لە ئاین و مەزهەبی خۆیاندا ڕاپەڕیوون، لە کاتێکیشدا کە هەستیان کردبێ لەلایەن دەوڵەتە کەیانەوە جەوروستەمیان لێدەکرێ شۆڕشیان بەرپاکردووە، هەندێك جاریش لە پێناو ڕێگرتن لە دەستێوەردانی دەوڵەت لە شەڕە خێلەکییەکانی نێوان خۆیاندا ڕابوون.

لە نێو چەندین ڕاپەڕینی کوردەکانی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، تەنها دەکرێ دوو ڕاپەڕین وەك تێکۆشانی میللی ناوببرێن.

یەکەمیان: شۆڕشی میر بەدرخان پاشا (1826–1847)، و دووەمیشیان ڕاپەڕین و هێرشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکانی ئێران. تەنانەت ئەم دوو ڕاپەڕینەش لە چەندین ڕووەوە گەلەك بزوێنەری سەرەکی دیکەیان هەبووە . یەکەمیان بە هۆی مەزن خوازی شەخسی بەدرخان و دووەمیان زیاتر بەهۆی ڕك و کینەی کوردە سوننییەکانەوە بوو لە بەرامبەر تورکەکانی ئازەربایجانداو بە مەبەستی تالان کردنی جوتیارو گوندنشینانی زەوییە بە پیتەکانی ئەوان بوو لە دەشتەکانی ورمێ و میاندواو وەمەراغەدا.

هەستی ناسیۆنالیستی کورد بەم چەمکە نوێیە تەنها لە دوای ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە سەریهەڵداوە. هەوڵدان بۆ سەر بەخۆیی لە لایەن عەرەب و ئەرمەنەوەو سەرهەڵدانی چینێکی نوێی ڕۆشنفکری کورد کە زۆربەیان لە وڵاتانی هەندەراندا خوێندبوویان و لە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژی نوێی ئابوری و کۆمەڵایەتیدا بوون. زەمینەی سەرهەڵدانی ئەم هەستەیان هەموار کرد.

ئەم کەسایەتیانە نیگەرانی ئەوەبوون کە گەلەکەیان ملکەچی دەوڵەتانی

بێگانە بووەو نەیانتوانیوە لە پێناو دەستڕا گەشتن بە ئاواتەكانی خۆیاندا تێبكۆشن. هەرچەند ئەم كەسایەتیانە تەنها سیمای هاوبەشیان لەگەڵ سەرۆك عەشیرەت و پیاوە مەزهەبییەكانی كوردستاندا بریتی بووە لە كینەی هاوبەشیان بەرامبەر بەو دەوڵەتە بێگانانەی كە بەسەرئەواندا فەرمانڕەواییان كردووە.

سەرۆك خێڵە كوردە دەمارگیرو ڕاستڕەوەكان، بە ئاگان لە وەی كە لە حاڵی حازردا بە دەستهێنانی سەربەخۆیی یەكجاری كورد دژوار و ئەستەمە، لەبەر ئەوەی لە دۆخی سەرهەڵدانی مەترسی جدی و ڕاستەقینەدا سێ وڵاتی خاوەن كەمینەی كورد پێكەوە سیاسەتیان یەكدەخەن و ڕێ لە بەدیهێنانی ئەو سەربەخۆییە دەگرن. كەوا بوو بەدیهێنانی ئەو خەونە پێویستی بە پشێوی و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی یەكجارەكی ڕژێمەكانی هەنوكەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. ئەم سیناریۆیەش تەنها لە سایەی هێرشی یەكێتی سۆڤیەتدا بەدی دێ، لە بەر ئەوە ئەو كوردانەی كە لایەنگر بە نفوزو باڵادەستی سۆڤیەت و ئایدۆلۆژی كۆمۆنیستی نین، خۆیان بە داخوازی ئۆتۆنۆمی لە چوار چێوەی وڵاتەكانیاندا قایل دەكەن.

لەلایەكی دیكەوە، ڕۆشنفكرانی كوردیش، كە نوێنەری بەرجەستەی ئەوان لە كوردستاندا (ئیبراهیم ئەحمەد) ولە دەرەوەی كوردستان (ئەورووپا)شدا (شەریف وانلی)یە، دركیان بە لە تواناادا نەبوونی دامەزرانی دەوڵەتی سەربەخۆی كورد لە هەلومەرجی ئێستادا كردووە، بەڵام باكیان نی‌یە لەوەی كەئەم دەوڵەتە لە ڕێگای دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی سۆڤیەتەكانەوە دابمەزرێ. چونكە شتێكیان نی‌یە تا لە ڕژێمی سۆشیالیستیدا لێیان زەوت بكری. بەمجۆرە هەست بەوە دەكرێ كە لە تێڕوانینی كەسانی پێشڕەوی شۆڕشەوە، بەدەستهێنانی لانی كەمی حكومەتی میللی‌و لەهەمان كاتیشدا

پراكتيزەكردنی پرۆژەی ئابوری وشۆڕشگێڕانەی هاوشێوەی جەزائیر، داخوازی سەرەكی ئەوانە.

ناوەندە سیاسییەكانی دەرەوەو تەنانەت كەسانی واقیع بین لە نێو خودی كوردەكانیشدا پێیان وایە بەدیهێنانی وڵاتی سەربەخۆی كوردو جیابوونەوە لەو وڵاتانەی كە ئێستا چواردەوری داون، لە ڕووی جوگرافیاوە چەندین گێرمەوكێشەی بەرفراوان لە خۆ دەگرێت.

كوردەكان زۆربەیان لەكوێستانە دوور دەست ودەرەكاندا نیشتەجێن و دەشتە بە پیتەكانی دەوروبەریشیان موڵكی خەڵكانی غەیرە كوردە. وێڕای ئیدعای ناسیۆنالیستەكانی كورد، خاكی كوردستان وئەو سەرزەمینانەی كە كوردنشینن لە هەموو ئاڕاستەیەكەوە گەلەك بە دوورە لە دەریای ئازادەوە. لە هەمان كاتیشدا ناوچەی پڕ لە نەوتی باكوری عێراقیش كە كوردەكان ئیدعای خاوەنداریێتی دەكەن، دانیشتوانی ئەم ناوچانەش یەكپارچە لە كوردەكان پێكنەهاتوون. كەواتە دیاریكردنی وڵاتێك لەسەر كاغەز بە پشت بەستن بە نەتەوەو چەند مەرجێكی ناهەمواری دیكە ئاسانە، بەڵام لە پراكتیك وكردەوەدا ڕووبەڕووی چەندین كۆسپ و گیروگرفتی بەرفراوان دەبێتەوە، لە ڕاستیدا بە بڕوای ئابوری ناسان پێكەوە نانی وڵاتێكی كوردنشین كە چوار دەوری بە دەوڵەتانی ڕكەبەر تەنرابێت ، بەشێوەیەكی سەربەخۆ توانای درێژە دان بە ژیانی خۆی نابێت، بەڵام بێگومان مرۆڤ تەنها بە نان ناژی، نەك لە ڕابردوییەكی دووردا، بەڵكو لە هەموو سەردەمێكدا، چەندین سنوور لە ڕێگای نا ئاساییەوە بەدیهاتووە، كە هیچ جۆرە بەڵگەو بنەمایەكی مێژوویی و جوگرافیایی و ئابورییان نەبووەو لە ئاكامدا وڵاتانێك بە دیهاتوون كە مەبەست لە پێكهێنانیان ڕازی كردنی هەستی میللی دانیشتوانەكەیەتی، یا خود بە

مەبەستی بەربەست وکۆسپ دانانە لە بەرامبەر نفوزی هێزە گەورەکاندا بە هۆی پێگەی ستراتیژییانەوە وەك (چیکۆسلۆڤاکیا) و (کشمیر).

هەنوکە هیچ جۆرە ڕێکخراوێك کە نوێنەرانی پێکڕای وڵاتانی کوردنشین لە خۆ بگرێ لە کایەدا نیـیە. کوردەکانی ئێرانیش لەچوار چێوەی ئێراندا خاوەنی ڕێکخستنێکی بەو جۆرەنین، هێندەی من ئاگاداربم لە دەرەوەی ئێرانیشدا هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان لەگەڵ ڕێکخراوەکانی (خۆیبون) یا (کۆڕی هەڤاڵانی کورد) دا نیـیە، هەروەها لە نێو کوردەکانی تورکیاشدا تەنها ژمارەیەکی کەمیان لە نێو ئەم ڕێکخراوانە دا کاردەکەن، کە دەکرێ لە نێو ئەوانەدا ناو لە (شەریف وانلی) ببرێ، کە بەم دواییـیە ناڕەزایینامەیەکی توندو تیژی لە دژی ئێران سەبارەت بە ڕێنەدان بە خوێندنی زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا بڵاوکرد بۆوە.

بە کورتی ڕەوشی ئەو سێ دەوڵەتەی کە کوردەکان لە نێو قەڵەمڕەوی ئەواندا ژیان بەسەر دەبەن بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

1/تورکەکان دەڵێن: ئێوە تورکن نەك کوردو، کوردێك لە تورکیادا بوونی نیـیە (ئەوان بوونی کوردیان تەنها لە ئێران و عێراقدا پێ قبوڵە)، بەم شێوەیە بە هیچ جۆرێك لە وڵاتی خۆیاندا مۆڵەت بە خستنە ڕووی کێشەی کورد نادەن.

2/ئێرانییەکان، بوونی گەلی کوردیان پێقبوڵە ، بەڵام دەڵێن کە کوردەکانیش لقێك لە ئەقوامی ئێرانی پێکدێنن، کەواتە بە بەشێك لە ئێران دادەنرێن.

3/عێراقییەکان دەڵێن، ئێوە کورد و ئێمە عەرەبین، هەردوو پێکەوە بە عێراقی دادەنرێین، عێراقیش بەشێکە لە خاکی عەرەب. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێوە عەرەب نین ئێمە ئامادەین جۆرێك لە ئۆتۆنۆمیتان پێبدەین بە مەرجێ یەکپارچەیی خاکی عێراق نەخاتە مەترسییەوە.

لەحاڵی حازردا پێشبینی کردنی ئەوەی کە شۆڕشی کوردستانی عێراق بە چ چارەنوسێك دەگات. دژوارە، بەسەرنجدان لە خواست و ئارەزووی ئەوان بۆ سەلماندنی هەبوونی خۆیان وپەرەسەندنی خوێندن و پەروەردەو، ڕوولە کزبوونی نفوزی سەرۆك عەشیرەت و موڵکدارە گەورەکان، گەشە سەندنی شارنشینیو ڕوو لە پەرەگرتنی نفوزی چەپڕەویو ڕۆشەنگەرانە لە نێو خەڵکی کوردستانی عێراقدا، پێدەچێ زیاتر ئەم خەباتەی تۆکمەو پتەوتر کردبێ. ئەو کوردانەی کە لە هەندەران و بەدوور لە وڵاتانی ئێران وعێراق یا تورکیادا ژیان بەسەر دەبەن، لەبەر ئەوەی لە گێرمەوکێشەی ئەواندا بەشدارنین، بە شێوەیەکی هەمە لایەنە داکۆکی لە یەکبوون و سەربە خۆیی سەرجەم کوردەکان دەکەن.

کەواتە ئەگەر نکۆڵی لە بوونی کێشەیەك بە ناوی کوردیشەوە بکرێت، دیسان کێشەی کورد کۆتایی پێنایەو بە زیندوێتی دەمێنێتەوە.

## سەرچاوەکان

ئەم کتێب و نامیلکانەی خوارەوە، وەك سەرچاوەی ئەم کتێبە سوودیان لێوەرگیراوە. کە بەپێی مێژووی چاپ کردنیان پۆلێن کراون.

### سەرچاوە فارسییەکان:


1/جغرافیای نظامی ایران، ژنرال حاجی علی رزم آرا /تهران 1320.

2/کردستان، علی اصغر شمیم همدانی/تهران 1320.

3/فرمان ارتش در کردستان باختری، حسین رامین/تهران 1323.

4/اسرار بارزان، اسماعیل اردلان/تهران 1325.

5/ مرگ هم بود بازگشت هم بود، نجفقلی پسیان/تهران 1328.

6/تاریخ ریشه نژادی کورد، احسان نوری پاشا/تهران 1955

7/تاریخ هیجده سالەی آذربایجان، احمد کسروی/تهران 1340.


### سەرچاوە کوردییەکان:


1/هەندێك زاراوەی زانستی/2757.

2/مەشاهیری کورد، محمد عەلی لوگ/1947

3/چوونی بارزانی قارەمان بۆ سۆڤیەت، محمد تۆفیق وردی/1961

## سەرچاوە ئینگلیزییەکان:


1. Persia and persian Question . G.N. curzon London 1826.
2. To Mesopotama and Kurdistan in disguise E.B. Soane .London 1912.
3. Encyclopaedia of Islam .V.Minorski .London 1915 Entries under Kurd and Kurdistan.
4. The Caliph's last Heritage. Mark Sykes. London 1915.
5. Our smallest Alley .W.A.Wigram. London 1920
6. The Adventures of Dunster Force .L.C. Dunsterville. London 1920.
7. A History of percy Sykes. Vol II.London 1921.
8. The Mohamadian Dynasties story. Lane Poole Paris 1925.
9. Survey of international Afairs 1925. Arenold Toynbe Vol I. London 1925.
10. Turkey .A.J.T oynbe and K.P.Kirkwood. London 1926.
11. The intimate paper of colonel House. London 1928.
12. Mesopotamia 1917-1920. Arnold Wilson. London 1931
13. The Iraq events 1915-1932. J.G Brown. London.
14. Tamurlane or timur the Great Amir. Ahmad Arabshah Translated by:J.H.Sanders. London 1936.
15. Iraq and the Persian Gulf .Naval Intelligence Division. London 1966.
16. Iraq 1900-1950 .S.H. Longrig 1953.
17. The Kurds and their Country. Shaikh Waheed . Lahore 1955.
18. Diplomacy in the Near and Middle East. J.C.Hurewits. Princelon. N.I.1956.
19. Kurds,Turks and Arabs .C.J. Edmonds. London 1951.
20. The Fall of the Safavi Dynasty. Cambridge. 1956.
21. Kurds Adivided Nation. Kamran Bader Khan . Paris 1958.
22. A Road through Kurdistan. A. Hamilton .London 1958.
23. Nuri-al-said . Lord Birdwood. London 1959
24. The Kurdish Republic of 1946. W.Egleton Jr. London 1963
25. Under Five shahs. Hassan Arfa. London.

## سەرچاوە فەرەنسییەكان

1. Turqie. J.M .Joudnin. 1949.

2. Sharafnameh ou les eastes de la nation Kurdes.Sharfaldinkhan of Bitis. TV. By:F. Charmoy. St. petersburg. 1868.

3. Au Kurdistan en Mesopotamiae et en Perse . H.Binder. Paris 1882.

4. Les Tribulation Daune Ambulance Francaise en Perse Dr.P.Caujole 1922.

5. La Guerre Turque dans La Guerre Mondiale comdt Larcher. Paris 1926.

6. La Campagne de Perse 1514. Moukbil. bet Paris 1928.

7. Memorandam sur la situation des Kurdes et leurs Rewendications. Paris 1948.

8. L' Empire des steppes zagrousset. Paris 1952.

9. Les Kurdes. Etude sociologique et historique B.Nikitine. Paris 1956.

10. Aspects de la question Kurdes en Iran Pares vanli. Paris 1959.

## سەرچاوە روسییەكان

/1Sovereignty Iran. Akademy a Nauk. S.S.S.R. Moscow 1951

./2Persidskiy Front .A.G.Emelianov.Berlin 1923

## سەرچاوە توركییەكان

/1Buyuknarpte Kafkaz. Bak.Istanbul. 1932.

/2Islam Ansiklopedisi. Vol 6. Istanbul 1955.

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ساڵی 2001

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| 94 | خەونە ترسناکەکانی یوسف | بەرزان فەرەج | |
| 95 | سەرەتاکانی سۆسیۆلۆژیا | | شوان ئەحمەد |
| 96 | عێلی جاوان | د. مستەفا جەواد | م. جمیل رۆژ بەیانی |
| 97 | هێماگەریەتی | | پێشڕەو حسێن |
| 98 | دەروازە | | هەڵکەوت عەبدولا |
| 99 | زۆربا | نیکۆس کازانتزاکیس | ڕەووف بێگەرد |
| 100 | بینای هونەری چیرۆکی کوردی | پەرێز سابیر محەمەد | |
| 101 | دەڕۆم پێکەنینی دەریا ببینم | سەلاح گوڵ ئەندامی | |
| 102 | بزوتنەوەی روانگەو شیعری نوێی کوردی | شادمان قادر حەسەن | |
| 103 | چیرۆکی وڵاتە دوورەکان | | حەمە ڕەشید |
| 104 | زمان و زانستی زمان | | د.محەمەد مەحویی |
| 105 | چەند شانۆنامەیەك بۆ منالآن | | فاروق هۆمەر |
| 106 | شانۆگەریەکانی سلێمانی لە ساڵانی (1926-1961)دا | یاسین قادر بەرزنجی | |
| 107 | گۆڤاری (دیاری کوردستان) | ئا: ڕەفیق ساڵح | |
| 108 | وا بەهار هات | حاجی جوندی | جەلال دەباغ |
| 109 | لەگەڵ ئەقڵی خۆرئاوادا | | ئازاد بەرزنجی |
| 110 | زەردەشت وای گوت | فردریك نیتشە | ڕەئووفیئەحمەدئالانی |
| 111 | پیاوە سپییەکە | | خەبات عارف |
| 112 | دەفتەری شیعر | لەیلان سەعدەددین | مەهاباد صالح |
| 113 | بنەماکانی فسیۆلۆژی مرۆڤ | ئەکرەم قەرەداخی | |
| 114 | وانەی ئەم سەدەیە | کارل پۆپەر | شۆڕش جوانڕۆیی |

**نرخی (20) دینارە**